# شەرحی اللؤلؤ والمرجان

فيما اتفق عليه الشيخان

البخاري ومسلم

وضعه

محمد فؤاد عبدالباقي

بە پێنووسی

نوری فارس حەمەخان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد

(بەرگی پێنجەم)

# شەرحی

# اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَان

# فِيما اتَّفَقَ عليه الشَّيْخَان

## البخاري ومسلم


وضَعَهُ

محمد فؤاد عبدالباقی

بەپێنووسی

نوری فارس حەمە خان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد


﴿بەرگی پێنجەم﴾



*********************************************

📖 ناوی کتێب: شەرحی اللؤلؤ والمرجان فیما أتفق علیه الشیخان البخاری ومسلم.

📖 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان

📖 تیراژ : ١٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردن ( ١٢٧٨ )ی ساڵی ( ٢٠١٥ز)ی پێدراوە.

📖 کۆمپیوتەرو دیزاین: ( سامان محمد أمین )

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپکراوە، مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.



## ٣٧- كِتَابُ اللِّبَاسِ والزينَةِ
## نامەی پۆشاكو جلو بەرگو خشڵو ئارایشت

{بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری، بـەرگی پێنجـەم، زنجـیرە: ٨٠، لـە ژمـارە: ١٨٩١وە هەتا ژمارە: ١٩١٣ = ژمارە: ٥٧٨٧ هەتا ژمـارە: ٥٩٥٣. هـەروا بڕوانـە: تـاج/٣، زنجیرە: ٢٩ هەتا زنجیرە: ٥١، لە لاپەڕە: ٢٤٤ هەتا لاپەڕە: ٣١٤، لە ژمارە: ٢٧٦٢ هەتا ژمارە: ٢٩٣٤ + ریاض/٢، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٧٧٩ هەتا زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٨١٣}.

### (١) بابُ تحريمِ أوَانـي الذَّهَبِ والفِضَّةِ في الشرب وَغيرِهِ علَى الرجالِ والنساءِ
### بەكارهێنانی حاجەتی زێڕو زیو بۆ خواردنو خواردنەوەو شتی تری وا، لە لایەنی پیاوانو ژنانەوە نادروستە

١٣٣٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ.(الحديث ٥٦٣٤): [١٣٣٧]

ئـوم سـەلەمە (ڕەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەرکەسێ لە حاجەتی زیـودا شـت بخواتـەوە، ئـەوە قڵپە قڵپ ئاگری سووری دۆزەخ دەڕژێنێتە ناو سکی خۆیـەوە). (ریـاض/٢ ز/١١٦ ل/٢٧٢ ژ/٧٧٨ ش).

---

[١٣٣٧] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٥٤ = ٥٦٣٤ بخاری. مسلم: ٢٠٦٥ - ٥٣٥٣ شـیحا (بخـاری رقـم الکتـاب/٧٤ رقم الباب/٢٨).



## (٢) باب تحريم إستعمال إناء الذَهَب والفضَة على الرجال والنساءِ وَخَاتَم الذَهَبِ والحَرير عَلَى الرجل وَإبَاحته لِلنساءِ وَإبَاحَة العَلَمِ وَنَحْوِهِ عَلَى الرَّجُلِ مَا لَمْ يَزِدْ عَلَى أربَعِ أصَابِعِ

## بەكارهێنانی حاجەتی زێڕو زیو، بۆ پیاوانو بۆ ژنان نادروستە، هەروا ئەنگوستیلەی زێڕو ئاورێشم بۆ پیاو نادروستە، بەلام بۆ ژن دروستە، هەروا نەخش و پینەی جلو بەرگ بە ئاوریشم بۆ پیاو دروستە بە مەرجێ لە چوار پەنجە پتر نەبێ

١٣٣٨- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزَ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ أَوِ الْمُقْسِمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَإِفْشَاءِ السَّلاَمِ، وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمَ أَوْ تَخَتُّمٍ بِالذَّهَبِ، وَعَنْ شُرْبٍ بِالْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالإِسْتَبْرَقِ، وَالدِّيبَاجِ. {الحديث: ٥٣٥٦ = ٥٣٤٧ فم. تجريد/٢/٢٢، رقم: ٦٠٠ = ١٢٣٩، ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٦٥٠، ٥٨٣٨، ٥٨٤٩، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٦٥٤. ترمذي. لباس: ١٧٦٠. نسائي. جنائز: ١٩٣٨. تحفة الأشراف: ١٩١٦}: [١٣٣٨]

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردووین بەحەوت شت، وە جڵەوگیری لێکردووین لەحەوت شت، فەرمانی پێکردووین بەم حەوت شتە:

١- بەسەردانی نەخۆش و.

٢- بەشوێنکەوتنی تەرم بۆسەر گۆڕستان بۆ سپاردنی بەخاك و.

(١٣٣٨) تجريد/٢، ژمارە: ٦٠٠ = ١٢٣٩ بخاری. مسلم: ٥٣٥٦ تخريج وترقيم شيحا - پوختەی موسلیم: ١٣٧١ (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/٢٨).



٣- بەنزا بۆ پژمیو، کە پژمیو دەپژمێ، پێی بڵێین (يَرْحَمُكَ اللّـهُ: خـودا ڕەحمـەت پێ بکا)و.
٤- بە بەجێهێنانی سوێندو.
٥- بە یاریدەو کۆمەکی ستەمبارو.
٦- بەچوون بۆسەر دەعوەتو.
٧- بە پەخشی سلاو.
وە جڵەوگیریشی لێ کردووین لەم حەوت شتە:
١/ لە ئەنگوستیلەی زێڕو.
٢/ لە خواردنو خواردنەوە لە حاجەتی زیوداو.
٣/ لەسەر زینی ئاورێشمو.
٤/ لە کاڵاو مشکیو هەوری تێکەڵ لە ئاورێشمو لەشتی ترو.
٥/ لە پۆشینی ئاورێشمو.
٦/ لە ئیستەبرەق (ئاورێشمی ئەستوور)و.
٧/ لە دیباج (جۆرە ئاورێشمێکە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٨٠٠، ج/٤}.
ئەمـەیش دەقـی ئـەم فەرموودەیـە لـە ژمـارە (٦٠٠) تەجریـدی بوخـاری، دەینووسین، بۆ ڕەچاوکردنی جیاوازی نێوانی گێڕانـەوەی پـیری بوخـاریو پـیری موسلیم:
عَنِ البَراءِ رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: أَمَرَنا النَبِيّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِـسَبْعٍ وَنَهانـا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنا بِاتباعِ الجَنائِزِ، وَعِيادَةِ المَرِيضِ، وَ إجابَةِ الداعيّ، وَنَصْرِ المَظْلُومِ، وَإبرارِ القَسَمِ، وَرَدِّ السَّلامِ، وَتَشْمِيتِ العاطِسِ، وَنَهانـا عَـنْ آنِيَـةِ الفِـضَةِ، وَخـاتَمِ الـذَّهَبِ، والحَرِيرِ، والـدِّياجِ، والقِـسّيِّ والإسـتَبْرَقَ. (الحـديث ١٢٣٩، أطرافُـهُ في: ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٦٥٠، ٥٨٣٨، ٥٨٤٩، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٦٥٤):

بەڕای کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێکردین بە حەوت شت، وەجڵەوگیری لێکردین لە حەوت شت، فەرمانی پێ کردین بە شوێنکەوتنی تەرم و بەسەردانی نەخۆش و چوون بۆ سەر دەعوەت و یاریدەی ستەمبارو بەجێهێنانی سوێندو وەڵامدانەوەی سڵاوونزا بۆ پژمیو. جڵەوگیریشی لێ کردین لەم حەوتە: لە حاجەتی زیوو ئەنگوستیلەی زێڕو لە ئاوریشم و لە دیباج و لە کاڵاو مشکی و هەوری و پووشینی تێکەڵ لە ئاوریشم و شتی ترو لە ئیستەبرەق.

١٣٣٩- حديث حذيفة: عن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى أَنَّهُمْ كَانُوا عِنْدَ حُذَيْفَةَ فَاسْتَسْقَى فَسَقَاهُ مَجُوسِيٌّ . فَلَمَّا وَضَعَ الْقَدَحَ فِي يَدِهِ رَمَاهُ بِهِ وَقَالَ لَوْلاَ أَنِّي نَهَيْتُهُ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ . كَأَنَّهُ يَقُولُ لَمْ أَفْعَلْ هَذَا ، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ « لاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَلاَ الدِّيبَاجَ وَلاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ ، وَلاَ تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا ، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَنَا فِي الآخِرَةِ »: [١٣٣٩]

ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا، ژمارە (١٢٨٨) ئاوایە، سوودی پتری واتیادا:

عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُكَيْمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بِالْمَدَائِنِ فَاسْتَسْقَى حُذَيْفَةُ، فَجَاءَهُ دِهْقَانٌ بِشَرَابٍ فِي إِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ فَرَمَاهُ بِهِ، وَقَالَ: إِنِّي أُخْبِرُكُمْ أَنِّي قَدْ أَمَرْتُهُ أَنْ لاَ يَسْقِيَنِي فِيهِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ تَشْرَبُوا فِي إِنَاءِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلاَ تَلْبَسُوا الدِّيبَاجَ وَالْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَهُوَ لَكُمْ فِي الآخِرَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٥٣٦١ = ٥٣٥٢ فم. تجريد/٥/٢٠٩، رقم: ١٨٥٤ = ٥٦٣٤، ٥٦٣٠، ٥٦٣١. نسائي. زينة: ٥٣١٦} :

[١٣٣٩] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٥٤ = ٥٦٣٤ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٢٨٨ = ٥٣٦١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/٢٩).

عەبـدوڵڵای کـوڕی عوکـەیم فـەرمووی: لەخزمـەتی حوزەیفـەدا بـووین، لەمـەدائین بـووین، کـە ئێـستا پێـی دەگـوترێ: سـەلمانپاك، حوزەیفـە داوای ئـاوی خواردنەوەی کرد، کوێخایێ لـە حاجـەتێکی زیوینـدا ئـاوی بۆهێنـا، ئـەویش لێـی وەرگرتو جامەکەی بە ئاوەکەوە کێشا پێیدا. ئەوجا پێی گوتن: بـا پێتـان بڵێم بۆچی وام لێی کرد، ئەمە چەندین جارە پێی دەڵێم کە شتی وانـەکاو لـە قـاپو حاجەتی زێڕو زیودا شتی خواردنو خواردنەوەم بۆ نەهێنێ، کەچی ئەو هەرواز ناهێنێ، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە حاجەتی زێـرو زیـودا شـت مـەخۆنو شـت مەخۆنـەوە، وە ئاوریـشمو دێبـاجیش لەبـەر مەکەن، چونکە ئەمانە، واتە: زێڕو زیوو دێباجو ئاوریشم، لە جیهانا بۆ ئەوانـەو لەدوا رۆژدا بۆ خۆمانە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمـارە: ٢٦٨٦} + {تـاج/٣، زنجـیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٣ ج/٤}.

١٣٤٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَر رضى الله عنهما) أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ (رَضِـي اللهُ عَنْهُ) رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ فَلَبِـسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذا قَدِمُوا عَلَيْكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: (إِنَّمَـا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ) ثمَّ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مِنْهَا حُلَلٌ فَأَعْطى عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مِنْهَا حُلَّةً فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُـولَ اللَّـهِ كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطارِدٍ مَا قُلْتَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: (إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا) لِتَلْبَسَهَا فَكَسَاهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطابِ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ أَخًـا لَـهُ بِمَكَّـةَ مُشْرِكًا) (الحـديث: ٨٨٦–اطرافـه في: ٩٤٨، ٢١٠٤، ٢٦١٢، ٢٦١٩، ٣٠٥٤، ٥٨٤١، ٥٩٨١، ٦٠٨١ ):[1340]

---

[1340] تجریـد/١، ژمـارە: ٤٧٠ = ٨٨٦ بخـاری. مـسلم: ٥٣٦٨ شـیحا (بخـاری رقـم الکتـاب/١١ رقـم الباب/٧) + پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٣٥ = ٥٣٧٠ شیحا.



عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: جارێ عومەری کوڕی خەطاب قاتێکی ئاوریشمی پەتی لەبەر دەرگای مزگەوتا دەبینێ، عەرزی حەزرەت دەکا: ئەی پێغەمبەری خودا خۆزگا ئەم دەستە جلەت دەکڕی، بۆ ڕۆژی هەینی لەبەرت دەکرد، هەروەها کاتێ وەفدێ دێن بۆ خزمەتت لەبەری بکە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم جۆرە جلە لەبەر ئەوەی کەئاوریشمی پەتییە ئەو پیاوانە لەبەری دەکەن کەبەشیان بەنازو نیعمەتی ئەوجیهانەوەنەبێ). لەپاشا چەند دەستێ لەوجۆرە بەرگە ئاوریشمینە هێنران بۆپێغەمبەر (رەحمەتی خوای لێ بێ) پێغەمبەرئەو قاتانەی دابەش کرد بەسەر هاوڕێیانی دا، دەستێکی لێیان نارد بۆ عومەر. عومەر عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ڕۆژە کەعەطاریدی بازرگان قاتێکی لەم جۆرەی لەبەر دەمی مزگەوتدا دانا بوو، من عەرزم کردی ئەم قاتە بکڕەو بۆرۆژانی هەینیو بۆ پێشوازی وەفد لەبەری بکە، تۆ فەرمووت شتی وا پیاوێ لەبەری دەکا کەبەشی بەخۆشی ئەو جیهانەوە نەبێ، کەچی ئێستا تۆخۆت لەهەمان جۆرە قات، قاتێکت بۆم ناردووە، بفەرموو ئەمەم تێ بگەیەنە!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆمن ئێستا ئەم قاتەم بۆ ئەوە بۆت نەناردووە کەخۆت لەبەری بکەی، دەتوانی بەشێوەیەکی تر سوودی لێ وەربگری). ئیتر عومەریش ئەو دەستەجلەی دابەبرایەکی هاوبەشپەیداکەری خۆی، کەهێشتا موسوڵمان نەبوو بوو، هەر لە مەککە نیشتەجێ بوو.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:( لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ). (الحديث: ٨٨٧- طرفه في: ٧٢٤٠):




**لەئەبوو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەبادا ئەرك بخەمە سەرشانی گەلی ئیسلامم، دەنابۆ کردنی گشت نوێژێ فەرمانم پێ دەکردن کەسیواك بکەن).**

عن أَنَسٌ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ- صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -(أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ).(الحديث: ٨٨٨):

**ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: (خۆتان دەزانن کەسەبارەت بەسیواك زۆرم لەگەڵ داگوتن، کەواتە هەقوایە کەبەگوێم بکەن!).**

عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ، فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ: ( الم تَنْزِيلُ) السَّجْدَةَ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ ). (الحديث: ٨٩١-طرفه في: ١٠٦٨):

**ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەمیشە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەرکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا، لەپاش خوێندنی سورەتی فاتیحا، سورەتی ئەلیف لام میمی سەجدەی بەتەواوی دەخوێند، وەلەرکاتی دوەمیدا، لەپاش فاتیحە، سورەتی (هل أتي على إلانسان حين من الدهر)ی دەخوێند.**

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما) سَمِعْت -رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقُولُ:(كُلُّكُمْ رَاعٍ، وكلكم مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ،فَالْإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ راعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ،وَالْمَرْأَةُ راعيةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا ومَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا وَالْخَادِمُ راعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ و مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ). قَالَ: وَحَسِبتُ أن قدقَالَ: (وَالرَّجُلُ راعٍ فِي مَالِ أَبِيهِ، وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَ

مَــــــسْئُولٌ عَـــــنْ رَعِيَّتِــــــهِ). (الحـــــــديث: ٨٩٣- أطرفـــــــه في: ٢٤٠٩،٢٥٥٤،٢٥٥٨،٢٧٥١،٥١٨٨،٥٢٠٠،٧١٣٨):

ئیبنوعومــەر (ڕەزای خودایــان لــێ بــێ) فــەرموی: بــەگوێی خــۆم لــەزاری پێغەمبــەرم بیــست (دروودی خــوای لێ بــێ) دەیفــەرموو: (ئاگــاداربن کــەئێوە هەموتان، هەرکەسە بەپێی بەر پرسیاریی خۆی چاودێرن وەك شوانی دیـار ران، پێشەوا کەسـەرۆکی نەتـەوەی ئیـسلامەـشـوانی ئەوکۆمەڵـە خەڵکەیـە، کـەبووە بەسەرۆکیان، لەلای خودا بەرپرسـیارە لەئـەرکی پێشەوایی، سـەبارەت بـەو گـەلی ئیسلامە، کەوان لەژێر چاودێریی ئەودا، هەروا هەموو پیاوێ (لـەناو ماڵومنـاڵی خۆیـدا) چـاودێرەو شـوانیانە، دەبـێ وەك شـوانی بـاش چـاودێریی بەرژەومنـدی ماڵو مناڵی خۆی بکا، چـونکە لـەلای خـودا بەرپرسـیارە لـەوە، هـەروەها هـەموو ژنــێ (لـەناو مـاڵی مێردیـدا) چـاودێرەو،لـەلای خـودای گـەورە بەرپرسـیارە لـە ڕەچاوکردنی بەرژەومنـدی ئەوانـەی کـەوان لـەژێر چـاودێریی ئـەودا،هـەروەها نۆکـەریش چــاودێرە بــەدیار ســامانی ئاغاکەیــەوە، وەلــەلای خــودای گــەورە بەرپرسیارە لەوەی کەوا لەژێرچاودێریی ئەودا). ئیبنوعومەر فەرموی: وادەزانم کەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) فەرموشی: (هـەروەها پیـاو چـاودێرە لەناو سامانی باوکی دا، وەلەلای خودا بەر پرسیارە لە چاودێرکراوی خۆی، تێکرا ئێوەی گەلی ئیسلام، هەموتان، هەرکەسەی بەپێ ی پایەو پلەی خۆی، چاودێرنو پاسەوانن، وەهەمویشتان، هەر کەسە بەپێ ی پایەی خۆی لەناو گەلی ئیـسلام دا، بەرپرسیارن لەرەچاو کردنی بەرژەومنـدی ئـەوەی کـەوا لـەژێر چـاودێریتان دا). (تاج-٣ ز-١٠٦ ژ-٢٤٣١ چ-٤).

ئەمەیش گێڕانـەوەی ژمـارە (١٣٣٥)ی پوختـەی موسـلیمە، لـە بـەرگی چواردا، بەهرەی زۆری واتیادا:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: رَأَى عُمَرُ بن الخطاب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عُطَارِدًا التَّمِيمِيَّ يُقِيمُ بِالسُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، وَكَانَ رَجُلاً يَغْشَى الْمُلُوكَ وَيُصِيبُ مِنْهُمْ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي رَأَيْتُ عُطَارِدًا يُقِيمُ فِي السُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، فَلَوِ اشْتَرَيْتَهَا فَلَبِسْتَهَا لِوُفُودِ الْعَرَبِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، وَأَظُنُّهُ قَالَ: وَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ»، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِحُلَلٍ سِيَرَاءَ، فَبَعَثَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ، وَبَعَثَ إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ بِحُلَّةٍ، وَأَعْطَى عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ حُلَّةً، وَقَالَ: «شَقِّقْهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ»، قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ بِحُلَّتِهِ يَحْمِلُهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ، وَقَدْ قُلْتَ بِالأَمْسِ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ، فَقَالَ: «إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنِّي بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُصِيبَ بِهَا»، وَأَمَّا أُسَامَةُ فَرَاحَ فِي حُلَّتِهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَظَرًا عَرَفَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ أَنْكَرَ مَا صَنَعَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَنْظُرُ إِلَيَّ، فَأَنْتَ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَا، فَقَالَ: «إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنِّي بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُشَقِّقَهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ». {الحديث: ٥٣٧٠ = ٥٣٦١ فم. تجريد/١، لاپەڕە: ٤٤٧، رقم: ٤٧٠ = ٨٨٦، ٩٤٨، ٢١٠٤ فتح الباری}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) لە بازاڕی مەدینە، عوطاریدی تەمیمی بینی قاتێکی ئاورێشمی خەت خەتی خستبووە سەر سەوا، عوطارید پیاوێ بوو هاموشۆی پادشایانی دەکردو شتیان پێدەدا، عومەر عەرزی حەزرەت دەکا: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگا ئەم دەستە جلەی عوطاریدت دەکڕی بۆ ڕۆژی هەینی لەبەرت دەکرد، هەروەها کاتێ وەفدی عەرەبەکان دێن بۆ خزمەتت لەبەری بکە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (ئەم جۆرە جلە لەبەرئەوەی کە ئاورێشمی پەتییە، ئەو پیاوانە لەبەری دەکەن کە بەشیان

بەنازو بەهرەی ئەو جیهانەوە نییە). لەپاشا چەند قاتێ، لەو جۆرە بەرگە ئاوریشمینە هێنران بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کردن بەسەر هاوەڵانیدا، قاتێکی لێیان نارد بۆ عومەرو قاتێکی تری لێیان نارد بۆ ئوسامەی کوڕی زەیدو قاتێکی لێیاندا بە عەلی کوڕی ئەبو طالیبو پێی فەرموو: (لەت لەتی بکە بۆ لەچکەو سەرپۆش بۆ ژنەکانت). فەرمووی: جا عومەر قاتەکەی خۆی هەڵگرتو هێنای بۆلای پێغەمبەرو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ ئەمەت بۆمن ناردووە، کەچی دوێنێ لەبارەی قاتەکەی عەطاریدەوە واوات فەرموو، بفەرموو ئەمەم تێ بگەیەنە؟ ئەویش فەرمووی: (خۆ من ئێستا ئەم قاتەم بۆ ئەوە بۆت نەناردووە کە خۆت لەبەری بکەی، بەڵکوو دەتوانی بە شێوەیەکی تر سوودی لێ وەربگری). بەڵام ئوسامە خۆی قاتەکەی لەبەرکرد بوو، کەچوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر بەخێسە تەماشای ئوسامەی کرد، ئوسامە هەستی کرد، کە پێغەمبەر کارەکەی ئەوی بەدڵ نییە، لەبەرئەوە عەرزی کرد: (قوربان! بۆوا خێسە لە قاتەکەم دەکەی؟ خۆ تۆ خۆت ناردووتە بۆم؟). فەرمووی: (بەڵام خۆ من بۆ ئەوە بۆتم نەناردووە کە خۆت لەبەری بکەی، بەڵکوو بۆیە بۆتم ناردووە کە پارچە پارچەی بکەی بۆ لەچكو سەرپۆش بۆ ئافرەتەکانتان). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٧٧٧}.

١٣٤١- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَنَحْنُ بِ(أَذْرَبِيجَانَ): يَا عُتْبَةَ بْنَ فَرْقَدٍ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ كَدِّكَ، وَلاَ مِنْ كَدِّ أَبِيكَ وَلاَ مِنْ كَدِّ أُمِّكَ، فَأَشْبِعِ الْمُسْلِمِينَ فِي رِحَالِهِمْ، مِمَّا تَشْبَعُ مِنْهُ فِي رَحْلِكَ وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَعُّمَ وَزِيَّ أَهْلِ الشِّرْكِ وَلَبُوسَ الْحَرِيرِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ لَبُوسِ الْحَرِيرِ. قَالَ: «إِلاَّ هَكَذَا». وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِصْبَعَيْهِ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ وَضَمَّهُمَا قَالَ زُهَيْرٌ: قَالَ عَاصِمٌ: هَذَا فِي الْكِتَابِ. قَالَ: وَرَفَعَ زُهَيْرٌ إِصْبَعَيْهِ».

{الحديث: ٥٣٧٨ = ٥٣٦٩ فم. بخاري. لباس: ٥٨٣٠. أبو داود. لباس: ٤٠٤٢. ترمذي. لباس: ١٧٢١} : [١٣٤١]

ئەبو عوثمان فەرمووی: لە ئازربایجان بووین، عومەری کوڕی خەتاب، کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو، ئەم نامەیەی نووسی بۆمان، ئاراستەی فەرماندەکەمانی کرد، کە عوتبەی کوڕی فەرقەد بوو، ئەویش خویندیەوە بەسەرمانا، فەرمووی: ئەی عوتبەی کوڕی فەرقەد! ئەو ماڵو سامانەی کە لەلای تۆیە، کە لە گەنجینەی بەیتولمال دایە، ئەوە بەرهەمی رەنجە شانی موسوڵمانانە، ئەوە نەبەرهەمی رەنجە شانی تۆیەو نە بە کەلەپوورو میرات لەبەرهەمی رەنجە شانی باوكو دایکتەوە بۆت ماوەتەوە کەواتە بەتێرو تەسەلی تۆیش وەك هەموو موسوڵمانێکی تر، وەکوو یەك لێی بخۆن، نەکەن سەر بکەنە ناز پەروەریو ژیانی رابواردن، یا جلو بەرگی تایبەت بە بێباوەڕان لەبەر بکەن، یا پۆشاکی ئاورێشم بپۆشن، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگری لە پۆشینی پۆشاکی ئاورێشم دەکرد، دەیفەرموو: (مەگەر ئا ئەوەندە).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو پەنجەی خۆی بەرزەوە کرد، تا ئاماژەکەی خۆی پێ روون بکاتەوە، کە پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی شایەتمانی بوو، لەهەمان کاتدا دوو پەنجەکەی نووساندبوو بەیەکەوە. زوهەیر (کە کەسی دووەمە لە رشتەی ئەم فەرموودەیەدا) فەرمووی: مامۆستاکەی من کە عاصیمی ئەحوەلە فەرمووی:ئەمە لەنامەکەدا بوو. فەرمووی: زوهەیریش دوو پەنجەی خۆیی هەڵبڕی).

[١٣٤١] بخاری. لباس: ٥٨٣٠ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٣٨ = ٥٣٧٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٢٥).

**ڕوونکردنەوە:**

عوتبەی کوڕی فەرقەدی ئەل‌سولەمی، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، ئامادەی ئازادکردنی قەڵای خەیبەر بووە، یەکێ بوو لە فەرماندە ناودارەکانی ئیمامی عومەر، بە فەرمانی عومەر لەگەڵ عیاضی کوڕی غنم دا، لە بیست‌و هەشتی کۆچیدا موصوڵیان ئازاد کرد. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرووتی دەست دەهێنێ بەسەر پشت‌و بەسەر سکیدا، ئیتر بە فەرمانی خودا هەتا مردن لەشی بۆنێکی خۆشی لێ دەهات، لەبۆنی میسک‌و عەنبەر خۆشتر. لەپاش خەبات‌و تێکۆشانێکی زۆری بێ وچان، چوو لە کووفە دانیشت، لەوێ ژیا تا لەوێ گیانی پاکی سپارد.

١٣٤٢- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَهْدَى إِلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُلَّةَ سِيَرَاءَ فَلَبِسْتُهَا فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ فَشَقَقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي) (الحديث ٢٦١٤، طرفاهُ في: ٥٣٦٦، ٥٨٤٠): [١٣٤٢]

پێشەوا عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستێ بەرگی بەدیاری پێم دا، ئاوریشمی پەتی بوو، منیش بۆ خۆم لەبەرم کرد، کەچی تەماشام کرد پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) تووڕە بوو،وەفەرمووی: (خۆ من بۆ ئەوە بۆتم نەناردووە کە خۆت لەبەری بکەی، بۆ ئەوە بۆم ناردویت کە پارچە پارچەی بکەی، بۆ سەرپۆش بۆ ژنانتان) منیش وام کرد. (تاج/٤/١٠٣ز-٣٠- ئاوریشم‌و زێڕ بۆ مێینە دروستن).

لەژمارە (١٣٤٣)ی پوختەی موسلیمدا، ئاوایە:

---

[١٣٤٢] تجرید/٣، ژمارە: ١١١٠ = ٢٦١٤ بخاری. مسلم: ٢٠٧١ محمد فؤاد = پوختەی موسلیم: ١٣٤٣ - ٥٣٨٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥١ رقم الباب/٢٧).

عَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أُكَيْدِرَ دُومَةَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَوْبَ حَرِيرٍ، فَأَعْطَاهُ عَلِيًّا كرم الله وجهه، فَقَالَ: «شَقِّقْهُ خُمُرًا بَيْنَ الْفَوَاطِمِ». {الحديث: ٥٣٨٩ = ٥٣٨٠ فم}:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خوودای لێ بێ) فەرمووی: ئوکەیدیری پادشای دوومەتولجەندەل، پارچەیێ جلی ئاورێشمی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەخشی بە عەلی (رەزای خودای لێ بێ) پێی فەرموو: (دابەشی بکە لەبەینی فاطیمەکاندا، کە بیکەن بە لەچك بۆ خۆیان). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لە فاطیمەکان ئەم سێ کەسەیە:

١- فاطیمەی کچی پێغەمبەر، کە هاوسەری عەلی بوو.

٢- فاطیمەی کچی ئەسەد، دایکی ئیمامی عەلی.

٣- فاطیمەی کچی حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب، کە ئامۆزای پێغەمبەرو عەلی بوو، چونکە حەمزە مامیانە.

١٣٤٣- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا فَلَنْ يَلْبَسَهُ فِي الْآخِرَةِ.(الحديث ٥٨٣٤ أطرافه في: ٥٨٢٨، ٥٨٢٩، ٥٨٣٠، ٥٨٣٥): [١٣٤٣]

عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست -درووودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەر پیاوێ لەموسوڵمانان لەم جیهانەدا، ئاوریشم لەبەربکا،

[١٣٤٣] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٩٦ = ٥٨٣٤ بخاری. مسلم: ٥٣٩٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٢٥).

لەوجیهانـدا لەبەهەشـتا لەبـەری ناکـا، واتـە: ناچێتە بەهەشـت چـونکە بـەرگی بەهەشتییەکان ئاوریشمە). (تاج/٤ ز/٢٩ ل/٩٧ ژ/١).

**روونکردنەوە:**

لـەتاج دا دەفـەرموێ: بوخـاری و موسـلیم و نەسـائی ئـەم فەرموودەیـەیان گێڕاوەتەوە، لەوەجهێکی ئەم فەرمودەیـەدا، کەلـە ئیمـامی ئەنەسـەوەیە، عـەینی دەفـەرموێ: (و الحـدیث مـن أفـرادِهِ واتـە: ئـەم فەرموودەیـە بوخـاری بەتـەنیا گێڕاویەتـەوە، موسـلیم نەیگێڕاوەتـەوە). ئـەم دوو فەرمایـشتە بەدیمـەن جیایـە، دەگەڕێتەوە بـۆ خـاڵێکی گـرنگ لـە زانـستی فـەرموودەدا، کـە ئـەویش ئـەم یاسـا ناسراوەیە، لەناو فەرموودە شوناسەکاندا:-

(فـەرموودە بـەدوو شێوەی سـەرەکی دابـەش دەکـرێو هەربەشـەی نـاوێکی لێ دەنرێ:

**یەکەم**: بەناوی مخرجی یەکەمی، کـە زۆرینـەی کـات یەکێکـە لەسـەحابەکانی پێغەمەر، وەك دەگوترێ: حەدیسی عومـەر، حەدیـسی عائیـشە، حەدیـسی زەیـد، حەدیسی ئەبو سەعید، بەناوی سەحابیەکەوە فەرموودەکە ناودەبرێ، جا ئەوەی کـەلێرەدا، واتـە: لـە پـەراوێزی فەرموودەکانـدا، لـەم کتێبـەدا، لەتەخریجەکـەدا دەفەرموێ: (أخرجه مسلم) مەبەست ئەم جۆرەیە، واتە: ئیمامی موسلیم هەمان فەرموودەی لەهەمان صەحابەوە بەسەنەدی خۆی دەرهێناوە، بەڵام مـەرج نییـە سـەنەدو مـەتنی ئـەمیش بەهـەمان لـەفـظ و بەهـەمان دەقو مـەتنو بەهـەمان سەنەدی بوخاری بێ، بـەڵکو وادەبـێ ڕشـتەو دەقـی فەرموودەکـە لـەلای هـەردوو ئیمام یـەك شـتە بـەبێ زیـادو کـەم، جـاری وایـش دەبـێ هـەم لەڕشـتەکەدا، هـەم لەدەقەکەدا جیاوازی هەیە، بگرە زۆر جار جیاوازی زۆریش هەیە، بەڵام چـونکە

مخرجی حەدیسەكە و تەومرەی حەدیسەكە یەك شتن دادەنرێ بە متفق علیە، تەنانەت رێ دەكەوێ ئیمامی موسلیم، لەیەكێ لە گێرانەوەكانی خۆیدا بۆ فەرموودەكە، پار چەیێ لەدەقی فەرموودەكە، نەقڵ دەكا، وە هەموو فەرموودەكە لەشوێنێ تر نەقڵ دەكا، وە ئیمامی بوخاریش هەروا: لەهەندێ ریوایەتی خۆیدا پارچەیێ لەفەرموودەكە نەقڵ دەكا، كە ئەوپارچەیە لەوفەرموودەیەدا تایبەتە بە خۆیەوە، لەفەرموودەكەی ئیمامی موسلیمدا ئەو پارچەیە یا ئەو زیادەیە نییە، لەبەر ئەوە خوێنەر سەری لێ تێك دەچێ، دەڵێ: كەی ئەم دوو حەدیسەیە لەموتەفقو عەلەیهن. جا بۆ روونكردنەوەی تەواوی ئەم باسە عەرزتان دەكەم، ئیمامی موسلیم فەرموودەی ژمارە: ١٨٩٤ تەجرید، بەم سەنەدە ئیخراج دەكا:

١. زوهەیری كوڕی حەرب و ئەحمەدی كوڕی خیراش، هەردوو شێخی موسلیمن.

٢. عەبدولصەمەدی كوڕی عەبدولواریث.

٣. لە عەبدولواریثی باوكی عەبدول صەمەدەوە.

٤. حوسەینی موعەللیم.

٥. ئیبنو بورەیدە.

٦. یەحیای كوڕی یەعمەر.

٧. ئەبولئەسوەدی دیلی.

٨. ئەبو زەڕ.

بەڵام ئیمامی بوخاری بەسەنەدو مەتنی خۆی ئاوا دەیگێڕێتەوە:

١. ئەبو مەعمەر (شێخ = مامۆستا) ی بوخاری.

٢. عەبدولواریث.

٣. حوسەینی موعەللیم.
٤. عەبدوڵڵای بورمید.
٥. یەحیای کوڕی یەعمەر.
٦. ئەبولئەسوەدی دیلی – دوئەلی-
٧. ئەبو زەڕ

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا، سەنەد –ڕشتەی- موسلیم ئاوایە:

١. محمدی کوڕی موثەننا.
٢. محمدی کوڕی جەعفەر
٣. شوعبە.
٤. و اصیلی ئەحدەب
٥. مەعروور
٦. ئەبوزەڕ.

**یەکەم:** دیارە کەئەم ڕشتانە جیاوازی زۆریان هەیە، بەڵام هەموویان سەر ڕشتەکەیان دەچێتەوە سەر ئەبوزەڕ، ئەلغەفاری، مەتنی ڕیواتەکانیش جیاوازی زۆریان هەیە.

**دووەم:** فەرموودەکە تەوەرە و بابەتەکەو واتاکەی یەکە، یا زۆر لەیەکەوە نزیکە، بەڵام لەچەند سەحابەیەکەوە ئیخراج کراوە، وەك فەرموودەی ژمارە:١٨٩٦ تەجرید، کە لەبوخاریدا لەچەند کەسێکەوە ریوایەت کراوە، ژمارە:٥٨٣٠ فەتح لە عومەرەوە، لەگەڵ تەرەفەکەی: ٥٨٢٨، ٥٨٢٩، ٥٨٣٤، ٥٨٣٥.

ژمارە: ٥٨٣٢ فەتح لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە.

ژمارە: ٥٨٣٣ فەتح مورسەلی ئیبنووزوبەیر.

جابەم جۆرە فەرموودەیە دەگوترێ: ریوایەت و موسلیم. جا ئەوەی کە لەتاجولئوصولا زۆر جار دەفەرموێ: بوخاری و موسلیم، ریوایەتیان کردووە، مەبەست هەردوو شێوەکەیە، جاری واهەیە بەشێوەی یەکەمە، کەپێی دەگوترێ متفق علیە جاری واهەیە بەشێوەی دووەمە، کە پێی دەگوترێ: ریوایەت بەمەعنا، چونکە مەئالی هەردوو فەرموودەکە لەواتاو مەعنادا یەك دەگرێتەوە.

**سێیەم:** ماموستای عەسقەلانی –رەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: لەبارترین فەرمایشت لەم لایەنەوە: (کەسزای ئەوکەسە لەقیامەتا ئەوەیە کەلەو نازو بەهرەیە بێبەش دەبێ، بەلام وادەبێ ئەم هەڕەشەیە نایەتەجێ، بەهۆی تۆبەوە، یا بەهۆی چاکەوە، یا بەهۆی شەفاعەتەوە یا بەهۆی پاڕانەوەی منالەوە بۆی). فەرمایشتی شێخی عەسقەلانی تەواو. لەڕاستیدا ئەم جۆرە هەڕەشانە هەموویان هەروان، مەرج نییە لەقیامەتدا دەقاو دەق جێبەجێ بکرێن، بەلام هەشیانە وەك خۆی جێبەجێ دەکرێ، ئەگەر کابرای گوناهبار هەتا مردن لەگومڕا هیدابێ و ئاورێ لەئایین و خواپەرستی و چاکە خوازی نەداتەوە.

**چوارەم:** (بڕوانە: تێبینی) کۆتایی پایانی پاش ژمارە: ١٩٦٣ تەجرید = بەرگی/٥ ل/٢٢٥).

**تێبینی/** کە دەڵێین موسلیمیش وەك بوخاری فیسارە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، مەبەست ئەوە نییە، کە رشتە (سەنەد) و (دەق)ی هەردووکیان وەك یەك بێ، بەبێ کەم و زیاد، نەخەیر مەبەست ئەوەنییە، گەرچی ئەم بابەتە باسێکی دوورودرێژو کەمێ پێچیدە و ئالۆزە، بەلام لەبەر گرنگی و بۆ سوودو بەهرە وەرگرتنی تەواو لەم ئامازەو هێمایا نەئەم چەند خالە روون دەکەینەوە، بەپشتی خودا، دەڵێین:

١. ریوایـەت بەمـەعنا، ئەوەیـە کەچـەند فەرمووده‌یـەك، چـەند کەسـێ، هەرکەسێ بەرشتەی تایبەتی خۆیو بەدەقی تایبەتی خۆی دەیگێڕێتەوە، وەهەر فـەرموودەیێ لـەو فەرموودانـە لەمەسـنەدی کەسـێکە، بـەلام لەئـەنجاما هـەموو گێڕاوەکـان سـەبارەت بـەباتێکن، ئـەم جـۆرە هـەر زۆر زۆرە، وەك ئـەو کۆمەڵـە فەرمووده زۆرەی کەلەبارەی (محمدی مهدی)یەوەن، بەهەموویان دەگەنە تواتری معنوی، گەرچی لەناو خۆیانا چفیف و قویان واتیادا.

٢. فەرموودەی واهەیە چـەند فـەرمووده شوناسـێ، دەری دەهێنـێ، بەوێنـە: بوخـاری لەئـەبوهورەیرەوە دەری دەهێنـێ، موسـلیم لەئیبنوعەباسـەوە دەری دەهێنێ، بۆ نموونە: فەرموودەی ژمارە: ١٩٥٥ تەجرید = ٦١٥٤ فەتح، بوخاری بەم شێوەی ئێرە لـەدوو صـەحابەوە دەری هێنـاوە، لەئبنوعومـەرەوە، ئـەوجا لەئـەبو هورەیرەوە، بەژمارە: ٦١٥٥ فەتح. رشتەو مەتنی فەرموودەکەی ئیبنوعومەر، لای بوخاری ئاوایە:

١٣٤٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ، ثُمَّ صَـلَّى فِيـهِ، ثُـمَّ انْـصَرَفَ فَنَزَعَـهُ نَزْعًـا شَـدِيدًا كَالْكَـارِهِ لَـهُ، ثُـمَّ قَـالَ: «لاَ يَنْبَغِـي هَـذَا لِلْمُـتَّقِينَ». {الحـديث: ٥٣٩٤ = ٥٣٨٥ فـم. تجريد/١، لاپەڕە: ٢٥٢، رقم: ٢٣٩ = ٣٧٥، ٥٨٠} : [١٣٤٤]

عوقبـەی کـوڕی عـامیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: کەوایـەکی چاکداری ئاورێشمیان بەدیاری هێنا بـۆ پێغەمبـەر (درוودی خودای لەسـەر بـێ) لەبـەری کـردو نوێـژی پێـوە کـردو لەپاشـا کەسـلاوی دایـەوەو رووی لەڕووگـە وەرچەرخان، بە توندی کەواکەی لەبەرخۆی داکەندو فڕەیدا، وەك یـەکێ پێـی ناخۆش بێو حەزی لێی نەبێ، ئـەوجا فـەرمووی: (ئەمـە بـۆ پیـاوی لـەخواترس

---

[١٣٤٤] تجریـد/١، ژمـارە: ٢٣٩ = ٣٧٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٣٣٧ = ٥٣٩٤ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٨ رقم الباب/١٦).

دەست نادا!). {تاج/١، لاپەڕە: ٢٠٦، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٣٩٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## (٣) باب إباحة لبس الحرير للرَّجل إذا كان به حكة أو نحوها
## مۆڵەتدان بە پۆشینی ئاوریشم، بۆ پیاویش، لەبەر خوورکەو شتی تری وەها

١٣٤٥- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فِي الْقُمُصِ الْحَرِيرِ فِي السَّفَرِ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا أَوْ وَجَعٍ كَانَ بِهِمَا. وفي رواية: انهم شكوا إلى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) القَمْل. {الحديث: ٥٣٩٦، ٥٤٠٠ = ٥٣٨٧، ٥٣٩١ فم. تجريد/٣/٣٢٣، رقم: ١١٩٩ = ٢٩١٩، ٢٩٢٠، ٢٩٢١، ٢٩٢٢، ٥٨٣٩. أبو داود. لباس: ٤٠٥٦. نسائي. زينة: ٥٣٢٥. ابن ماجة. لباس: ٣٥٩٢. تحفة الأشراف: ١١٦٩}[١٣٤٥]:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو بە زوبەیری کوڕی عەوامدا، کە ئاورێشم لەبەربکەن، چونکە ئالۆشو خورووکەیێ لە لەشیانا هەبوو. لە گێڕانەوەی ژمارە (٥٤٠٠)دا، لە شەرحی صەحیحی موسلیما، تەرقیمی مامۆستا/خەلیل مەئموون شیحا، دەفەرموێ: عبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو زوبەیری کوڕی عەوام، لە غەزایەکا، لەدەستی ئەسپێ سکاڵایان لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، ئەویش ڕێگەی پێیاندا، کە کراسی ئاورێشم لەبەر بکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٩، ٢٧٧٠ ج/٤}.

---

[١٣٤٥] تجريد/٣، ژمارە: ١١٩٩ = ٢٩١٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٤١ = ٥٣٩٦ سیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٩١).

## (٥) باب فَضْلِ لِبَاسِ ثِيابِ الحبرة

## خێری پۆشینی حیبەر، کە جۆرە حلێکە لە کەتان، یان لە لۆکە دروست دەکرێ

١٣٤٦- عَنْ قَتَادَةُ قَالَ: قُلْنَا لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَيُّ اللِّبَاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ أَوْ أَعْجَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: الْحِبَرَةُ. {الحديث: ٥٤٠٨ = ٥٣٩٨ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٨٤، رقم: ١٨٩٢ = ٥٨١٣، ٥٨١٢ فتح الباري. ترمذي. لباس: ١٧٨٢. نسائي. زينة: ٥٣٣٠. تحفة الأشراف: ١٣٥٣}: [١٣٤٦]

قەتادە فەرمووی: عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیکمان کرد: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەگشت جلو بەرگێ زیاتر حەزی لەچی جلو بەرگێ بوو؟ یاچی بەرگێکی زۆر بەدڵ بوو؟ فەرمووی: حیبەرە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٧٨٠، چ/٤}.

[١٣٤٦] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٩٢ = ٥٨١٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٤٩ = ٥٤٠٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/١٨).

## (٦) باب التَّوَاضُع في اللِبَاس، والإقتصارُ عَلَى الغليظ منهُ، وَاليَسِر مِنَ اللبَاسِ وَالفِراشِ وَغيْرِهَا، وَجَوَازُ لَبْسِ الثَّوْبِ الشَعْرِ وَمَا فِيهِ أعلامٌ

## جلو بەرگی سادەو دوور لە فیزو هەوا پەسەندە، بە پێی توانا جلو بەرگ زبرو ئەستوور بێ باشە، جلو بەرگێکی ئاسایی‌و پێخەف‌و رایەخی ئاسایی بە پێی حاڵ زۆر پەسەندە، بەڵام بەرگی توکاوی‌و ڕیشوودارو قەیفەداریش دروستە

١٣٤٧- عَنْ عَائِشَةَ أَنّها أَخْرَجَتْ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) كِسَاءً مُلَبَّدًا وَقَالَتْ فِي هَذَا نُزِعَ رُوحُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وفي رواية: أنّها أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ وَكِسَاءً مِنْ هَذِهِ الَّتِي يَدْعُونَهَا الْمُلَبَّدَةَ (الحديث ٣١٠٨، طرفُهُ في: ٥٨١٨)[١٣٤٧].

ئەبو بوردە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) پۆشاکێکی ئەستووری پیناوی دەرهێناو فەرمووی: ئائە لەمەدا گیانی پێغەمبەری خودا کێشرا. لە گێڕانەوەیەکا ئەبو بوردە دەفەرموێ: چووم بۆ دێنی دایکە عائیشە بۆ ماڵەوە، بەرکۆش (ئیزار) ێکی ئەستووری دەرهێنا، لەو جۆرە بەرکۆش‌و ئیزارانە کەلەیەمەن دروست دەکرێن، لەگەڵ جلێکی تری پینە پیناویدا، ئینجا سوێندی بۆمان خوارد بەخوا: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی گیان کێشانیداو، لەسەرەمەرگ دا، ئەم دوو جلکەی لەبەردا بوو) (تاج/١٠٩/٤ فـ٣ز- ٣٢- ش/د/ ت).

---

[١٣٤٧] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٦٠ = ٣١٠٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٥١ = ٥٤٠٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/١٩).

## (٧) باب جَوَازِ الأنماط
## قالّىو مافور دروسته

١٣٤٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ لَكُمْ مِنْ انْمَاطٍ؟ قُلْتُ: وَانَّى يَكُونُ لَنَا الانْمَاطُ؟ قَالَ: امَا انَّهُ سَيَكُونُ لَكُمْ الانْمَاطُ فَانَا اقُولُ لَهَا يَعْنِي امْرَاتَهُ اخِّرِي عَنِّي انْمَاطَكِ فَتَقُولُ: الَمْ يَقُلْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انَّهَا سَتَكُونُ لَكُمْ الانْمَاطُ فَادَعُهَا.(الحديث: ٣٦٣١، طرفه في: ٥١٦١): [١٣٤٨]

جابير (رەزاى خوداى لىّ بىّ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لىّ بىّ) فەرمووى: (ئەرىّ قالّيتان هەيە؟) عەرزيم كرد: قوربان! قالّيمان لە كوىّ بوو؟ فەرمووى: (دەسا ڕۆژىّ دەبىّ كە قالّيتان دەبىّ!). دەى ئێستا زۆر جار كە بە ژنەكەم دەلّيم: (ئەم قالّيچانە بۆمن ڕامە خەو لايبە) ئەويش بۆ ئەوەى كە بيچەسپێنىّ، كە كارێكى ناشايستەى نەكردووە، وەلامم دەداتەوە دەلّىّ: ئەى ئەومنە بو پێغەمبەر (دروودى خوداى لىّ بىّ) هەوالّى لە پەيدا بوونى قالّى دەداو ديفەرموو: (ڕۆژىّ دەبىّ قالّيتان دەبىّ!) ئيتر منيش واز لە قالّيەكە دەهێنم بەراخراوى).

لە ژمارە (١٣٥٢)ى پوختەى موسليما ئاوايە:

عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجْتُ قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَتَّخَذْتَ أَنْمَاطًا؟». قُلْتُ: وَأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: «أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ»، قَالَ جَابِرٌ: وَعِنْدَ امْرَأَتِى نَمَطٌ فَأَنَا أَقُولُ: نَحِّيهِ عَنِّى، وَتَقُولُ: قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّهَا سَتَكُونُ». {الحديث: ٥٤١٦ = ٥٤٠٧فم. تجريد/٤، لاپەرە: ١٢٥،

---

[١٣٤٨] تجريد/٤، ژمارە: ١٤٤٢ = ٣٦٣١ بخارى. پوختەى موسليم/٤، ژمارە: ١٣٥٢ = ٥٤١٦ (بخارى رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/١٨).

رقم: ١٤٤٢ = ٣٦٣١، ٥١٦١. أبو داود. لباس: ٤١٤٥. ترمذي. أدب: ٢٧٧٤. تحفة الأشراف/ ٣٠٢٩}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: كاتێ ژنم هێنا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: مافوورت هەیە؟ گوتم: مافوورم لەكوێ بوو؟ فەرمووی: (دەسا مافوور لەمەولا پەیدا دەبێ!). جابیر فەرمووی: ئێستاكە ژنەكەم مافوورێكی هەیە، كەپێی دەڵێم: لەمنی دوور بخەرەوە، ئەم قاڵیچانە بۆمن رامەخەو لایبە، دەڵێ: ئەی ئەوەنەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەواڵی لەپەیدابوونی قاڵی دەداو دەیفەرموو: (ڕۆژێ دەبێ قاڵیتان دەبێ). ئیتر منیش دەنگم نەدەكرد!. {تاج/٣، زنجیره: ٤٩، ژماره: ٢٩٠٧}.

## (٩) باب تحريم جر الثوب خيلاء، وبيان حد ما يجوز إرخاؤه إليه وما يستحب

١٣٤٩- عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثِيَابَهُ مِنَ الْخُيَلاَءِ لاَ يَنْظُرُ اللّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٥٤٢٢ = ٥٤١٣ فم}: [١٣٤٩]

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەسێ بۆ فیزو دەعیە جلو بەرگی خۆی بەكێش بكا، لەڕۆژی قیامەتا خودا بەچاوی مەرحەمەتو سۆزو میهرەبانی تەماشای ناكا). {ریاض/٢/٢٨٠، زنجیره: ١١٩، ژماره: ٧٩٢}.

---

[١٣٤٩] بخاری. لباس: ٥٧٨٣، ٥٧٩١ مسلم: ٥٤٢٠ شیحا - پوختەی موسلیم/٤، ژماره: ١٣٦١ = ٥٤٢٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/١).

١٣٥٠- عَنْ مُحَمَّدٍ ابْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وَرَأَى رَجُلاً يَجُرُّ إِزَارَهُ فَجَعَلَ يَضْرِبُ الأَرْضَ بِرِجْلِهِ، وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْبَحْرَيْنِ، وَهُوَ يَقُولُ: جَاءَ الأَمِيرُ جَاءَ الأَمِيرُ! قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا». {الحديث: ٥٤٣٠ = ٥٤٢١ فم} : [(١٣٥٠)]

موحەممـەدی کـوڕی زیـاد فـەرمووی: بیـستم لـە ئـەبو هـورەیرە کـە فەرمانڕەوای سەر بەحرین بوو، لەسـەردەمی ئیمـامی عومـەردا (ڕەزای خودایـان لێ بێ) لەکاتێکا، کە پیاوێکی بینی جلەکەیی بەسـەر زەویـدا کێش دەکـردو پێـی دەماڵی بەزەویـداو دەیگـوت: وامـیر هـات، وامـیر هـات، بیـستم لـە ئـەبو هـورەیرە لەوکاتــەدا دەیفــەرموو: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دەفــەرموێ: (هەرکەسێ جلو بەرگی خۆی بۆ هەواو فیزو دەعیە بەسەر زەویدا بەکێش بکا، خــودای گــەورە بەچــاوی ســۆزو میهرەبــانی تەماشــای ئــەو کەســە ناکــا). {ریاض/٢/٢٨٨، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٧٩٩} + {تاج/٣، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٢٨٣٤} .

## (١٠) باب تحريم التبختر في المَشْيِ مَعَ إعْجَابِهِ ثيابِهِ

١٣٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي قَدْ أَعْجَبَتْهُ جُمَّتُهُ وَبُرْدَاهُ إِذْ خُسِفَ بِهِ الأَرْضُ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الأَرْضِ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ». {الحديث: ٥٤٣٢ = ٥٤٢٣ فم. بخاري. لباس: ٥٧٨٩} : [(١٣٥١)]

---

(١٣٥٠) بخاری. لباس: ٥٧٨٨. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٣٥٩ = ٥٤٣٠ شـیحا (بخـاری رقـم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٥).

(١٣٥١) بخاری. لباس: ٥٧٨٩ پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٣٦٢ = ٥٤٣٢ شـیحا (بخـاری رقـم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٥).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ کابرایێ لە پێشینان دەنازێ بەخۆیەوەو بـە کـاکۆڵو جلەکانیـەوەو فیـزی پێـوە دەکـردن، لـەپڕ لەوکاتـەدا رۆچـوو بـەناخی زەویـدا، ئـیتر هـەتا رۆژی قیامـەت هـەڵ دەستـێ ئـەو کابرایـە هـەر قوڵتـە قوڵت دادەچێ بەناخی زەویداو هەر ناگاتە بنی، تا تۆزێ ستار بگرێ).

## (١١) باب في طَرْحِ خاتم الذهَبِ
## توڕدانی ئەنگوستیلەی زێڕ

١٣٥٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ نَهَى عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ: [١٣٥٢]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگری دەکرد لەپۆشینی ئەنگوستیلەی زێڕ بۆ پیاو.

١٣٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فَكَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِى بَاطِنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَصَنَعَ النَّاسُ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَنَزَعَهُ، فَقَالَ: «إِنِّى كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتِمَ، وَأَجْعَـلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ»، فَرَمَى بِهِ، ثُمَّ قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا»، فَنَبَذَ النَّـاسُ خَـوَاتِيمَهُمْ. {الحديث: ٥٤٤٠ = ٥٤٣٠ فم. بخارى. أيمان ونذور: ٦٦٥١. نسائى. زينة: ٥٣٠٥. تحفة الأشراف: ٨٢٨١} : [١٣٥٣]

---

[١٣٥٢] بخاری. لباس: ٥٨٦٣ مسلم: ٥٤٣٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٤٥).

[١٣٥٣] بخاری. ئیمان ونـزور: ٦٦٥١ پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٣٧٣ = ٥٤٤٠ شـیحا (بخـاری رقـم الکتاب/٨٣ رقم الباب/٦).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زێڕی بۆ خۆی دروست کرد، کە لەپەنجەی دەکرد، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی، ئیتر خەڵکیش چاویان لەوکردو گەلێ کەسی تریش ئەنگوستیلەی زێڕیان دابەدروستکردن جا پێغەمبەر (د.خ) سەرکەوتە سەر دوانگەو ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی داکەندو، لەپاش سوپاسو ستایشکردنی خودای گەورە فەرمووی: (هەرچەندە من خۆم ئەم ئەنگوستیلەیەم دروست کردبوو لەزێڕ بۆ خۆمو لەکاتی لەدەستکردندا، نقێمەکەیم دەکردە بەری دەستم بەڵام ئەوا فڕێی دەدەم) وە ئەموستیلەکەی فڕێداو فەرمووی: (سوێندم بەخودا ئیتر قەت قەت ئەموستێلەی زێڕ لەدەست ناکەم).

ئەنجا هاوەڵانیش هەرکەسە لەلای خۆیەوە ئەنگوستێلە زێڕەکەی خۆیی فڕێدا. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٠٩، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**(١٢) باب لبس النبي ﴿ﷺ﴾ خاتماً من ورق نقشه: محمد رسول الله، ولبس الخلفاء له من بعده**

**پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە دەستدا بوو، نەخشی نقێمەکەی ئەم وشە پیرۆزە بوو: (محمد رسول الله) جێنشینەکانی لە پاش خۆی هەمان ئەنگوستیلەیان لە دەست کرد**

١٣٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، فَكَانَ فِى يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ فِى يَدِ أَبِى بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، ثُمَّ كَانَ فِى يَدِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، ثُمَّ كَانَ فِى يَدِ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، حَتَّى وَقَعَ

مِنْهُ فِى بِئْرِ أَرِيسٍ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ. {الحديث: ٥٤٤٣ = ٥٤٣٣ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٣، رقم: ١٩٠٢ = ٥٨٧٧، ٥٨٧٣. تحفة الأشراف: ٧٩٤٢} : [١٣٥٤]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی لەزیو دروست کرد، دەیکردە دەستی، هەتا خۆی مابوو، لەدەستی خۆیدا بوو، کەخۆی مرد، لەدەستی یەکەم جێنشینیدا بوو، کە ئەبوبەکری صەدیق بوو، کە ئەویش مرد، لەدەستی عومەری کوڕی خەطابدا بوو، کە جێنشینیی دووەمی بوو، کە ئەویش مرد، لەدەستی عوثمانی کوڕی عەففاندا بوو، کە جێنشینی سێیەم بوو، لەدەستی عوسماندا بوو، هەتا شەش ساڵ لە جێنشینییەکەی ڕۆیشت، ئەوسا کەوتە ناو بیری ئەریسەوە، ئیتر ڕەشەڕا هات، نەخشەکەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ) بوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٣، ٢٨١٤، ٢٨١٥، ٢٨١٦} .

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە، ئەم فەرموودەیەی تر لە تەجریدی بوخارییەوە، ژمارە (٥٨) بەرگی یەکەم ڕاگوێز دەکەین، بە پشتی خودا:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَتَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِتَابًا أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ فَقِيلَ لَهُ إِنَّهُمْ لَا يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلَّا مَخْتُومًا فَاتَّخَذ خَاتَمًا مِنْ فِضةٍ نَقْشُهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ ). (الحديث ٦٥ ـ أطرافه في: ٢٩٣٨، ٥٨٧٠، ٥٨٧٢، ٥٨٧٤، ٥٨٧٥، ٥٨٧٧، ٧١٦٢):

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نامەیەکی نووسی: یا ویستی نامە بنێرێ بۆ کیسراو قەیسەری ڕۆم و بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە، هەتا بانگیان بکا بۆسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام،

---

[١٣٥٤] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٠٢ = ٥٨٧٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٧٤ = ٥٤٤٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٥٠).

یـارانی عــەرزیان کــرد: هــەر نامــەیێ مــۆر نــەکرابێ ئەمانــە وەری نــاگرن، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بێ) ئەنگوسـتیلەیەکی زیـوینی دروسـت کرد، مۆری (محمد رسول الله) ی لێ هەڵکەنـد، هـەر نامەیـەکی دەنـارد بـۆ کەسـێ بـەو ئەنگوسـتیلەیێ مـۆری دەکـرد، ئەنـەس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: ئێستایش دەڵێ ی بریسکەی ئەو ئەنگوستیلەیە لەبەرچاومە کەلەپەنجە تووتەی دەستی چەپی پێغەمبەردا بوو.

## راڤەو شیکردنەوە:

١- ئەنگوستیلەی زیو بۆ پیاو سوننەتە.

٢- مۆرکردنی نامەو شتی وا سوننەتە.

٣- نووسینەوەی عیلمو زانستو ناردنی بۆ خەڵکی تـر لەموسـوڵمانو غـەیری موسوڵمان بەمەرجی خۆی دروستە.

٤ - نەخشی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سـێ دێـڕ بوو، دێڕی یەکەم (محمد) بوو، دێڕی دوەم (رسول) بوو، دێڕی سێیەم (الله) بـوو، لەخوارەوە دەخوێندرایەوە بۆسەرەوە ئاوا:

الله

رسول

محمد

٥- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) جاروبـار ئەنگوسـتیلەکەی دەکـردە پەنجـە تووتـەی دەسـتی چـەپی، جاروبـاریش دەیکـردە پەنجـە تووتـەی دەسـتی راستی، کەدەچوو بـۆ سـەراو دایدەکەنـد: (تـاج-٤ ل-١١٨ = تـاج-٣ ز-٣٥ ژ-٢٨٠٩ هـەتا ژمارە ٢٨٢١).

١٣٥٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَقَالَ: لِلنَّاسِ: «إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. فَلاَ يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ». {الحديث: ٥٤٤٥ = ٥٤٣٥ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٢، رقم: ١٩٠٢ = ٥٨٧٧، ٦٥ فتح الباري}:[(١٣٥٥)]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوینی دروست کردو وشەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)ی لێ نەخشاند، ئەوجا فەرمووی: (من ئەموستیلەیەکی زیوینم لەلای وەستا بۆ خۆم دروست کردووە، بەفەرمانی خۆم وەستاکە مۆری (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)ی لێ هەڵکەندووە، بەڵام نابێ کەسی تر چاو لەمن بکاو ئەم مۆرە لە ئەموستیلەی خۆی هەڵبکەنێ، تاکێشەی لەیەکچوون و ئیلتیباس دروست نەبێ و کەسانێ بەناوی منەوە نامە نەنووسن بۆ خەڵکانێ تر). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٣}.

---

(١٣٥٥) تجرید/٥، ژمارە: ١٩٠٢ = ٥٨٧٧ شیحا، مسلم: ٢٠٩٢ محمد فؤاد: پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٧٤ = ٥٤٤٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٥١).

## (١٣) باب في إتخاذ النَّبي ﴿ﷺ﴾ خاتماً لمَّا أرادَ أنْ يكْتُبَ إلى العَجَمِ

## پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ ویستی نامەو کاغەز بنووسێ بۆ گەورە پیاوانی گەلە ناعەرەبەکان ئەنگوستیلەیەکی دروست کرد بۆ مۆرکردن

١٣٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كَتَبَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) كِتَابًا – أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ – فَقِيلَ لَهُ إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلاَّ مَخْتُومًا . فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ نَقْشُهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ . كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ: [١٣٥٦]

بڕوانە ژمارە (١٣٥٤) کە کەمێ لەمەپێش ڕۆیشت، ژمارە (٥٨)ی تەجریدی بوخاری.

## (١٤) بابُ في طرْحِ الخَوَاتِمِ

## ئەموستیلە توڕدان

١٣٥٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فَكَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَصَنَعَ النَّاسُ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَنَزَعَهُ، فَقَالَ: «إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتِمَ، وَأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ»، فَرَمَى بِهِ، ثُمَّ قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا»، فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ. {الحديث: ٥٤٤٠ = ٥٤٣٠ فم. بخاري. أيمان ونذور: ٦٦٥١. نسائي. زينة: ٥٣٠٥. تحفة الأشراف: ٨٢٨١}: [١٣٥٧]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنگوستیلەیەکی زێڕی بۆ خۆی دروست کرد، کە

---

[١٣٥٦] تجريد/١، ژمارە: ٥٨ - ٦٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٧٦ = ٥٤٤٩ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٧).

[١٣٥٧] بخاری. أيمان ونزور: ٦٦٥١ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٧٣ = ٥٤٤٠ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٤٧).

لەپەنجەی دەکرد، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی، ئیتر خەڵکیش چاویان لەوکردو گەلێ کەسی تریش ئەنگوستیلەی زێڕیان دابەدروستکردن جا پێغەمبەر (د.خ) سەرکەوتە سەر دوانگەو ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی داکەندو، لەپاش سوپاسو ستایشکردنی خودای گەورە فەرمووی: (هەرچەندە من خۆم ئەم ئەنگوستیلەیەم دروست کردبوو لەزێڕ بۆ خۆمو لەکاتی لەدەستکردندا، نقێمەکەیم دەکردە بەری دەستم بەڵام ئەوا فڕێی دەدەم) وە ئەموستیلەکەی فڕێداو فەرمووی: (سوێندم بەخودا ئیتر قەت قەت ئەموستێلەی زێڕ لەدەست ناکەم).

ئەنجا هاوەڵانیش هەرکەسە لەلای خۆیەوە ئەنگوستێلە زێڕەکەی خۆیی فڕێدا. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٠٩، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي إِصْبَعِي هَذِهِ أَوْ هَذِهِ، قَالَ: فَأَوْمَأَ إِلَى الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِيهَا. {الحديث: ٥٤٦٠ = ٥٤٥٠ فم. بخاري. لباس: ٥٨٣٨ز أبو داود. خاتم: ٤٢٢٥. ترمذي. لباس: ١٧٨٦. نسائي. زينة: ٥٣٩١. ابن ماجه. لباس: ٣٦٤٨. تحفة الأشراف: ١٠٣١٨}:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێم نەدا کە ئەموستیلە بکەمە ئەم دوو پەنجەیەم: ئەمەو ئەمە، واتە: قامکی ناوەڕاستو پەنجەی دۆشاو مژە کەوا لەپاڵیا). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨١٩، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- ئەموستیلەی زێڕ بۆ نێرینە نادروستەو حەرامە.

٢- ئەموستیلەی زیو سوننەتە بۆ پیاو، وا سوننەتە سەنگەکەی نەگاتە مسقاڵێ، کاتێ دەیکاتە پەنجەی بیسمیللا بکا. زاناکان دەفەرموون: (التسمية على كل حال) واتە: حاڵی ذی بال.

٣- سوننەتە بۆ پیاوو بۆ ژن ئەنگوستیلە بکاتە پەنجە تووتەی دەستی چەپی، یا بیکاتە پەنجە تووتەی دەستی ڕاستی.

٤- بۆ پیاو ناباشە ئەموستیلە بکاتە پەنجەی ناوەڕاست، یا بیکاتە پەنجەی شایەتمانی، بەڵام کەراهەتی تەنزیهییە، نەوەك کەراهەتی تەحریمی.

٥- بۆ پیاو (بێجگە لەزێڕ) لەهەموو کانزایەکی تر ئەموستیلە دروستە، وەك: ستیلو ئەڵماسو شەوەو ئاسنو مسو وەرشاوو پلاتینو پۆڵاو زەردو زیوو برنجەو مەفرەقو کریستاڵو عاجو شتی تری وا، گەرچی باشتر وایە کەزیو بێ.

٦- دروستە پیاو چەند ئەموستیلەیێ لەدەست بکا، یا بیکاتە پەنجەکانی هەردوو دەستی، جگە لە پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی دۆشاو مژە، بەڵام وا باشە زیادە ڕەوی نەبێ.

٧- بۆ مێیینە ئەموستیلە لەزێڕو لەزیوو لەهەموو کانزایەکی تر دروستە، وە دروستە کە بیشیکاتە گشت پەنجەکانی، چی هی دەستی، چی هی پێی، دروستە بیکاتە هەر بیست پەنجەکانی.

٨- دروستە زەنگیانەو مووروو شتی وا، بهۆنرێتەوەو بکرێ بە ئەنوستیلەو بکرێتە پەنجە، بەمەرجێ بۆ پیاو نەبێ بەلاسکایی ژنانو زیان نەدا لە مرووەتی. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە:٤٧، لاپەڕە: ٢٩٨، ژمارە: ٢٨٩١ + ٢٨٩٢ + ٢٨٩٣ + ٢٨٩٤ + ٢٨٩٦}.

٩- سوننەتە نقێمی ئەنگوستیلە بکرێتە بەری دەست، بۆ پیاوو بۆ ژن، چونکە پەیڕەویی پێغەمبەری واتیادا، بەڵام دروستە نقێم بکرێتە پشتی دەستیش، بەبێ کەراهەتو ناباشی.

١٠- سوننەتە بۆ پیاوو بۆ ژن ناوی خۆی بکا بە مۆرو نەخشی ئەنگوستیلەکەی‌و لەکاتی نامە نووسین‌و شتی وادا بەوە مۆری بکا، یا کتێب‌و شتی خۆیی پێ دیاری‌و نیشانە بکات.

١١- دروستە لەسەر شێوەی پەسەند، کە ئەم جۆرە رستانە، یا واتاکەی یان، بەکوردی، یا بە فارسی، یا بەزمانێ تر، بکرێن بە نەخشی ئەموستیلە، وەك: (الحمد الله) و (اللهُ المَلِكُ) و (بالله) و (بسم الله) و (العزة للهِ) و (حسبی الله). {فتح الباری/لباس}.

١٢- واباشە هەر ئەموستیلەیێ، ناوی خودا، یا ناوی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران، یا ئایەتێ، یا هەر شتێکی تری پیرۆزی لێ هەڵ کەنرابێ، لەکاتی تارات گرتندا دابکەنرێ، لەکاتی بێنوێژیی‌و لەشپیسیدا لەدەست نەکرێ. {فتح الباری. رقم: ٥٨٧٧}.

١٣- دروستە بۆ پیاوو بۆ ژن چەند ئەموستیلەیێ لەدەست بکا، ومزیاتر لەیەك ئەموستیلەیش بکاتە یەك پەنجەی، هەرکەسەیان بەپێی مەرجی خۆی.

١٤- دروستە ئەمانە بکرێن بە نقێمی ئەنگوستیلە:

١- هەموو بەردە بەنرخەکان، وەك شەوەو ئاقیق‌و پیرۆزەو لاجیوەر دو شیلان‌و مرواری‌و مەرجان‌و مەڕ مەڕو مووررووە شینە.

٢- هەموو جۆرە مووررووو کانزایەکی تر دروستە بکرێن بە نقێم.

**تێبینی:**

**ئەم بڕیارانەم لە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیمو فەتحولباریو فەتحولوعین، باسی هەینیو موغنی موحتاج باسی هەینیو چەندین سەرچاوەی تر وەرگرتووە، هیچیانم لەخۆمەوە نەگوتووە، گەرچی لەزۆر لەم بڕیارانەدا ڕاجیایی زۆر هەیە، بەڵام ئەمەی من نووسیومە جێگەی متمانەیە.**

**دروستە کڕینو فرۆشتنو سەوداو مامەڵە بە ئەموستیلەوە بکرێ، با زێڕیش بێ، ئەڵقەیش هەر دادەنرێ بە ئەموستیلە، دروستە زەرەنگەرو ئەمانە ئەموستیلە، لەهەموو جۆرێ دروست بکەنو بیفرۆشن، شتی وا کارێ حەلاڵو پەسەندە. باوی جوانی ناو کۆمەڵ، کە لەشەرعا پێی دەگوترێ عورفی دروست، لەبابەتی ئەموستیلەدا رۆڵێکی کاریگەری هەیە بۆ چۆنێتی بڕیارەکەی!.**

### (١٩) باب إذا إنتَقَلَ فَلْيَبْدَأ بِاليَمِينِ وَ إذا خَلَعَ فَلْيَبْدَأ بَالشِمَالِ
### کاتێ مرۆڤ پێڵاو لە پێ دەکا، با لە پێشا بە پێی ڕاست دەست پێ بکا، کاتێ پێڵاو دادەکەنێ بە پێی چەپ دەست پێ بکا

١٣٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ لِتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ.(الحديث ٥٨٥٥): [١٣٥٨]

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: کاتێ کەپێڵاو لە پێدەکەن، لەپێشا بیکەنە پێی ڕاستتان، لەکاتی داکەندنیشا، لەپێشدا پێی چەپتان دابکەنن، واتە: بەپێچەوانەی**

**[١٣٥٨] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٠٠ = ٥٨٥٥ بخاری. مسلم: ٢٠٩٧، محمد فؤاد - پوختەی موسلیم: ١٣٨١ = ٥٤٦٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٣٩).**

لەپێکردنـەوە، بـاپێی راست لـەکاتی لەپێکردنـدا یەکـەم بـێو لـەکاتی داکەندنـدا دووەم بێ. (تاج/٤ ل/١٢٠).

لەژمارە (١٣٨١)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَـالَ: «إِذَا انْتَعَـلَ أَحَـدُكُمْ فَلْيَبْـدَأْ بِـالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَـعَ فَلْيَبْـدَأْ بِالـشِّمَالِ، وَلْيُنْعِلْهُمَـا جَمِيعًـا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًـا». {الحديث: ٥٤٦٢ = ٥٤٥٢ فـم. تجريـد/٥، لاپـەڕە: ١٩٢، رقـم: ١٩٠٠ = ٥٨٥٥ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٣٧٧}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کە پێڵاو لەپێ دەکەن لەپێشا بیکەنە پێی راسـتتان، لـەکاتی پـێڵاو داکەندنیـشدا، لەپێـشدا پێـی چـەپ داکـەنن، بەشـێوەی گشتیش یا هەردوو تاکی پێڵاو لەپێ بکەن، یان هەردوو تاکەکەی لـەپێ داکـەنن، لەبەر ناچاری نەبێ بەیەك تاك پێڵاوەوە مـەڕۆن). {تـاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمـارە: ٢٨٢٣، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٣٥٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَالَ: « لا يمش أحدُكُمْ في نعلٍ واحدةٍ، لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا». {الحديث: ٥٤٦٣ = ٥٤٥٣ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٠١ = ٥٨٥٦ فـتح البـاري. أبـو داود. لبـاس: ٤١٣٦. ترمذي. لباس: ١٧٧٤. تحفة الأشراف: ١٣٨٠٠}: [١٣٥٩]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەشـێوەی گـشتی، لەبـەر ناچـاری نـەبێ، بەیـەك تاك پێڵاوەوە مەڕۆن، یاهەردوو تاکەکەیان پێکەوە لەپێ بکەن‌و پێیانەوە بـڕۆن،

---

[١٣٥٩] تجرید/٥، ژمـارە: ١٩٠١ = ٥٨٥٦ بخاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٣٨١ب = ٥٤٦٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٤٠).

یا هەردوو تاکەکان پێکەوە دابکەنن‌و ئەوسا بڕۆن). {تاج/٣، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٨٢٣} .

## (٢٢) باب في إباحة الإستلقاء وَ وَضع إحدى الرجلَين علَى الأخرى
## لەسەر پشت راکشان‌و لاقنانە سەر لاق رەوابە

١٣٦٠- عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ: رَأَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُسْتَلْقِيًا فِى الْمَسْجِدِ، وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى. {الحديث: ٥٤٧١ = ٥٤٦١ فم. تجريد/١، رقم: ٢٩٠ = ٤٧٥، ٥٩٦٩، ٦٢٨٧} : [١٣٦٠]

عەببادی کوڕی تەمیم فەرمووی: مامەم عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا، لەسەر پشت راکشابوو، لاقی نابووە سەر لاقی). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧١٧، چ/٤} .

## (٢٣) باب النَّهي عَن التزعفر للرجَال

١٣٦١- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ. (الحديث ٥٨٤٦): [١٣٦١]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- رێگەی پیاوی نەئەدا، کەبەزەعفەران خۆی بۆنخۆش بکا، یا جل‌و لەشی خۆی پێ رەنگ بکا). (برِ: تاج/٤ ل/١٤٣ ز/٤٤ ژ/٤).

---

[١٣٦٠] تجريد/١، ژمارە: ٢٩٠ = ٤٧٥ پوختەی موسلیم: ١٣٥٧ - ٥٤٧١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٨ رقم الباب/٨٥).

[١٣٦١] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٩٨ - ٥٨٤٦. مسلم: ٢١٠١ - پوختەی موسلیم: ١٣٤٦ - ٥٤٧٤ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٣٢).

**روونکردنەوە:**

مەبەست لەم ئاماژانە کەدەیکەین بۆ ئەطرافو گێڕانەوەکانی تری فەرموودەکانو بۆ شوێنی ئەم فەرموودانە، لەریاض الصالحين و لەتاج الأصول داو، لەسەر چاوەکانی تردا، کار ئاسانیە بۆ پسپۆڕان و کەسانێ کە بیانەوێ، لەفەرموودەکان بەتەواوی حاڵی ببنو، بڕیارە شەرعییەکانیان لێ وەربگرنو، بەتایبەتی بۆ وەرگێڕانو وتار خوێنان و بەحس نووسانو لێکۆڵەرەوان، هەتا بتوانن بەئاسانی تەوفیق، یا جەمع، لەنێوانی گێڕانەوە جیاجیاکانا بکەن و بەهرەی تەواویان لێ وەربگرن. زۆر لەپسپۆڕان جەخت لەسەر ئەم لایەنە دەکەنو داوای ئەمە لەبەندە دەکەن، دەڵێن: چونکە کارئاسانییەکی زۆر باشی واتیادا، بەتایبەتی بۆ خوتبەو وتارو ئامۆژگاری و...تاد.

بۆنمونە: ئەوەتا بەپێی ئەم فەرموودەیەی ئێرە، بۆ پیاو، خۆڕەنگ کردنو خۆ بۆنخۆشکردن بە زەعفەران، کە گیایەکی بۆنخۆشە، گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە، ناباشە و نەیی لێ کراوە، کەچی بەپێی فەرموودەکەی تاجول ئوصوول پێغەمەر خۆی شتی وای کردووە، وە ئیبنو عومەر شتی وایکردووە. کەبەباشی لەبابەتەکە دەکۆڵینەوە دەبینین: هۆی ئەم هەمکە ڕاجیاییە، لەم مەسەلەیەدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم گێڕانەوە جیاجیایانە، وەهەروەها لەشوێنەکانی تریشدا، وە لەڕاستیشدا ئەم ڕاو بۆچوونو بڕیارە جیاجیایانە بۆ مەردوم بوونە سەرچاوەی کارئاسانی و بارسووکی، وە بەپێی پێویستو بارودۆخ و شوێن و کەس، سوودو بەهرەیان لێ وەردەگیرێ. وەك دەگوترێ: (إختلاف ڕەحمەتە).

## (٢٥) باب في مُخَالَفَةِ اليَهُودِ في الصَّبْغِ
## پێچەوانەی جوولەکەو گاور لە ڕەنگکردنو بۆیەکردنی مووی سەرو ڕیشدا

١٣٦٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ». {الحديث: ٥٤٧٧ = ٥٤٦٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٠٥ = ٥٨٩٩، ٣٤٦٢ = ١٣٨٠ تجريد + رياض/ ٤، لاپەڕە: ٧٩، زنجيره: ٢٩٣، ژماره: ٣/١٦٣٦}: [١٣٦٢]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جوولەکەو گاور مووی سەرو ریشی خۆیان بۆیە ناکەن، کەواتە: بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئێوە بۆیەیان بکەن). {تاج/٣، زنجيره: ٤٤، ژمارە: ٢٨٧٢، ج/٤}.

## (٢٦) باب لا تَدْخُلُ المَلائِكَةُ بَيتا فيه كَلْبُ ولا صورةٌ
## فریشتە ناچێتە ماڵێ سەگو وێنەی تیا بێ

١٣٦٣- حديث أَبَا طَلْحَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ « لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةُ تَمَاثِيلَ »: [١٣٦٣]

لەباتی ئەم فەرموودەیە، ژمارە (١٣٦٣)ی پوختەی موسلیم راگوێز دەکەین، کە سوودی زۆرە لەم بابەتەدا:

عَنْ مَيْمُونَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَصْبَحَ يَوْمًا وَاجِمًا، فَقَالَتْ مَيْمُونَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدِ اسْتَنْكَرْتُ هَيْئَتَكَ مُنْذُ الْيَوْمِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ

---

[١٣٦٢] تجريد/٥، ژمارە: ١٩٠٥ = ٥٨٩٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٤٨ = ٥٤٧٧ شیحا (بخاري رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٥٠).

[١٣٦٣] بخاری. بدو الخلق: ٣٢٢٥. مسلم: ٥٤٨١ شیحا. پوختەی موسلیم: ١٣٦٣ = ٥٤٨٠ شیحا (بخاري رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/٧).

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَلاَمْ كَانَ وَعَدَنِى أَنْ يَلْقَانِى فَلَمْ يَلْقَنِى أَمَ وَاللَّهِ مَا أَخْلَفَنِى». قَالَ: فَظَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمَهُ ذَلِكَ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ وَقَعَ فِى نَفْسِهِ جِرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ فُسْطَاطٍ لَنَا فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَنَضَحَ مَكَانَهُ، فَلَمَّا أَمْسَى لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَلاَمْ فَقَالَ لَهُ: «قَدْ كُنْتَ وَعَدْتَنِى أَنْ تَلْقَانِى الْبَارِحَةَ»، قَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنَّا لاَ نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ، فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمَئِذٍ فَأَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ حَتَّى إِنَّهُ يَأْمُرُ بِقَتْلِ كَلْبِ الْحَائِطِ الصَّغِيرِ، وَيَتْرُكُ كَلْبَ الْحَائِطِ الْكَبِيرِ. {الحديث: ٥٤٨٠ = ٥٤٧٠ فم}:

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەسەر هەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێت) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کش‌و مات بوو، وەك بیر لەشتێ بکاتەوە، منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دەتبینم ئەمڕۆ شێوەت ئاسایی نییە، خێرە وا راماوی؟ فەرمووی: (جوبرائیل (سڵاوی خودای لێ بێ) بەڵێنی داوە پێم کەبێت بۆ دێنیم، کەچی وانەهات، ئەدیی سوێندم بەخودای گەورە جوبرائیل قەت نەبووە لەگەڵ من بێ بەڵێن دەرچێ).

ئیتر ئەو ڕۆژە پێغەمبەر لەسەر ئەو حاڵە مایەوە، هەتا لەپڕێکا، لەژێر دەوارێکی خۆمانا، تووتەڵە سەگێکی چاو پێ کەوت، فەرمانی کرد، فڕەیان دایە دەرەوە، ئەوجا بەدەستی خۆی ئاوی پرژان لە جێگەکەی، کاتی ئێوارە جوبرائیل سەردانی پێغەمبەر دەکاو پێی دەفەرموێ: (تۆ دوێنێ بەڵێنت دا بەمن کە دێنیم بکەی، خێربوو وا دواکەوتیت؟). جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ وابوو، بەڵام ئێمەی فریشتە ناچینە ناو ماڵێ کە سەگ، یا وێنەی تیابێ). ئیتر هەر ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دا بەکوشتنی سەگ، تەنانەت فەرمانی دا کە سەگی باخی بچووك

بکوژرێ، بەڵام سەگی پاسی باخی گەورە نەکوژرێ، چونکە باخی بچووك بەبێ سەگیش دەپارێزرێ بە پێچەوانەی باخی گەورەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٩} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٥} + {زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٦}.

١٣٦٤- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ عَنْ أَبِي طَلْحَةَ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ»، قَالَ بُسْرٌ: ثُمَّ اشْتَكَى زَيْدٌ بَعْدُ فَعُدْنَاهُ، فَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ فِيهِ صُورَةٌ، قَالَ: فَقُلْتُ لِعُبَيْدِ اللَّهِ الْخَوْلاَنِيِّ رَبِيبِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَلَمْ يُخْبِرْنَا زَيْدٌ عَنِ الصُّوَرِ يَوْمَ الأَوَّلِ؟ ... فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ حِينَ قَالَ: «إِلاَّ رَقْمًا فِي ثَوْبٍ». {الحديث: ٥٤٨٤ = ٥٤٧٤ فم}: [١٣٦٤]

بوسری کوڕی سەعید، لەزەیدی کوڕی خالیدەوە لە ئەبو طەلحەی هاوەڵی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (فریشتە ناچنە ناو ماڵێ کە وێنەی تیابێ). بوسر فەرمووی: لەپاشا زەید نەخۆش کەوت، ئێمەش چووین بۆ سەردانی، کە تەماشامان کرد پەردەیێ گیراوەتەوە بە دەرگاکەیەوە، وێنەی پێوە بوو، منیش گوتم بە عوبەیدوڵڵای زڕ کوڕی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەی ئەو ڕۆژە زەید خۆی باسی خراپی وێنەی بۆ نەکردین، کەواتە ئەم وێنانە چییە بەم پەردەیەوە؟ عوبەیدوڵڵا فەرمووی: ئەی گوێت لێ نەبوو، کە لەکۆتایی فەرموودەکەدا فەرمووی: (مەگەر نەخشێ کە بەجل و بەرگەوە بێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٨}.

---

[١٣٦٤] بخاری. بدو الخلق: ٣٢٢٦. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٦٥ = ٥٤٨٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/٧).

**ڕوونکردنەوە:**

**١- بابەتێکی جوانم سەبارەت بەوێنە نووسیوە، لە تاجدا، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٣١٢، ژمارە: ٢٩٢٢، چاپی چوارەم. هەروا بڕوانە: تجرید/٣، لاپەڕە: ٣٠، ژمارە: ٩٥٥، چ/١.**

**٢- هەروا بابەتێکی کورتو پوختم، سەبارەت بەڕاگرتنی سەگ نووسیوە، لە تەجریدی بوخاریدا، بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٢١، ژمارە: ١٨٢٩ = ٥٤٨٠ فەتحولباری هەتا لاپەڕە: ١٢٣. تەماشاکردنی ئەم دوو بابەتە لە سوودو بەهرەو پاداش خاڵی نابێ.**

**١٣٦٥- حديث عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ سَفَرٍ وَقَدْ سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لِى عَلَى سَهْوَةٍ لِى فِيهَا تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَتَكَهُ وَقَالَ «أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ». قَالَتْ فَجَعَلْنَاهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ.[١٣٦٥]**

**عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، کولێنێکم هەبوو، پەردەم پیادابوو، پەردەکە وێنەی پێوەبوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی دی، دڕیو ڕەنگی گۆڕاو رووی گرژبوو، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەوانەی کە لەقیامەتا سزاو ئێشو ئازاریان لەهەموو کەس سەختترە، ئەوە ئەو کەسانەن کە دەیانەوێ لاسکایی خودا بکەنەوەو لەشێوەی دروستکراوەکانی ئەو دروست بکەن. عائیشە فەرمووی: ئیتر پەردەکەمان دادڕیو، سەرینێ، دوو سەرینمان لێی دروست کرد).**

**١٣٦٦- عَنْ عَائِشَةَ أم المؤمنين (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ عَلَى الْبَابِ فَلَمْ يَدْخُلْه، فَعَرَفَتُ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ فقلتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ مَاذَا أَذْنَبْتُ فقَالَ**

---

**[١٣٦٥] بخاری. لباس: ٥٩٥٤. مسلم: ٥٤٩٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٩١).**

رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَا بَالُ هَذِهِ النُّمْرُقَةِ) قلت: اشْتَرَيْتُهَا لِتَقْعُدَ عَلَيْهَا وَتَوَسَّدَهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُعَذَّبُونَ فَيُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ وَقَالَ إِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ الصُّوَرُ لا تَدْخُلُهُ الْمَلائِكَةُ). (الحديث ٢١٠٥ أطرافهُ في: ٣٢٢٤، ٥١٨١,٥٩٥٧، ٥٩٦١، ٧٥٥٧):[١٣٦٦]

عائيشه دايكى ئيمانداران (ڕەزاى خواى لىَ بىَ) فەرمووى: قاڵيچەيەكم كڕى، وێنەى پێوە بوو كاتێك پێغەمبەر(دروودى خواى لەسەر بىَ) تەشريفى هات بۆ لام، قاڵيچەكەى بينى ڕاخراوە، ئيتر نەهاتە ژوورەوە، لەبەر دەرگاكە ڕاوەستا، هەستم كرد كە زوويرى بەڕويەوە ديارە، لەبەر ئەوە عەرزم كرد: قوربان! ئەى پێغەمبەرى خودا! چى گوناهێكم كردوە كە تۆ وا لێم زوويرى، تەوبەى لىَ دەكەم لەسەردەستى خوداو لەسەر دەستى پێغەمبەرەكەيدا؟ پێغەمبەريش (دروودى خواى لەسەر بىَ) فەرمووى: (ئەم قاڵيچەيە چييە؟) عەرزم كرد كڕيومە بۆ تۆ هەتا لەسەرى دابنيشىو شانى لەسەر دادەيت! پێغەمبەر(دروودى خواى لەسەر بىَ) فەرمووى: (لەراستيدا خاوەنانى ئەم وێنانە لەرۆژى قيامەتدا، سزا دەدرێن، پێيان دەگوترىَ: لەسەر شێوەى تەعجيزو دەسەوسانكردن پێيان دەگوترىَ، ئەم دروستكراوانەى خۆتان زيندووبكەنەوە) پێغەمبەر(دروودى خواى لەسەر بىَ) فەرموشى: (هەر ماڵىَ وێنەى تيادابىَ فريشتەى ڕەحمت ناچنە ناوى). (تاج/٤/١٥٩ز —٥٠ هەتا كۆتايى).

[١٣٦٦] تجريد/٣، ژمارە: ٩٥٥ - ٢١٠ بخارى. مسلم: ١٥٣٢، محمد فؤاد - ٥٤٩٩ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٤٠).

**ڕوونكردنەوە:**

**باسێكی بەسوودم نووسیوە لەسەر بابەتی وێنە بەگشتی، لەتاجا لەبەرگی چوارا لەلاپەڕە سەدو شەستو چوارا، جاوا لێرە بۆ تەواوكاری ئەو باسە دەڵێم (پێش هەموو شتێ بڕوانە زنجیرە/ ٣٠٥ بەتەواوی لەبەرگی چوارەمی ریاض دا) :**

**١- كڕینو فرۆشتنی وێنەو شتێ وێنەی پێوە بێ، وەك پارچە كوتاڵو بەڕەو قاڵیو بەتانیو دەرگاو شتی تری وا، دادەمەزرێ بەڵام ناباشە. (بڕوانە: فتح/٤/٣٢٥).**

**٢- بەڕای هەموو خاوەن ویژدانێ، هەتا ئەم ساتەش زیانی وێنە لەئایینو لەڕەوشتی بەرز، لەهەموو شتێكی تر زیاترە، ئەو بەدڕەوشتیە ئەمڕۆ سیدی بڵاوی دەكاتەوە بەشەیتانیش ناكرێ.**

**٣- راستە كە ئەمڕۆ وێنە بووە بەبەشێكی سەرەكی لەڕەوڕەوەی پێشكەوتن لەڕوی زانستیو هونەریو پزیشكیو تەكنۆلۆژییەوە، بەبێ هونەری وێنە، بەهەموو جۆرەكانیەوە، پێشكەوتنی پیشەسازیو زانستیو هونەریو راگەیاندنو سەفەر بۆ ناو بۆشایی ئاسمان ئەستەم دەبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وێنە بووە بەشەیتانی عەصر، بووە بەمیكرۆبی بێ رەوشتی بووە بەهەوێنی داڕووخانی خێزانیو مایەی بەر بەرەڵاییو سەرچاوەی تێكبەربوونی نێرو مێی بێ سنوور، لەبەر ئەوە بەبۆچوونی بەندە هەموو جۆرە وێنەیێ، بەم چەند مەرجە حەرام دەبێ ئەگەر:**

**أ- بەمەبەستی لاسكایی خەلقی خودا بێو بۆ چاولێكریی بێ لەكاری خوا.**

**ب- بۆ پەرستنو بەگەورە زانینو تەئلیهو تەخلید بێ، وەك لەكۆندا بەزۆری وێنەو پەیكەر بۆ ئەم دوو مەبەستە بوون، ئێستاش هاكا وای لێ هاتەوە!**

**ج- بۆ برەودان بە بەربەرەڵاییو بێ ڕەوشتیو بێ دینیو گەندەڵی كۆمەڵ بێ.**

٤- زۆر لەزانایانی شەرع دەفەرموون: (هەر وێنەیێ لەسەر شێوەیێ بێ کە لەسەر ئەو شێوەیە خاوەنەکەی نەژی، وەك مرۆڤێ سەربڕاوبێ یا لەناوەڕاستا دووکەرت کرابێ، یانیوەی لەشی گیاندارەکە بێ یا تەنها سەری بێ، حەرام نییەو موباحە).

٥- هەروا زۆر لەزانایانی شەرع دەفەرموون: (هەر وێنەیێ بۆژەکرابێ واتە مومتەهەن بێ، وەك لەژێر پێدا راخرابێ، یابەدیواری ئاودەستەوە بێ، یابەشێوەیەکی بۆژەکراوی تر دانرابێ، یاهەڵواسرابێ حەرام نییە!) ، عەللامەی عەینی لە عومدەتول قاری شەرحی صەحیحی بوخاریدا لەبەرگی یازدەدا لاپەڕە سەدو بیستو چواردا بەدەق دەفەرموێ: (قال الطحاوي: فلمّا ابيحَتْ التّماثيلُ بَعدَ قَطعَ رؤسِها الذي لو قُطِعَ منْ ذي الرّوحِ لم يَبقَ، دلّ ذلك على إباحةِ تَصوير ما لا روح لهَ، وعلى خروجِ ما لا روحَ لمثلِهِ منَ الصّورِ، ممّا قد نُهيَ عنْهُ في الآثارِ....) وقال أيضاً: (... وقال الخطّابيّ:.. فأمّا ما ليس بحرام من كلبِ الصّيدِ والزّرعِ، والماشيَةِ والصّورَةِ التي تُمتَهَنُ في البِساطِ والوِسادةِ، وغيرهما فلا يمنَعُ دخولَ الملائِكَةِ بسَبَبِهِ، وأشار القاضي إلى نحوِ ما قالَ الخطّابي....).

٦- دانانو هەڵواسینی وێنەو هەڵگرتنی بۆ یادگارو شتی وا، ئەگەر ناتەواوبێ، یاجەستەدارنەبێ بەتایبەتی ئەگەر لەسەر شێوەیێ بێ، کە خاوەنەکەی لەسەر ئەو شێوەیە نەژی ئەوە حەرام نییە.

٧- **کورتو پوخت:** (هەر وێنەیێ خزمەتی دینو دونیای موسوڵمانان بکا لەسەر رای پسپۆڕانی ئیمانداری دڵسۆزی ئیسلام دروستەو حەرام نیە).

٨- بڕوانە ریاض الصالحین بەرگی دووەم بەکوردی ژمارە /٥٧٧ لاپەڕە: ١٣٥.

١٣٦٧- عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللّٰه عَنْهمَا أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إنَّ الَّذِينَ يَصْنَعُونَ هَذِهِ الصُّوَرَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ.(الحديث ٥٩٥١ طرفه في: ٧٥٥٨): [١٣٦٧]

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لیٚ بیٚ- فەرمووی: پیٚغەمەر -دروودی خوای لەسەر بیٚ- دەفەرمویٚ: ئەوانەی کەئەم ویٚنانە دروست دەکەن، لەرۆژی قیامەتا لەسەر ئەو تاوانە سزاو ئازار ئەدریٚن، وەبەتەوسەوە، بۆتەعجیزو دەسەو سانکردن پیٚیان دەگوتریٚ: ئادەی ئەگەر راست ئەکەن‌و درۆناکەن گیان بکەن بەبەر ئەم گیانلەبەرانەدا کەویٚنەکانتان دروست کردون. (بڕ: تاج/٤ ل/١٥٩ ز/٥٠ باسی ویٚنە نادروستەو مەنعی فریشتە ئەکا) + (ریاض/٤ ز/٣٠٥ ل/١٠٩ ژ/١/١٦٧٨).

١٣٦٨- حديث عَبْدَ اللّٰهِ بن مسعودقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: «إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذَابًا عِنْدَ اللّٰهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ»: [١٣٦٨]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: لە خۆشەویستم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بیٚ): (لەڕۆژی دوا رۆژدا، لەلای خودای گەورەو سەروەر، سەختترین سزاو ئیٚش‌و ئازارو ئەشکەنجە بۆ ویٚنەکیٚشانە).

١٣٦٩- عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبَّاسٍ إِنِّي إِنْسَانٌ إِنَّمَا مَعِيشَتِي مِنْ صَنْعَةِ يَدِي وَإِنِّي أَصْنَعُ هَذِهِ التَّصَاوِيرَ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لا أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: سَمِعْتُهُ

---

[١٣٦٧] تجريد/٥، ژمارە: ١٩١٢ = ٥٩٥١ بخاری. مسلم: ٥٥٠١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٨٩).

[١٣٦٨] بخاری. لباس: ٥٩٥٠ مسلم: ٥٥٠٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٨٩).

يَقُولُ: (مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فَإِنَّ اللَّهَ مُعَذِّبُهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا أَبَدًا) فَرَبَا الرَّجُلُ رَبْوَةً شَدِيدَةً وَاصْفَرَّ وَجْهُهُ فَقَالَ وَيْحَكَ إِنْ أَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تَصْنَعَ فَعَلَيْكَ بِهَذَا الشَّجَرِ كُلِّ شَيْءٍ لَيْسَ فِيهِ رُوحٌ). (الحديث ٢٢٢٥، أطرافُهُ في: ٥٩٦٣، ٧٠٤٢)؛ (١٣٦٩)

لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێکی وێنەکێش هاتە خزمەتی، عەرزی کرد: قوربان! من مرۆڤێکم، بەرهەمی دەستی خۆم دەژیم، من ئەم وێنانە دەکێشم، ئایا تۆ ڕەوایان دەبینی یان نا؟ ئەویش پێی فەرموو: وەرە پێشەوە ئەوجا ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: بۆ خۆم چیم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) بیستووە، ئەوەت پێ دەڵێم، بیستم لە پێغەمبەر دەیفەرموو: (هەرکەسێ وێنەیێ دروست بکا، خودا لەقیامەتا لەسەر ئەوە سزای دەدا، پێی دەگوترێ: ئەم ئێش و ئازارەت بەردەوام دەبێ، هەتا گیان دەکەی بەبەر ئەم وێنەیەدا کە دروستت کردووە، قەت قەتیش ناتوانێ گیان بکات بەبەریدا) ئیتر کابرا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو ڕاچەنی و زەرد هەڵگەڕا.

ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: هاوار لەخۆت! خۆ ئەگەر هەر چارت نییەو ئەم ئیشە هەر دەکەیت ئەوا وێنەی دارو درەخت و شتی بێ گیان و ئەم جۆرە شتانە دروست بکە،کە بێ گیانن و گیان لەبەر نین.(تاج/٤ز- ٥٠ل١٦١ فـ٥).

---

(١٣٦٩) تجرید/٣، ژمارە: ٩٩٤ = ٢٢٢٥ مسلم: ٢١١٠، محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٦٩ = ٥٥٠٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٤ رقم الباب/١٠٤).

**روونكردنەوە:**

**لەبەرگی چواری تاجول ئوصولی پیرۆزدا باسێكی باشم لەسەر وێنەگرتن، بەعەرەبی‌و بەكوردی لە لاپەڕە ١٦٤ تا ١٦٦ نووسیوە، موتاڵاكردنی بێ سوود نییە، ژمارە (٣) ی تەرجەمەكەی هەڵەیەكی گەورەی واتیادا، راستەكەی ئاوایە، ٣- دانان‌و هەڵواسینی وێنە ئەگەر تەواو نەبێ‌و، لەسەر شێوەیەكی وا بێ كە خاوەنەكەی لەسەر ئەو شێوەیە نەژی، ئەوە حەرام نییە، بەڵام یارۆچكەی منالان‌و بارستەدار(مجسَّم) یش بێ قەیناكا، تەواویش بێ قەیناكا.**

**لەژمارە (١٣٦٩)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:**

**عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي رَجُلٌ أُصَوِّرُ هَذِهِ الصُّوَرَ فَأَفْتِنِي فِيهَا، فَقَالَ لَهُ: ادْنُ مِنِّي، فَدَنَا مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: ادْنُ مِنِّي، فَدَنَا حَتَّى وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ، وَقَالَ: أُنَبِّئُكَ بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «كُلُّ مُصَوِّرٍ فِي النَّارِ، يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا فَتُعَذِّبُهُ فِي جَهَنَّمَ»، وَقَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَاصْنَعِ الشَّجَرَ وَمَا لاَ نَفْسَ لَهُ. {الحديث: ٥٥٠٦ = ٥٤٩٦. تجريد/٣، لاپەڕە: ٦٤، رقم: ٩٩٤ = ٢٢٢٥، ٥٩٦٣، ٧٠٤٢}:**

**سەعیدی كوڕی ئەبولحەسەن (رەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ هاتە خزمەتی ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) عەرزیكرد: قوربان! من وێنە كێشم، ئەم وێنانە دەكێشم، ئایا تۆ رەوایان دەبینی؟ ئەویش پێی فەرموو: لێم وەرە پێشەوە، پیاوەكەش چووە پێشەوە بۆلای، فەرمووی: وەرە پێشتریش، پیاوەكەش چووە پێشتر، ئینجا ئیبنو عەبباس دەستی دانا لەسەر سەری‌و فەرمووی: چیم بیستووە ئەوەت پێ دەڵێم: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەموو وێنەگرێ لە ئاگری دۆزەخدا**

دەبێ، هەریەکێ لەو وێنانەی کە لە جیهاندا دروستی کردوون، دەیکەن بەکەسێو دەیکەن بە کوڵکیەوە، لەناو دۆزەخدا ئەشکەنجەو ئازاری دەدا).

ئیبنو عەبباس پێی فەرموو: خۆ ئەگەر هەرچارت نییەو ئەم ئیشە هەردەکەیت، بۆ دابینکردنی گوزەرانت، ئەوا وێنەی دارو درەختو ئەم بابەتانە بگرە، کەبێ گیانن‌و گیانیان لەبەردا نییە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٧، ج/٤} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٠}.

١٣٧٠- عَنْ أَبِي زُرْعَةَ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي دَارِ مَرْوَانَ فَرَأَى فِيهَا تَصَاوِيرَ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ خَلْقًا كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً». {الحديث: ٥٥٠٩ = ٥٥٠٠ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٩٨، رقم: ١٩١٣ = ٥٩٥٣، ٧٥٥٩ فتح الباري}: [١٣٧٠]

ئەبو زورعە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) چووم بۆ ماڵی مەڕوانی کوڕی حەکەم، کاتێ فەرمانڕەوای مەدینە بوو، ئەبو هورەیرە لەوێ چەند وێنەیەکی نەخشاوی بەدیوارێکەوە بینی، فەرمووی: بیستم لەحەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێ کەدەچێ دروستکراوێ دروست دەکا، وەك دروستکراوانی من، ئەگەر ئەوان راست ئەکەن‌و درۆ ناکەن فەرموون با مێرووچەیێ دروست بکەن، یا گەردیلەیێ دروست بکەن، یا دەنکە جۆیێ دروست بکەن). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢٩١٤، ج/٤} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٥، ژمارە: ١٦٨٣}.

---

[١٣٧٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٩١٣ = ٥٩٥٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٧٠ - ٥٥٠٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٧ رقم الباب/٩٠).

لأهمية هذا البحث في يومنا هذا ننقل مايلي:

١- قال مؤلف التاج الجامع للأصول (رضوان الله عليه) في شرحه على التاج: فيه (أي في قوله إلا رقما في ثوب) جواز رقم الحيوان في الثوب، ويقاس عليه الصورة الفوتوغرافية (أي الصورة الشمسية أو التصوير الشمسي) إذا كانت لحاجةٍ وقال (رحمة الله تعالى عليه) وحاصل ما في المقام أن تصوير الحيوان حرام ولو نقشا ولو عضوا منه لأنه مضاهاة لخلق الله تعالى بخلاف تصوير غير الحيوان فلا شئ فيه، أما الإقتناء ففيه تفصيل، إن كانت الصورة مجسمة كاملة فهي حرام وإن كانت ناقصةً بحالٍ لا تعيش بها فلا، وإن كانت نقشاً فجائزة مع الكراهية، وهذا كلهُ في غير لعبة الأطفال أما هي فجائزة ولو مجسمة كاملة.

٢- وأقول (أنا المترجم) إن ما تعارف عليه الناس اليوم من مثل السفور والتبرج وإقتناء الصور الخلاعية الماجنة وتعاطى وارتياد الملاهى والمسارح ودور السينما والأماكن الغير المحتشمة والربا والقمار والخمور ومصافحة المرأة مع الرجل واختلائهما وإنتشار أنواع الحيل والدجل بين الكسبة أهل السوق إن كل هذا وغيره مما تعارف عليه الناس فيما بينهم وتعودوه وطبعوا عليه لدرجةٍ ينكر على من ينكر عليهم، إنَّ كُلَّ هذا لا تأثير له في تغيير حكم التحريم الثابت في الشريعة بالكتاب والسنة، لأن الإجماع على الباطل ليس في شئٍ من الإجماع الشرعى، وأقول: (وبالله تعالى تَوْفِقِى، وَعليه تَوَكُّلِى، وَرِضَاهُ غَايَتِنى، وَخدمة البِلاَدِ وَالعِبَادِ بُغْيَتِى وَنُغْيَتِى) لَيْسَ كما يدعي الماديون والد هريون والزنادقة أن كل ما كان فيه مصلحة البشر فهو شرعهم وقانونهم الطبيعي ولا التفات إلى ما سواه، إذ قال الله تعالى موضحا الغاية السامية من خلق الإنسان: وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون (٥١/٥٦)، وقال العلماء (رضوان الله تعالى عليهم وجعلنا بكرمه ومنه من خدام تراب أقدامهم): إن الأصلح لِلْعَبْدِ ليس بواجب على الله، أقول: (وأعوذ باللهِ من أن أكون قائل زورٍ أو ناشر

باطلٍ) إن المتتبع اليقظ الفهم يلاحظ بحق: أنه كلما أسرف في حظ الجسد كان على حساب حظ الروح والعكس صبح كلا وجزءً، فعليه أستنتج مما تقدم في هذا المبحث ما يلي:

أ- اجتنب أيها المسلم ما استطعت من الصور والتصوير، فالمسلم التقي الورع الصالح الحاذق يتقي دوما مواضع التهم ويحاذر أن ينزلق في المزالق.

ب – لا بأس بالإستفادة الشرعية والقانونية من استخدام الصور الشمسية في المسائل الإدارية والفنية والعلمية والطبية الصرفة البحتة، ومنها ما يثبت على الهويات والأسناد، ومنها ما يطبع على الرقوق الشعاعية المختلفة الأنواع ولمختلف الأعراض الدنوية من علمية وطبية وجمالية، وليس منها بأي حال من الأحوال الأفلام السينمائية والتلفزيونية الحالية، لأنها دعوة صارخة إلى تَأْلِيهِ الهوى وإلى العرى والتعري وإلقاء حجاب الحشمة وهتك ستر الحياء ورمي الكلام على عواهنه وخلط الحلال بالحرام، والله العظيم إنني لأحمد الله واشكره على حلمه وصبره كيف لا يأمر السماء أن تقع على الأرض، وذلك عندما أشاهد ما تنشره تلك الدور الداعرة من أنواع الدعارة والميوعة والمجونة، أخي القارئ الكريم، لقد طال البحث، ولكن الأمر كما تعلم يستوجب ذلك، وحيث إن الغاية هي الإفادة الدينية ونفع الإسلام وأهله وهي حاصلةٌ بالنص العربي وبغية إختصار المطلوب نكتفي من ترجمته بما يلي:

١- ڕەسمو وێنەگرتنی گیاندار حەرامەو ناڕەوایە، چونکە لاسکایی کاری خودایە، ئەمە لە پیاوی لە خودا ترسی باش ناوەشێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر قەبارەو بارستایی هەبێ.

٢- ڕەسمو وێنەگرتنی هەموو شتێ (گیانلەبەری لێ دەرچێ) دروستەو هیچی تیا بەستە نیە، ئەگەر چی موسوڵمان چەندە دەتوانێ خۆی بپارێزێ باشترە.

٣- دانـانو هەڵواسـینی وێنـە ئەگـەر تـەواوو جەسـتەدار نـەبێو لەسـەر شێوەیەکی وابێ کـە خاوەنەکـەی لەسـەر ئـەو شـێوەیە نـەژی ئـەوە حـەرام نیـەو دروستە، بەڵام یارۆچکەی منالان بارستەداریش بێ قەیناکا، واتـە موجەسـەمیش بێ قەیناکا، تەواویش بێ قەیناکا.

٤- وێنــەی موعامــەلاتی ڕەسمــی لەبــەر ناچـاری قەیـدی نیـە، وێنــەی یادگاریش بەربەندی ژمارە سێی ئەم تەرجەمەیە دەکەوێ.

٥- هـەر وێنـەیێ لەسـەر هـەر شـێوەیێ بـێ، وەهـی هـەر چ شـتێ بـێ بـە مـەرجێ ببـێ بـەهۆی خراپـەو ببـێ بـە هـەوێنی بـێ وێڵیو بـە مایـەی پیـسیو پۆخڵی کۆمەڵو سەربکێشێ بۆ دوورکەوتنەوە لە ڕەمزای خوداو پیاو بێ ئاگا بکا لە تاعەتی خودا ئەوە حەرامە.

٦- کورتو پوخت بە کورتی پەتی (هەر وێنەیێ سودی ڕەوای ئایینی، یان ژیانی مرۆڤی تیادا بێ ڕەوایە، دەنا نا).

(وەرگێڕ)

## (٢٨) باب كَرَاهَةِ قِلَادَةِ الوَتَرِ في رقبةِ البَعِيرِ
## ناباشی ملیوانکەی ژێ کەوان لە ملی وشتردا

١٣٧١- عنْ أَبِي بَشِيرٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فِـي بَعْـضِ أَسْـفَارِهِ وَالنَّـاسُ فِـي مَبِيـتِهِمْ فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَسُولاً: (أَنْ لا يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَـةِ بَعِـيرٍ قِـلادَةٌ مِنْ وَتَرٍ أَوْ قِلادَةٌ إِلاَّ قُطِعَتْ) (الحديث٣٠٠٥)؛ [١٣٧١]

---

[١٣٧١] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٣٠ = ٣٠٠٥ بخاری. مسلم: ٢١١٥ تـرقیم الـشیخ محمـد فـؤاد - پوختـەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٨٩ = ٥٥١٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/١٣٩).

ئەبوبەشیری ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین خەڵکەکە شوێنی شەویان گرتبوو، کەمێ بڵاو بوو بوونەوە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رابەرێکی نارد بۆلایان، کەپێیان رابگەیەنێ: کە هەر وشترێ ملیوانکەی ژێی کەوانی لەمل دایە، یاخود هەر ملیوانکەیەکی دیکەی لەگەردندایە، بیپچڕێننەوەو لەملی دابکەنن!) (تاج/٨/ل/٩٥ز-٢٩ف-١).

هۆی ئەم نەهیە وەك شێخی عەینی دەفەرموێ: ژێی کەوان زۆر قایمە لەبەر ئەوە هەندێ کێشە دروست دەکا، وەك:

١- هەندێ کەس هەندێ شت دەکەنە ملی وڵاخ بەنیازی چاوەزار.

٢- شەرع فەرمانیان پێ دەکا بەپچڕاندنی چونکە ئەو جۆرە شتانە نابن بەچاوەزار لەبەر ئەوە زیانیان هەیە نەوەك قازانج، وەك لەبینیان توند دەبێ‌و دەیان خنکێنێ یا دەگیرێ لەقەڵبەیەك‌و دەبێتە هۆی خنکاندنی ئاژەڵەکە. بەڵام چاوەزار بەناوە جوانەکانی خواو بەصیفاتەکانی‌و بەئایاتی قورئان دروستە (بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: ١٠٠٦ ی تەجریدی بوخاری) وەئەوە بەر ئەم نەهیە ناکەوێ بەڵام شتی وایش دەبێ بەشێوەیەکی شایان بەوڵاخ‌و ئاژەڵەکەدا هەڵواسرێ، وەك ئەوە بەبەنێکی ناقایم بکرێتە ملی، یا بەجل‌و کورتان‌و سەرکەللەو زین‌و سەرزینی وڵاخەکەدا دادوورێ یا لەشوێنێکی شایانا لەتەویلەو وپشتیرو جێگەی ئاژەڵەکە دابنرێ. شەرع رێگەی شتی‌وا دەدا، چونکە بناغەی شەرع لەسەر ئاسانکاری‌و بەرژەوەندی بەندەکانە.

ئەبوبەشیری ئەنصاری هاوڕێی پێغەمبەرە، لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەردا کەسێکی تر نییە بەم ناوە، بەڵام هەیانە کە کەسناو (کونیە) ی ئەبو بەشیر بێ، وەك: بەراء پێشی دەگوترێ: ئەبوبەشیر.

ئەبوبەشیر لەپاش رووداوی ئەل حەررە مردووە (بڕوانە: ژمارە: ١٢١٣ لەتەجریدی بوخاری) ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەق بووە، دەڵێن: تەمەن درێژ بووە.

## (٣٠) باب جواز وَسْمِ الحَيْوَانِ غيرِ الآدمي في غيرِ الوَجهِ، وَنَدْبُهُ في نعم الزَّكَاةِ والجزية

## داخكردنی گیانلەبەر، جگە لە ئادەمیزاد، بە مەبەستی نیشانە کردن، دروستە، بگرە لە ئاژەڵی زەکاتو سەرانەدا سوننەتە

١٣٧٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا وَلَدَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ قَالَتْ لِي: يَا أَنَسُ: انْظُرْ هَذَا الْغُلاَمَ فَلاَ يُصِيبَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَنِّكُهُ، قَالَ: فَغَدَوْتُ فَإِذَا هُوَ فِي الْحَائِطِ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ جَوْنِيَّةٌ وَهُوَ يَسِمُ الظَّهْرَ الَّذِي قَدِمَ عَلَيْهِ فِي الْفَتْحِ. {الحديث: ٥٥٢٠ = ٥٥١٠ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٢٥ = ١٣٠١، ٥٤٧٠، ٥٨٢٤}: [١٣٧٢]

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی مناڵی ئەبو تەلحە نەخۆش بوو، کە ئەبو تەلحە لەماڵ دەرچوو، کوڕە نەخۆشەکەی کە دایك برای من بوو مرد، کە ئەبو تەلحە دێتەوە بەدایکی کوڕە مردووەکە دەڵێ: کوڕەکەم چۆنە؟ ئوم سولەیمیش کە هەم دایکی منو هەم دایکی مناڵە مردووەکە بوو، پێی دەفەرموێت: لەگشت کاتێ خامۆشترە، زۆر بێدەنگە، تەرمی مناڵە مردووەکەش لە قوژبنێکی ماڵەکەدا دادەنێت، ئینجا شێو دادەنێ بۆ ئەبو تەلحەو شێودەکا، شەویش خۆی نەختێك بۆی دەڕازێنێتەوەو لەگەڵیا دروست دەبێت، کە ڕۆژ دەبێتەوە ئەبو تەلحە خۆی دەشۆرێتو کاتێك دەیەوێت لەماڵ

---

[١٣٧٢] تجريد/٢، ژمارە: ٦٢٥ = ١٣٠١ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٩٥ = ٥٥٢٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٢٢).

دەرچێت، ژنەکەی پێی دەڵێت: منداڵەکە مردووە، دەی بیسپێرن بە خاك‌و بڕۆن بینێژن! جا ئەو بەیانییە ئەبو تەلحە نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ لەگەڵ پێغەمبەردا دەکات‌و، سەر گوزەشتەی خۆی‌و ژنەکەی‌و منداڵەکەیانی عەرزدەکات‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (ئایا ئەم شەو پێکەوە دروست بوون؟) دەڵێ: بەڵێ. دەفەرموێ: (خودا پیرۆزی بکا لێتان!).

دوایی ئوم سولەیم کوڕێکی بوو، ئەبو تەلحە کە زڕبابم بوو پێی فەرمووم: ئادەی ئەنەس! براکەت هەڵبگرەو بیبە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەچەند دەنکێ خورماشی لەگەڵدا نارد، کە منداڵەکەم برد بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هیچت هێناوە لەگەڵی، کە مەلاشووی منداڵەکەی پێ شیرین بکەم؟) گوتم: بەڵێ چەند قلێ خورمام هێناوە، جا خورماکەی وەرگرت‌و لەدەمیدا جوویی‌و دوایی لەدەمی خۆی دەریهێناو خورما جووراوەکەی نایە ناودەمی منداڵەکەو مەلاشووی پێ هەنوو، وەناوی نا: عەبدوڵلا). ئیبنو عویەینە دەیفەرموو: پیاوێکی ئەنصاری دەیگوت: بەچاوی خۆم نۆ منالی ئەم عەبدوڵلایەی کە دایك برای ئیمامی ئەنەس بوو دیوە، وە هەرنۆیان قورئان خوێن بوون لە بەرەکەتی دووعاکەی پێغەمبەرەوە کە بەدایك‌و باوکی فەرموو بوو، خودا بەرەکەت بخاتە ئەم شەوەتانەوە!). {بڕوانە: ژمارە: ١٤٠١ لەدواوە}.

ئەمە پوختەی ئەم چیرۆکەیە لە (مختصر صحيح البخاري)دا، بۆ روونکردنەوەی گێڕانەوەکەی ئێرە راگوێزم کرد، لێرە ئەم پترییەی هەیە، بەسەر باسەکەوە، کە لەئاخری فەرموودەکەدا دەفەرموێ: (ئوم سولەیمی دایکم کە منداڵەکەی بوو، فەرمووی پێم: ئەی ئەنەس! ئاگات لێ بێ پێش ئەوەی کە ئەم منداڵە گۆش بکرێ، یا شتێ بچێتە دیوی دەروونی، بەیانی زوو بیبە بۆ خزمەتی

پێغەمبەری خودا، هەتا بەشیرینی مەلاشووی چەور بکاو ناوی بنێ، ئەنەس دەفەرموێ: منیش وامکرد، دایکم چی فەرموو، جێبەجێم کرد، کە منالەکەم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو پەچەیەکا بوو، لەناو باخە خورمایەکا، عابایەکی خەتداری رەشباوی جەونییانەی لەبەردا بوو، ئەلقە داخێکی بەدەستەوە بوو، ئەو حوشترانەی بە ئەلقە داخەکە نیشانە دەکرد، کەهی زەکات بوون، لەسەردەمی ئازادکردن (فەتح)ی مەککەدا هێنرابوون بۆی!. {تاج/٥، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٥٤٠٥} .

## ( پوختەی فەرموودەکانی ئەم نامەیە )

١- ئاورێشم بۆ پیاو دروست نییە، تەنانەت نابێ بیکا بە پەردەی پەنجەرەو سەرزین‌و کفن‌و قەمچی‌و بەنی هۆنینەوەی تەزبیح‌و بەرماڵ‌و کلاش.

٢- دروستە بۆ پیاو مامەڵەو سەودای ئاورێشم بکاو بیکڕێ‌و بیفرۆشێ، یا کرمی ئاوریشم بەخێو بکاو لیکەکەی بکا بە ئاورێشم‌و بیڕێسێ‌و بیچنێ‌و هەموو پارچەیەکی لێ دروست بکا، چونکە ئەوەی کە بۆ پیاو حەرامە تەنیا لەبەر کردنەکەیەتی، زێڕیش وەك ئاورێشم وایە بۆ پیاو لەهەموو روویەکەوە، وە پیاو دەتوانێ لەبەر ناچاری ئاورێشم بپۆشی، یا سوود لە زێڕ وەربگرێ، وەك کیفی ددان.

٣- ئاورێشم‌و زێڕ بەرەهایی، بەبێ قەیدو مەرج بۆ ژن دروستە.

٤- قژو موو بۆیەکردن، بڕیاری تایبەتی هەیە.

٥- هەموو جۆرە رایەخ‌و پێخەفێ دروستە، بەمەرجێ هی پیاو ئاورێشم نەبێ، بەمەرجێ بۆ فیزو دەعیە نەبن.

٦- خۆپاراستن لە وێنەو پەیکەر، مەگەر لەبەر ناچاری.

٧- باسی ئەموستیلە بەتێرو تەسەلی.

٨- پێڵاو تازۆربێ کەمە، بەتایبەت بۆ ڕێبوار.

٩- بارۆکەو قژ خستنە سەر قژو خاڵکوتانو ددان شاشکردنو موو هەڵگرتنو ریشتاشینی ژنو بۆیەکردنی قژو مووی سەرو ریش، چ بۆ پیاو چ بۆ ژن، ئەمانە هەموو، بڕیارەکەیان دەخولێتەوە لەنێوانی ئەم دوو مەبەستەدا:

١/ ئەگەر بۆ چارەسەری کێشەیەکی جەستەیی، یان دەروونی، یان کۆمەڵایەتی بێ، ئەوە دروستە لەلای زۆرینەی زانایان، تەنانەت هەندێ کات سوننەتیشن.

٢/ بەڵام ئەگەر بۆ بەرەڵاییو تەفرە دانی خەڵكو دەسکاریی کاری خودابێو هیچ مەبەستێکی ڕەوای شەرعی نەبێ، ئەوە بەپێی شوێن یا حەرامە، یا مەکرووهە.

١٠- ئاژەڵ داخکردن بۆ نیشانە، بەمەرجی خۆی دروستە.

## (٣١) باب كَرَاهَةِ القَزَعِ

١٣٧٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ الْقَزَعِ، قَالَ: قُلْتُ لِنَافِعٍ: وَمَا الْقَزَعُ؟ قَالَ: يُحْلَقُ بَعْضُ رَأْسِ الصَّبِيِّ وَيُتْرَكُ بَعْضٌ. {الحديث: ٥٥٢٤ = ٥٥١٥ فم. تجريد/٥/١٩٦، رقم: ١٩٠٨ = ٥٩٢٠، ٥٩٢١ فتح الباري}: [١٣٧٣]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لە قۆچکە تاش. ڕاوی دەفەرموێ: عەرزی نافیعم کرد، کە ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە: قۆچکە تاش

---

[١٣٧٣] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٠٨ = ٥٩٢٠ مسلم: ٢١٢٠ ترقيم الشيخ محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٨٢ = ٥٥٢٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٧٢).

چـۆنه؟ فـهرمووی: ئـهوهتانێ کهسـهری منـاڵ ههنـدێکی بتاشـرێو ههنـدێکی نهتاشـرێو قژهکـهی بهێڵرێتـهوه، وهك ئـهوه: لهپێـشه سـهریو لهلاجانـهکانی دهتاشرێو ئهوی تری ناتاشرێ دهگرێ بـه گودیلـه. {تـاج/٣، زنجیره: ٤٣، ژمـاره: ٢٨٦٨ + ریاض/٤، زنجیره: ٢٩٥، ژماره: ١٦٣٨، ١٦٣٩} .

ئهمـهیش دهقـی ژمـاره (١٩٠٨)ی تهجریـدی بوخارییـه، لـه بـهرگی پێنجهمدا، لهبهرئهوهی بههرهی پترِی واتیادا، دهینووسین:

عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللَّه عَنْهمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّـهِ صَـلّى اللّـه عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ يَنْهَى عَنِ الْقَزَعِ قَالَ: الراوي: القَزَعُ، إذا حُلِقَ الصَّبِيُّ، وتُرِكَ هَاهُنَا شَـعَرَةٌ، وَ هَاهُنَـا، وَهَاهُنَا، فَأَشَارَ إِلَى نَاصِيَتِهِ وَجَانِبَيْ رَأْسِهِ.(الحديث ٥٩٢٠ طرفه في: ٥٩٢١):

ئیبنو عومهر -ڕهزای خوادایان لێ بێ- فهرمووی: لهپێغهمهرم ژنهوت، نههی دهکرد لهقوچکه تاش، گێڕهرهوه دهفهرموێ: کاتێ سهری منـاڵ دهتاشرێ، لهپێشه سـهری و لهههـردوو لاجـانگی، هـهنێکی دهتاشـرێ، و هـهنێکی ناتاشـرێ. (تـاج/٤ ل/١٤١ ژ/٦) + (ریاض/٤ ل/٨١ ز/٢٩٥ ژ/١٦٣٨، ١٦٣٩).

**ڕوونکردنهوه:**

مهبهست لهم فهرمووده پیرۆزهیه ئهوهیه کهموسوڵمان لهههموو شـتێکا ئاسایی بێ، شتێ کهلهگهڵ زهوقی سهلیمو سروشتی پاکی مرۆڤدا ڕێك نهکـهوێو دابنرێ بهڕیز پهڕو یاساو ڕێسا بهزێن، لێی دووربێو، پێشهنگ نهبێ لهداهێنانی خووی ناشیرینو ڕهفتاری ناههموارا، دهنا بـههیچ شـێوهیێ مهبهسـت ئـهوه نییـه کهچهشـنه دابو نـهریتی تایبـهتی بـهناوی ئایینـهوه بـسهپێنرێ بهسـهر خهڵکهکهدا، عورفی صهحیح و خووی شیرینی ناو کۆمهڵ ئایین پهسهندی دهکـا،

ئیتر لەهەر وڵاتێ چی باوبێ، لەبارەی جلو بەرگو قژ پەروەردەکردنو شتی واوە، شەرع رێگەی پێدەدا، بەمەرجێ دژی شەرعی خوداو سروشتی پاکی مرۆڤ نەبێ (مَارَآهُ الُمسْلَمُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ: هەرچی موسوڵمانان بەجوانی بزانن لای خواش جوانە).

## (٣٢) باب النهي عن الجلوس في الطرُوقات وَ إعطاءِ الطرِيقِ حَقَهُ

## رێگریی لە دانیشتنی سەر رێگەوبان، پێویستە رێگەوبان مافی خۆی بدرێتێ

١٣٧٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقَاتِ) فَقَالُوا: مَا لَنَا بُدٌّ إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا، قَالَ: (فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلاَّ الْمَجَالِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا) قَالُوا: وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ؟ قَالَ: (غَضُّ الْبَصَرِ وَكَفُّ الأَذَى وَرَدُّ السَّلاَمِ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيٌ عَنْ الْمُنْكَرِ) (الحديث ٢٤٦٥، طرفُهُ في: ٦٢٢٩).

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەکەن لەسەر رێگەوبان دابنیشن) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چارمان نییە، جێگەی ترمان نییە، کەلێی دابنیشینو دەمە تەقێی لێ بکەین، ئەوێ نەبێ. فەرمووی: (کەوای لێ هات، مافی رێگەوبان بەجێ بهێنن) گوتیان: قوربان! ئایا مافی رێگەوبان چییە؟ فەرمووی: (چاوی خۆتان بگرنو تەماشای نامووسو نەنگی خەڵکی پێ مەکەنو ئەگەر شتێکتان بەرچاو کەوت چاوپۆشی لێ بکەنو ئازاری کەس مەدەنو مەبن بەئێشو ئازار بۆ رێبوار، وەڵامی سڵاو بدەنەوەو رێگەی باش نیشانی خەڵك بدەنو جڵەو گیریی لەخراپە بکەن).(ریاض/١ل-١٧٥ف-١٩٠ز-٢٣-الأمر بالمعروف و...).

## (٣٣) باب تحريم فعلِ الوَاصلَة والمستَوْصِلَهُ والوَاشِمَة وَالمستَوْشِمَة وَالنَامصَة والمُتَنَمِصَة والمُفلجَاتِ والمُغيرات خَلق الله

## جڵەوگیریو نادروستی ژنێ قژ بداتە دەم قژی خۆیو کۆمەڵێ کاری ناشایستەی تر، وەك ددان تەنكو شاشكردن بۆ جوانی، كە شتی وا دەستكاری كاری خودایە

١٣٧٥- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ لِي ابْنَةً عُرَيِّسًا، أَصَابَتْهَا حَصْبَةٌ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا أَفَأَصِلُهُ؟ فَقَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ». {الحديث: ٥٥٣٠ = ٥٥٢١ فم. بخاري. لباس: ٥٩٣٥، ٥٩٣٦، ٥٩٤١. نسائي. زينة: ٥٢٥٠، ٥١٠٩. ابن ماجة. نكاح: ١٩٨٨. تحفة الأشراف: ١٥٧٤٧}: [١٣٧٥]

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کچێکم هەیە دەچێ بە بووکی، ئاوڵەی گرتووە قژە سەرەکەی رووتاوەتەوە، مێردەکەی دەیەوێ بیگوێزێتەوە، جا ئایا ڕێگەم دەدەی کە قژی تر بدەمە دەم قژەکەی بۆ کاتی گواستنەوەکەی؟ فەرمووی: (نەء، نابێ، لەعنەتو نەفرەتی خودا لەو ژنەبێ کەقژ دەداتە دەم قژی تر بۆ ژنێکی ترو لەو ژنەیش بێ کە دەیەوێ قژی تر بداتە دەم قژی خۆی). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٦، ژمارە: ١٦٤٢}.

---

[١٣٧٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٠٨ = ٥٩٢٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٨٢ = ٥٥٢٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٨٥).

١٣٧٦- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ زَوَّجَتِ ابْنَتَهَا فَتَمَعَّطَ شَعَرُ رَأْسِهَا ، فَجَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ ، فَقَالَتْ إِنَّ زَوْجَهَا أَمَرَنِي أَنْ أَصِلَ فِي شَعَرِهَا . فَقَالَ « لاَ إِنَّهُ قَدْ لُعِنَ الْمُوصِلاَتُ »: [١٣٧٦]

بڕوانه ژماره (١٣٨٣).

١٣٧٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالنَّامِصَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالَ: لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ وَكَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرآنَ، فَأَتَتْهُ، فَقَالَتْ: مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَمَا لِيَ لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟! فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَا وَجَدْتُهُ، فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا)، فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: فَإِنِّي أَرَى شَيْئًا مِنْ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الآنَ! قَالَ: اذْهَبِي فَانْظُرِي، قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، فَقَالَ: أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكِ لَمْ نُجَامِعْهَا. {الحديث: ٥٥٣٨ = ٥٥٢٩ فم. بخاري. تفسير: ٤٨٨٦، ٤٨٨٧، ٥٩٣٩، ٥٩٤٣، ٥٩٤٤، ٥٩٤٨. أبو داود. ترجل: ٤١٦٩. ترمذي. أدب: ٢٧٨٢. نسائي. زينة: ٥١١٤، ٥٢٦٧. تحفة الأشراف/ ٩٤٥٠} : [١٣٧٧]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەعنەتو نەفرینی خودای گەورە لەژنی خاڵکوت بێو، لەو ژنانەیش بێ کە بەئارەزووی

---

[١٣٧٦] بڕوانه ژماره: (١٣٨٣) (بخاری رقم الکتاب/٦٧ رقم الباب/٩٤).

[١٣٧٧] بخاری. تفسیر: ٤٨٨٦ پوختەی موسلیم/٤، ژماره: ١٣٨٦ = ٥٥٣٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٥٩).

خۆیان خاڵیان بۆ دەکوتن‌و، لەژنانی دەموچاو هەڵگرو، لەو ژنانەیش بێ کە دەموچاوی خۆیان هەڵدەگرن‌و لەو ژنانەیش بێ کە بەبڕبەندو زبرەو شتی وا ددانی خۆیان باریك‌و تەنك‌و شاش دەکەن، بۆ جوانی، چونکە ئەمانە بەم دەستکاری‌و دەست تێوەردانەی خۆیان، دەستکاری ئیشی خودا دەکەن‌و، نەخش‌و نیگارو رەنگو ڕێسی خودا تێك دەدەن‌و دەگۆڕن. جا کاتێ ئەم قسەیەی ئیبنو مەسعوود گەیشتەوە بەدایکی یەعقوب، کە ژنێکی قورئان خوێن بوو، ناسراو بوو بە ئوم یەعقوب، وە لە خێڵی بەنی ئەسەد بوو، چوو بۆلای‌و لەم لایەنەوە قسەی لەگەڵدا کرد، ئیبنو مەسعوود لەوەڵاما فەرمووی: (کەسانێ کە پێغەمبەری خودا خۆی لەعنەت‌و نەفرینیان لێ بکا، من چۆن لەعنەت‌و نەفرینیان لێ ناکەم؟! وە سەرەڕای ئەوەیش ئەمە لەنامەی خودادا هەیە، جا ژنەکە فەرمووی: من سەرجەم قورئانم خوێندۆتەوە شتی وام تیادا نەدیوە، فەرمووی: ئەگەر بتخوێندبایە دەیتدی، ئەدی ئەوە نییە کە خودای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ:

{وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا} . واتە ئەوەی کە پێغەمبەر دەیدا بەئێوە لە ماڵ‌و لە بڕیارو حوکمی شەرعی‌و روون کردنەوەی شەرعی خودا، وەری بگرن‌و ئەوەیش کە نەهی لە کردنی دەکا مەیکەن‌و وازی لێ بهێنن — ٧/٥٩).

ژنەکەش کە هیچی بۆ نەمایەوە گوتی: لەو باوەڕەدام کە ئێستا ژنەکەی خۆت، لە ماڵەوە هەندێ شت لەم شتانە دەکا. عەبدوڵلاش فەرمووی: دەبچۆ تەماشای بکە، ئەویش چوو بۆلای ژنەکەی ئیبنو مەسعوودو تەماشای کردو هیچی نەدی لەوەی کە گوتی‌و هاتەوە گوتی: هیچم نەبینی!

عەبدوڵلایش فەرمووی: دیارە ئەگەر شتی وا بکا لەگەڵ مندا گوزەران ناکات). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢٨٨٣} .

**روونکردنەوە:**

هەرکارێکی خراپ، کە موسوڵمان دەیکا، کە خوا، لە قورئانا، یا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە سوننەتدا، لەعنەتی لێ دەکا، گریمان ئەگەر کفر نەبێ، گوناهی گەورەیە، واتە: کە بیرەیە.

**روونکردنەوە:**

١- خاڵ کوتان حەرامو نادروستە چی بۆ پیاو، چی بۆ ژن، چی بۆ گەورە، چی بۆ پچووك، خاڵ کوتو خاڵ بۆ کوتراو، ئەگەر بەڕەزای خۆی بوو، وە رەسیدە بوو، هەردوولا گوناهبارنو گوناهی گەورە (کەبیرە)یان کردووە.

٢- لای شافیعییەکان جێگەکەی پیسە، ئەگەر دەتوانرا لابرێ، ئەگەر نەدەتوانرا، یا دەبوو بەهۆی ناشیرینی، چاو پۆشی لێ دەکرێ. لای حەنەفییەکان دەفەرموون: جێگەی خاڵ غوسڵی دەردەچێو دەستنوێژی دادەمەزرێ، بالأیش نەبرێ دروستە.

٣- مەبەست لەم دەموچاو هەڵگرتنە ئەوەیە، کەژن، یا پیاو مووی دەموچاوی ئاسایی بێ، کەچی دەچێ زیاد لەپێویست بە کشتەكو بە مووکێشو بە مێوو شتی تری وەهایی، مووی خۆی هەڵ دەگرێو خۆی لووسو پووس دەکاو برۆی خۆی دەسکاری دەکاو تەواو باریکی دەکا.

نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەڵام ئەگەر ژن ریشی بۆ دەرچوو، یا سمێڵی بۆ ڕوا، یا مووی زیاد بە بەرچەناگەیەوە بوو، ئەوە واباشە کە ئەو مووە لابەرێ، وە دەموچاوی خۆی ئاسایی بکا). {بڕوانە: ژمارە: ١٣٨٥، بڕگەی ژمارە: ٦ لەپێشەوە}.

٤- ددان شاشکردنیش هەروەها، ئەگینا ڕێکخستنی ددانی ناڕێك و لابردنی کەلێنی نێوانی ددانەکان لەلای پزیشك، ئەوە کاری دروستەو بەر ئەم بابەتە ناکەوێ.

١٣٧٨- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) عَامَ حَجَّ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعَرٍ كَانَتْ فِي يَدِ حَرَسِيٍّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، وَيَقُولُ: «إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ». {الحديث: ٥٥٤٣ = ٥٥٣٤ فم. بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٦٨، ٥٩٣٢. أبو داود. ترجل: ٤١٦٧. ترمذي. أدب: ٢٧٨١. نسائي. زينة: ٥٢٦٠. تحفة/ ١١٤٠٧}: [١٣٧٨]

حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەوساڵە کە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودای گەورە لەهەموویان بێ) حەجی کرد، لەسەر دوانگەکەی مزگەوتەکەی پێغەمبەر لەمەدینە، گوڵێ مووی لە پاسەوانێ وەرگرت و گرتی بەدەستیەوەو گوێم لێ بوو وتارێکی خوێندەوەو لەڕووی بێزاری و گلەییەوە فەرمووی: زاناکانتان لەکوێن، چۆن شتی وا ناڕەوا ڕوودەداو ئەوان دەنگ ناکەن و بێزاری لێ دەرنابڕن، من بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە (دروودی خوای لەسەر بێ) کەڕێگەی شتی وای نەداوەو دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (نەوەی ئیسرائیل ئەوکاتە سەریان تیاچوو کە ژنەکانیان فێری ئەم جۆرە شتانە بوون). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٩٦، ژمارە: ١٦٤٣}.

---

[١٣٧٨] بخاری. أحاديث الأنبياء: ٣٤٦٨ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٨٥ = ٥٥٣٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).

**ڕوونكردنەوە:**

١- قژدانە دەم قژ لەم كاتانەدا نادروستەو حەرامە:

أ/ قژە لكاوەكە هی ئادەمیزاد بێ، چی هی پیاوبێ، چی هی ژن بێ، چی هی زیندوو بێ، چی هی مردوو بێ.

ب/ مووە، یا خورییە لكاوەكە هی ئاژەڵێكی مردارەوەبوو بێ و سەرنەبڕابێ و لەپاش مردارەوە بوون لێی كرابێتەوە.

ج/موو وخوری و تووكی گیانداری بێ كە گۆشتی نەخورێ، ئیتر لەپێش مردارەوە بوونیدا، یا لەپاش مردارەوە بوونی ئەو كوڵك و مووەی لێ كرابێتەوە جیاوازی نییە چونكە پیسەو حەرامە.

٢- مووی پاك، كەهی مرۆڤ نەبێ، قسەی دروست ئەوەیە كە دروستە، بەتایبەتی ئەگەر مێرد ڕەزای لەسەر بێ، هەروا خوری.

٣- بەهەموو شتێكی تری پاك دروستە، وەك خەیاتەی ئاورێشم و هەندێ گیای تایبەت، كە بۆ جوانی و ڕازانەوە بێ و بۆ تەفرەو هەڵخەڵەتان نەبێ، تەنانەت لەهەندێ كاتا كارێكی باشە، كەببێ بەهۆی شاردنەوەی نەنگ، وەك كەچەڵی و صەلع و سەر ڕووتاوەیی، كە دادەنرێن بەدوو عەیب و نەنگی كۆمەڵایەتی و مرۆڤ بەسروشت حەزناكا كە خەڵك بەو نەنگە بزانێ و دروستە كە بیانشارێتەوە.

٤- بێگومان، ئەوەی كە لەم سەردەمەدا، پێی دەگوترێ (زرع الشعر: چاندنی موو) بۆسەر یابۆ ڕیش یا برۆ كارێ ڕەوایەو دروستەو بەشێكە لە (عملیە التجمیل - نەشتەرگەری جوانكاری) وە ئەمە لەم بابەتە نییە.

٥- بەكۆی دەنگی زانایان، لەهەموو بارو دۆخێكا، دروست نییە بۆ ژن، كە مووی خۆیی (مەحرەم)ی خۆی بۆ پەیوەندیكردن بەمووی خۆیەوە، یا بۆ چاندن

بەکار بهێنێ، چی هی دایكو خوشكو کچی بێ، وە چی هی باوكو کوڕو برای بێ، چونکە خۆشی وەرگرتن لەلایەنی مێردەوە لەشتی وا کارێ زۆر ناڕەوایەو ئەوپەڕی نامەردیو بەرەڵاییە.

٦- دروستە بۆ ژنو بۆ پیاوو بۆ کوڕو بۆ کچ، بۆ گەورەو بۆ بچووك، مووی سەرو ریشو سمێڵو ئەبرۆو بنباڵو بەر، بەپێی شەرع رێك بخا، ئایا بەتاشین بێ، یا بەکورتکردنەوە بێ، یا بە لابردنو هەڵکەندن بێ، وە هەروەها هەرموویێ بۆ ژن، یا بۆ پیاو کێشەیەکی جەستەیی، یا کۆمەڵایەتی، یا ئازارێ دروست بکا چارەسەرکردنی دروستە، وەك مووی لووتو مووی گوێو مووی پووزو لاقو باڵو باسكو سینگ، بەتایبەتی بۆژنی مێرددار، وەك مووی دەوری کۆمو مووی پێشی ئافرەت، ئیتر بەتاشین بێ، یا بەدەرمان بێ، یا بە هەڵکەندن بێ، یا بەهەڵپاچین بێ. بەڵام سەرتاشین بۆ ژن کەراهەتی هەیە، مەگەر لەبەر نەخۆشیو کاری پێویست بێ (مغني محتاج/٤. ص٢٩٧ خاتمەی باسی عقیقە).

مووی ئەو شوێنانە کە دروستە کەسانی تریش تەماشایان بکەن وەك مووی سەرو ریشو سمێڵو برۆو گوێچکەو لووت بۆ پیاو، دروستە کەخۆی لایبەرێ، یا کەسێ تر لایبەرێ، بەڵام ئەو شوێنانەی کە دروست نییە کەسێ تر تەماشای بکا دەبێ خۆی لایبەرێ، یا هاوسەری، یا کەسێکی خۆیی کەبۆی دروست بێ تەماشای ئەو شوێنە بکا، واباشە ئەگەر خۆی کردی لەپێشا بەدەستی راستی مووی ئەو شوێنانە لابەرێ کە بەدەستی راست دەکرێ، ئەوجا دەستی چەپی بەکاربێنێ بۆ شوێنەکانی تری. {بڕوانە: فتح الباری. فەرموودەی ژمارە: ٥٨٨٩ - لباس. باب: قصُ الشارب} + {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢٨٨٦، ج/٤ - چاپی چوارەم}.

هەندێ لەزانایان بە پێچەوانەی جەماوەری زانایانەوە دەڵێن: قژدانە دەم قژو لکانی قژ بەسەرو بە قژەوە، لەسەر شێوەی بارۆکەو هەر شێوەیەکی تریش بێ، بەبێ قەیدو مەرج دروستە، بەقژی مرۆڤ بەهی گیانداری تر، بە ئاورێشم‌و بەگیا، بۆ هەموو کەسێ دروستە، ئەم زاتانەیش وەك ئیبنو عەبباس‌و ئوم سەلەمەو عائیشە کە هەردوکیان هاوسەری پێغەمبەرن!!

## (٣٥) بابُ النهي عن التزوير في اللباس وغيره والتَّشَبُّعْ بِمَا لَم يُعْطَ
## باسی ڕێگرتن لە جل‌و بەگی ساختەو لە ساختەکاری لە هەموو شتێکاو باسی کەسی بە درۆ بە شتێکەوە نبازێ

١٣٧٩- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: إِنَّ لِي ضَرَّةً فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ أَتَشَبَّعَ مِنْ مَالِ زَوْجِي بِمَا لَمْ يُعْطِنِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلاَبِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ». {الحديث: ٥٥٤٨ = ٥٥٣٩ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧٨ = ٥٢١٩ فتح الباري} : [(١٣٧٩)]

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من هەوێبارم، ئەگەر بەڕواڵەت خۆم هەڵکێشم‌و خۆم وانیشان بدەم کە مێردەکەم تێرو پڕم دەکاو ئەوەو ئەوەم لەگەڵ دەکا، لەراستیشدا شتەکە وانەبێ ئەوە چۆنە؟ ئایا گوناهم دەگا یانا؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوەی لافو گەزافی وا لێبداو بەشتێکەوە بنازێ کەنەیبێ، ئەوە

---

[(١٣٧٩)] تجريد/٥، ژمارە: ١٣٨٧ = ٥٥٤٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٨٧ = ٥٥٣٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٠٦).

گورگه لەپێستی مەڕداو ساختەکارە لە بەرگی پیاو چاکا). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٦ ج/٤}.

## ٣٨- كِتَابُ الأَدَبِ
## نامەی ئەدەبو ویلّو ڕوناکبیری

{بڕوانـە: پوختـەی موسـلیم = مختـصر صـحیح مـسلم، بـەرگی/٤ پـێش ژمارە: ١٣٩٦ نامەی ژمارە: ٤٠ + تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٤٢٥ چاپی چوارەم، زنجیرە: ٢٦ هەتا زنجیرە: ٨٦، لاپەڕە: ٥٢١ لـە ژمـارە: (٥٢٥٨)ەوە هەتا ژمارە: ٥٤٨٠}.

### (١) بابُ النَّهي عَنِ التكَنّي بِأبِي القَاسِمِ وبيان مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الأَسْمَاءِ
### باسی فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناوی من بکەن بەناو بۆ خۆتان، بەلاّم کەسناوەکەم کە - ئەبول قاسمە - مەکەن بە کەسناو بۆ خۆتان، خۆشەویسترین ناو لەلای خودای گەورە

١٣٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَادَى رَجُلٌ رَجُلاً بِالْبَقِيعِ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، إِنَّمَا دَعَوْتُ فُلاَنًا، فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي». {الحـديث: ٥٥٥١ = ٥٥٤٢ فـم. تجريـد = مختـصر صـحيح البخـاري/٣ بالكوردي رقم: ١٢٦٢ = ٣١١٥، ٣١١٤، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦}: (١٣٨٠)

---

(١٣٨٠) تجريـد/٣، ژمـارە: ١٢٦٢ = ٣١١٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم٤/ ژمـارە: ١٣٩٦ = ٥٥٥١ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٤٩).

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە بەقیع، کە گۆڕستانێکە وا لەپاڵ مزگەوتەکەی پێغەمبەرا کەوا لەشاری مەدینە، پیاوێ بانگی پیاوێکی تری کرد، گوتی: ئەی ئەبولقاسم! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی لێ دایەوە، وایزانی کە بانگی ئەو دەکا، پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەگەڵ تۆم نەبوو، بانگی ئەو پیاوەی ترم کرد، بانگی تۆم نەکرد، بەویش هەر دەڵێن: ئەبولقاسم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ناوی من بکەن بەناوی خۆتانو بەناو بۆ کەسوکاروماڵو منالتان، بەلام کەسناوەکەم کە ئەبولقاسمە، مەکەن بەکەسناو بۆ خۆتان). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٥٣٩٥ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەوی دەفەرموێ: قازی دەفەرموێ: جەماوەری زانایان دەفەرموون، ئەم بڕیارە تایبەت بووە بەسەردەمی ژیانی پێغەمبەرەوە لەدوا فەوتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەموو کەسێ دروستە کەخۆی ناوبنێ ئەبولقاسم، بۆ خەڵکی تریش دروستە پێی بڵێن ئەبولقاسم، ئیتر ئەو کەسە ناوی موحەممەدو ئەحمەد بێ، یاناوێ تری هەبێ، جیاوازی نییە.

١٣٨١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلامٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ فَقَالَتْ الأَنْصَارُ لا نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلا نُنْعِمُكَ عَيْنًا فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ لِي غُلامٌ فَسَمَّيْتُهُ الْقَاسِمَ فَقَالَتْ الأَنْصَارُ لا نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلا نُنْعِمُكَ عَيْنًا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَتْ الأَنْصَارُ سَمُّوا

بِاسْمِي وَلا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ) (الحديث ٣١١٥، أطرافُهُ في: ٣١١٤، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦):[١٣٨١]

جابیری کوڕی عەبدوللا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری کوڕێکی بوو ناوی نا قاسم، یاران پێیان فەرموو: نەپێت دەڵێین ئەبولقاسم‌و نەبەم کەسناوە (نەبەم کونیەیە) چاوو دڵت ڕۆشن دەکەینەوە (چونکە ئەبولقاسم کەسناوی پێغەمبەرەو هەر قابیل بەخۆیەتی). پیاوەکەش چوو بۆ لای پێغەمبەرو ئەمەی بۆ باس کرد، فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : (ئافەریم بۆ ئەنصار! ناوی من کە محمدو ئەحمەد و...ناوەکانی ترمە، بکەن بەناو بۆ خۆتان، بۆ منداڵ‌و کەس‌و کارتان، بەڵام کەسناوەکەم -کە ئەبولقاسمە- مەکەن بەکەسناو بۆ خۆتان، لەراستیدا من قاسمم —واتە: پشك دابەش کارم — لەناوتاندا، بەڵام بەشەکە خۆی کەمە، یا زۆرە، بەدەستی خوایە، بەدەستی من نییە) (تاج/١٠ل١٥٥ز-٦٢ — کونیەو کەسناوی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە: (١٣٩٧)ی پوختەی موسلیمە، کەمێ جیاوازی هەیە:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ مُحَمَّدًا، فَقَالَ لَهُ قَوْمُهُ: لاَ نَدَعُكَ تُسَمِّي بِاسْمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَانْطَلَقَ بِابْنِهِ حَامِلَهُ عَلَى ظَهْرِهِ، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ لِي غُلاَمٌ فَسَمَّيْتُهُ مُحَمَّدًا فَقَالَ لِي قَوْمِي: لاَ نَدَعُكَ تُسَمِّي بِاسْمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلاَ

---

[١٣٨١] تجرید/٣، ژمارە: ١٣٦٢ = ٣١١٥ بخاری. مسلم: ٢١٣٣ = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٩٧ - ٥٥٥٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٧ رقم الباب/٧).

يَبْلُغُ مِنَ الإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا ». (الحديث ٢٠٣٥، أطرافه ٢٠٣٨، ٢٠٣٩، ٣١٠١، ٣٢٨١، ٦٢١٩، ٧١٧١): [١٤٠٤]

صەفییەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ فەرمووی: جارێ پێغەمبەر لەدەی دوایی ڕەمەزان دا لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا شەوێ چووم بۆ سەردانی، تاوێ لەخزمەتی دا مامەوەو قسەو گوفتوگۆم لەگەڵ کردو هەڵسام بچمەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵما هات تا ڕەوانەم بکات وەماڵی صەفییە لەو خانووەدا بوو، کەلەوە دوا بوو بەهی ئوسامەی کوڕی زەید، صەفیە فەرمووی: ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەو دەرگایەی مزگەوت کەوا لەلای دەرگای ماڵی ئوممو سەلەمەدا، جا لەو کاتەدا دوو پیاو لەیاریدەدەران (ئەنصار) لەوێوە ڕەت بوون کاتێ کە پێغەمبەریان دی لەگەڵ من دا بوو سڵاویان لێ کردو پێیان هەلگرتو ویستیان بەپەلە تێ پەڕن، ئەویش پێی فەرموون: پەلەمەکەنو مەپەشۆکێن ئەمە صەفییەی کچی حویەییە کەژنی خۆمە، ئەوانیش گوتیان سوبحانەڵلا! ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە چۆن دڵ لەتۆ پیس دەکەین! وە قسەکەی پێغەمبەریان بەلاوە گران بوو، کە بۆنی ئەوەی لێ دەهات، خوانەخواستە گومانی خراپ بە پێغەمبەر بەرن.

فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئاخر شەیتان لەناو جەستەی مرۆڤدا وەکوو خوێن هاتوو چۆ دەکات، لەبەر ئەوە ترسام کە شەیتان شتێ یا گومانێکی بەد بخاتە ناو دڵتانەوە دڵتان لەمن کرمێ ببێو ئەوە ببێ بەهۆی سەرتیا

---

[١٤٠٤] تجرید/٤، ژمارە: ٩٣١ = ٢٠٣٥ بخاری. مسلم: ٢١٧٥ ترقیم الشیخ محمد فؤاد لصحیح البخاری - پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٣٧ - ٥٦٤٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٣ رقم الباب/٨).

چونتانو خودا بەهۆی ئەو گومانە بەدەوە بە پێغەمبەرەکەی رقتان لـێ بگـرێ. (تاج/٢/١٤٦ ز/٧٥ ف/٢ – ش/د/ن).

## (١٠) باب مَنْ أتىَ مَجْلِساً فَوَجَدَ فُرْجَةً فَجَلَسَ فيها، وَ إلاَّ جَلَسَ وَرائَهُمْ
## کەسێ کە دەچێتە ناو کۆڕی دانیشتن، ئەگەر لە ئەڵقەکەدا جێگەیەکی چۆڵی بینی، با لەوێدا دابنیشێ، دەنا با لە پشتیانەوە دابنیشێ

١٤٠٥- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذْ أَقْبَلَ نَفَرٌ ثَلاَثَةٌ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَـى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَـى رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَـالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاَثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ، فَـأَوَى إِلَـى اللَّـهِ فَـآوَاهُ اللَّـهُ، وَأَمَّـا الآخَـرُ فَاسْتَحْيَى، فَاسْتَحْيَى اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَـأَعْرَضَ فَـأَعْرَضَ اللَّـهُ عَنْـهُ». {الحديث: ٥٦٤٥ = ٥٦٣٧ فـم. تجريـد/١، رقـم: ٥٩ = ٦٦، ٤٧٤. ترمـذي. لإسـتئذان: ٢٧٢٤. تحفة الأشراف: ١٥٥١٤}: [١٤٠٥]

ئەبو واقیدی لەیثی (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: جارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ)و کۆمـەڵێ لـە یـارانی لەمزگـەوت دانیـشتبوون، خەریکی خواپەرستیو تاعەتی خودا بوون، لەوکاتەدا سێ کـەس هـاتن، دوانیـان هاتنـە بـەرەوە بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وە یـەکێکیان رۆیشت. فەرمووی: جا دوو کەسەکە لەدیار کۆڕەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راوەستان، هەتا یەکێکیان کەلێنێکی لە ئەڵقەی کوڕەکەدا بـەدی کـرد

---

[١٤٠٥] تجرید/١، ژمارە: ٥٩ = ٦٠ بخاری. پوختـەی موسلیم/٤، ژمـارە: ١٤٢٧ = ٥٦٤٥ شـیحا (بخـاری رقم الکتاب/٣ رقم الباب/٨).

تیادا دانیشت، وە ئەوی تریشیان جێگەی دەست نەکەوت بەڵام لەپشتیانەوە دانیشت، وە سێهەمیشیان هەڵی تۆراندو رۆیشت. جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئامۆژگاریو قسەی کۆڕی پەخشی زانستو یادی خوداکەی لێ بۆوە، فەرمووی: (با باسی حاڵی ئەم سێ کەسەتان بۆبکەم: یەکێکیان هانای بردە بەر خوداو خودا هانای داو جێگەی کردەوە لەناو ئەم کۆڕە پیرۆزەدا، یەکێکیشیان شەرمی کردو خودایش شەرمی لەوکرد، چونکە ئەم کۆڕە پیرۆزەی بەجێ نەهێڵا، خودایش لە پاداشتو پیتو فەڕی ئەو کۆڕە پیرۆزە بەشداریکرد، ئەوی تریشیان پشتی هەڵکردو بەکۆڕو مەجلیسی ئێمە رازی نەبوو، خودایش پشتی لەو هەڵکردو لێی تووڕە بوو!). {تاج/١/٧٠، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٩٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**روونکردنەوە:**

١- ئەبو واقیدی لەیثی ناوی: حاریثی کوڕی عەوفە، ئامادەی نەبەردی بەدر بووە، هەندێ دەڵێن: لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بووە، گوتەی یەکەم ڕاسترە، دادەنرێ بە خەڵکی مەدینە، بیستو چوار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەپیاوانی صەحیحەینە، لەبوخاریدا یەك فەرموودەی هەیە، کە فەرموودەی ژمارە (٥٩ تەجرید = ٦٦، ٤٧٤ فتح الباری). (بڕوانە: پوختەی موسلیم، ژمارە: ٤٢٩ = ٢٠٥٦ شیحا).

حەفتاو پێنج ساڵ ژیاوە، لەساڵی (٦٨) کۆچیدا، لە مەککە مردووە، گۆڕەکەی لە گۆڕستانی موهاجرینە، لەبنەڕەتدا خەڵکی مەدینەیە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە.

## (١١) باب تحريم إقامة الإنسان من موْضعه المُباح الّذى سبَقَ إليْه

## هەر كەسێ لە جێگەیەکی ڕەوا پێی دانیشت، نادروستە بۆ کەسێکی کە لەوێ هەڵی بستێنێ‌و خۆی لەوێ دابنیشێ، مەگەر بە ڕەزای خۆی

١٤٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَقْعَدِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا»، (وَفي رواية) قُلْتُ: «فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَغَيْرِهَا». وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا قَامَ لَهُ رَجُلٌ عَنْ مَجْلِسِهِ لَمْ يَجْلِسْ فِيهِ. {الحديث: ٥٦٤٩ + الحديث: ٥٦٥٠ = ٥٦٤١ فم + ٥٦٤٢ فم. تجريد/٥/٢٣٦، رقم: ١٩٧٠ = ٦٢٦٩ + ٤٨٠. تجريد/٩١١ فتح البارى} : [١٤٠٦]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نابێ کەسێ کەسێکی تر لەجێگەی خۆی هەڵبستێنێ‌و خۆی تیا دانیشێ، بەڵام لەکاتی پێویستدا تەکە تەکە بکەن‌و جێگەی یەکتری بکەنەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦٢ ج/٤}.

لەگێڕانەوەیەکا: عەرزیمکرد: مەبەست لەم نەهیە کەوا لەم فەرمایشتەدا، جێگە دانیشتنی ناو ریزی نوێژی هەینییە لەڕۆژی هەینیدا؟ فەرمووی: (مەبەست دانیشتنی ڕۆژی هەینی‌و ڕۆژەکانی تریشە، هەروا مەبەست مزگەوت‌و شوێنەکانی تریشە).

یاسای ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) وابوو، ئەگەر پیاوێ جێگەکەی خۆی بۆی چۆڵ بکردایە تیادا دانەدەنیشت). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٢٩، ژمارە: ٨٢٥ ج/٤}.

---

[١٤٠٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٧٠ = ٦٢٦٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٢٨ = ٥٦٤٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٥٦).




**ڕوونکردنەوە:**

**ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەم شوێنەدا لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ:**

**١- هەرکەسێ لەپێشا لەشوێنێکی ڕەوادا جێگەی خۆیگرت ئیتر خۆی بەو جێگەیە لەپێشترە هەتا کەسێ تر، کەسێ تر بۆی نییە کە لەوجێگەیە هەڵی بستێنێ. جا ئەو شوێنە لەناو مزگەوتابێ، یا لەشوێنێ تربێ، لەڕیزی نوێژدا بێ، یا لەڕیزی نوێژدا نەبێ.**

**٢- هەمان حوکمو بڕیاری هەیە، جێگە گشتییەکانی تر، وەك سەر شۆستەی جادەکانو شوێنە گشتییەکانی ناو بازاڕ.**

**٣- ئەگەر کەسێ بەرەزای خۆی جێگەی خۆی چۆڵ بکا بۆ کەسێ تر، ئەگەر دڵنیا بوو، لەوە کەبەدڵ پێی خۆشەو لەبەر شەرمو شتی وا نەبووە، ئەوە دروستە داواکەی قەبووڵ بکاو لەو جێگەیە دابنیشێ.**

**لە فەتحولمولهیمدا دەفەرموێ: (سوننەتە بۆ دانیشتوو، کە لەم حاڵەتانەدا، جێگەی خۆی چۆڵ بکاو بیبەخشێ بەکەسێ تر.**

**١/ بۆ کەسێ لەخۆی گەورەتر بێ بەتەمەن.**

**٢/ هەروا بۆ کەسێ لەخۆی زاناتربێ لەبەر عیلمەکەی.**

**٣/یا لەبەر هەر هۆیەکی ڕەوای تر (وەك: فەقێ بۆ مامۆستای، سۆفی بۆ شێخی خۆی، شاگرد بۆ وەستای — وەرگێڕ).**

## (١٣) بابُ مَنعِ المُخَنَّثِ مِنَ الدُخُولِ عَلَى النِساءِ الأَجَانِبِ
## رێگری له هاموشۆکردنی پیاوی سەر ژنانی بۆ لای ژنی ناخۆیی (نا مەحرەم)

١٤٠٧- عنْ امِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قالَت: دَخَلَ عَلَيَ النَّبيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدِي مُخَنَّث فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ ابِي امَيَّةَ يَا عَبْدَ اللَّهِ ارَايْتَ انْ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ الطائِفَ غَدًا فَعَلَيْكَ بابْنَةِ غَيْلانَ فَانَّهَا تُقْبِلُ باربَعٍ وَتُدْبِرُ بِثمَانٍ وَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لا يَدْخُلَنَّ هَؤُلاء عَلَيْكُنَّ). (الحديث: ٤٣٢٤، طرفاه في: ٥٢٣٥، ٥٨٨٧):[١٤٠٧]

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) تەشریفی هێنا بۆلام، لەو کاتەدا پیاوێکی سەرژنانی لەوێ بوو، جا پیاوەکە بە عەبدوڵلای کوڕی ئومەییەی گوت، کە عەبدوڵلا برای من بوو، پێی گوت: ئەگەر سبەێنێ بەپشتی خودا تائیفتان ئازاد کرد، خۆم کچەکەی غەیلانت پێ نیشان دەدەم، لەدەستی نەدەی، نێچیرێکی قەڵەوە، چۆن شۆخ و شەنگ و گەرم و نەرمێکە!! لە پێشەوە نەرم و نۆڵەو چوار لۆیە، لەپاشەوە خڕو پڕە و هەشت لۆیە! پێغەمبەریش (درودی خودای لێ بێ) بەئێمەی فەرموو: (مەهێڵن ئەم جۆرە کەسە هاموشۆتان بکا).

لەگێرانەوەیەکا کەوالە تاج دا، دەفەرموێ: (کە دادەنیشێ خڕوخەپانە و هەر لۆیە و دەنیشێتە سەر لۆ، کەقسە دەکا دەڵێی شەکر دەشکێنێ، یا بولبولەو دەخوێنێ بەینی هەردوو ڕانی وەك خەپلەی هەلاتەوایە! جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گوێی لەم قسانەی بوو، فەرمووی: (مەهێڵن ئەمە بێ بۆ لاتان) (تاج/٣ ل/١٤٠ ف/٦ ز/٥٦- باسی بەتەنیا کۆبوونەوە...).

[١٤٠٧] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٩١ = ٤٣٢٤ بخاری. مسلم: ٢١٨٠ = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٤١ = ٥٦٥٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٥٦).

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:**

**١- ئەم پیاوە سەرژنانییە ناوی (هیت)بوو، وەدا دەنرێ بەصەحابی!**

**٢- ئەم عەبدوڵلایە لەگەڵ ئەبوسوفیانا ئیسلام بوون لە ئازادکردنی مەککەدا، لەغەزای تائیف دا بە تیرێ شەهید بوو.**

**٣- پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر ئەم جۆرە قسانە هیتی لەمەدینە وەدەرنا، ناردی بۆ (الحمی) نەفیکردن و رەهەنەکردن جۆرێکە لەسزا.**

**٤- عەرزی پێغەمبەریان نکرد: بافیسارە پیاوی سەرژنانی بکوژین؟ فەرمووی: (خودا رێگەی ئەوەی نەداوم کە نوێژکاران بکوژم).**

**لە ڕاسیتدا ئەم فەرموودەیە چارەسەری کێشەیەکی گەورەی ئەم سەردەمەمان بۆ دەکا. زۆرینەی لاوان و هونەرمەندان و گۆرانی بێژان لەم بابەتەن، جا کورت و پۆخت: هاورێتیو دۆستایەتی ئەم جۆرە مرۆڤە سەر ژنانییانە کارێکی ناباشە، بەڵام جنێو پێدان و غەیبەت و ئازاردانیان بە بەلاش و بەخۆڕایی نادروستە و ئەمانەیش هەر بە موسوڵمان دادەنرێن، ئەوەی کەلەسەر ئێمەیە هەوڵی چاکبوونیان بدەین، بەڵام تۆڵەو هەرەشەو ئازاردانیان ئەوە لە ئەستۆی دەوڵەتە، بۆ ئێمە نەهاتووە لەوەدا تدخل بکەین بەڵام ئەوەندە هەیە ( لە کاتی پێویستدا، وە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی، وە بۆ بەرژەوەندی دین و دنیا، وە بۆ بەرژەوەندی خاوەن پەیوەندی، وە لە کاتی پرسیارو هەواڵپرسی لە ڕفتاری کەسی، بۆ ئەم مەبەستا نەو لەم کاتانەدا: (لاغیبة فی فاسقٍ) بە مەرجێ باسی فیسقەکەی بۆ مەبەستێکی ڕەوا بێت).**

**ئەمەیش گێرانەوەی ژمارە: (١٤٤١)ی پوختەی موسلیمە:**

**عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُخَنَّثٌ فَكَانُوا يَعُدُّونَهُ مِنْ غَيْرِ أُولِي الإِرْبَةِ، قَالَ: فَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ**

عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمًا وَهُوَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ وَهُوَ يَنْعَتُ امْرَأَةً، قَالَ: إِذَا أَقْبَلَتْ أَقْبَلَتْ بِأَرْبَعٍ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ أَدْبَرَتْ بِثَمَانٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَلاَ، أَرَى هَذَا يَعْرِفُ مَا هَا هُنَا، لاَ يَدْخُلَنَّ عَلَيْكُنَّ»، قَالَتْ: فَحَجَبُوهُ.

بَابٌ: إِطْفَاءِ النَّارَ عِنْدَ النَوْمِ {الحديث: ٥٦٥٥ = ٥٦٤٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٩١ = ٤٣٢٤، ٥٢٣٥، ٥٨٨٧}:

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی سەرژنانی هەبوو، هاتوچۆی هاوسەرەکانی پێغەمبەری دەکرد، خەڵکی وایان دانابوو، کە لەوجۆرە پیاوانەیە کە کاری جووتبوونیان بەژنان نییەو هاموشۆیان بۆلای ژنان دروستە، چونکە بەر ئەم ئایەتە دەکەون، کەوا لەسوورەتی نووردا و دەفەرموێ: {أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ - النــور/ ٣١}.

راوی فەرمووی: جا رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆیشت بۆلای ئوم سەلەمەی هاوسەری، ئەم پیاوە سەر ژنانییەیش لەوێ بوو، بە عەبدوڵڵای کوڕی ئومەییەی برای ئوم سەلەمەی گوت: ئەگەر سبەینێ بەپشتی خودا تا ئیفتان رزگار کرد، خۆم کچەکەی غەیلانت نیشان دەدەم، لەدەستی نەدەی، نێچیرێکی قەڵەوە، چۆن شۆخو شەنگو گەرمو نەرمێکە!! لەپێشەوە نەرمو نۆڵەو چوار لۆیە، لەپاشەوە خڕو پڕەو خەپانەو هەشت لۆیە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەم قسانەی بیست لەم کابرایە، فەرمووی: (ئەدیی من نەمدەزانی کە ئەمە ئەم قسانە دەزانێ کە پەیوەندی بەم جێگە هەستیارانەی ژنانەوە هەیە؟ مەهێڵن کە ئەمە هاموشۆتان بکا). لە تەجریددا دەفەرموێ: لەگێرانەوەیەکی تادا دەفەرموێ: (کە دادەنیشێ خڕو خەپانەو هەر لۆیەو دەنیشێتە سەرلۆ، کە قسە دەکا، دەڵێی شەکر دەشکێنێ، یا بولبولەو دەخوێنێ، بەینی هەردوو رانەکانی وەك خەپلەی هەڵاتە وایە! جا

کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لەم قسانەی بوو، فەرمووی: (مەهێڵن ئەمە بێ بۆلاتان!). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٢١٩٦، چ/٤ = چاپی چوارەم} . هەروا لەتەجریددا دەفەرموێ: ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- ئەم پیاوە سەرژنانییە ناوی هیت بوو، وە دادەنرێ بەصەحابی!

٢- ئەم عەبدوڵلایە کە باوك برای خاتوو ئوم سەلەمە بوو، لە ئازادکردنی مەککەدا، لەگەڵ ئەبو سوفیانا ئیسلام بوون، لەرزگارکردنی مەککەدا، لەغەزای تائیفدا بەتیرێ شەهید بوو.

٣- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم جۆرە قسانە هیتی لەمەدینە وەدەرنا، ناردی بۆ (الحمی). نەفیکردن و رەهەنە کردن جۆرێکە لەسزادان.

٤- عەرزی پێغەمبەریان کرد: با فیسارە پیاوی سەرژنانی بکوژین؟ فەرمووی: (خودا رێگەی ئەوەی پێم نەداوە کە نوێژکاران بکوژم!).

لەراستیدا ئەم فەرموودەیە، چارەسەری کێشەیەکی گەورەی ئەم سەردەمەمان بۆدەکا، زۆرینەی لاوان و هونەرمەندان و گۆرانیبێژان و موسیقا ژەنەکان و چەنەبازەکان لەم بابەتەن، جا کورت و پوخت: (هاورێتی و دۆستایەتی ئەم جۆرە مرۆڤە سەر ژنانییانە کارێکی ناباشە، بەلام جنێو پێدان و غەیبەت و ئازاردانیان بە بەلاش و بەخۆڕایی کارێ ناباش و نادروستە و ئەمانیش هەر بە موسوڵمان دادەنرێن، ئەوەی کە لەسەر ئێمەیە هەوڵی چاکبوونیان بدەین، بەلام تۆڵە و هەڕەشە و گوڕەشە و ئازاردانیان ئەوە لە ئەستۆی دەوڵەتە، بۆ ئێمە نەهاتووە لەوەدا خۆتێ هەڵقورتێنین، بەلام ئەوەندە هەیە لەکاتی پێویستدا، وەبۆ روونکردنەوەی رووی راستی، وەبۆ بەرژەوەندی خاوەن پەیوەندی، وە

لـەکاتی پرسـیارو هەواڵپرسـی لـە ڕەفتـاری کەسـێ، بـۆ ئـەم مەبەسـتانەو لـەم کاتانەدا، بەڵام شتی وا دروستە، بەمـەرجێ، باسـی فیـسقو خراپـیو نەنگـەکانی، بـۆ مەبەسـتێ ڕەوابـێ، وەك خـوازبێنیو دراوسـێتیو هـاوڕێتیو هاوبەشـێتی لەشتێکا، شتی وا بەر ئەم گوتەیە دەکەوێ: {لاَغَيْبَةَ فِي فَاسِقٍ: غەیبـەتی فاسق بەغەیبەت دانانرێ!!} .

٥- لەسـەردەمی پێغەمبـەردا، سـێ مـرۆی سـەرژنانی (مُخَنَّـث) لـە مەدینـە هـەبوون، هیـتو مـاتیعو هـەدم، ئـەم سـێ زەلامـە هاموشـۆی ژنانیـان دەکـرد، پێغەمبـەر هیتـی ڕەهەنـە کـرد بـۆ کێـوی عـەیر، کـە کێـوێ بـوو لـەنزیك ذولحولەیفـەوە، ئـیتر لـەوێ مایـەوە، هـەتا سـەردەمی عومـەر، زۆر نـەداراو بـێ دەرەتان بوو، ڕێگەیان پێ دەدا کە ڕۆژی هەینی بێ بۆ مەدینە بـۆ سواڵو دوایـی دەگەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی، لەوێ ما هەتا مـرد. ئـەم سـێ کەسـە دادەنـرێن بـە صەحابی، دروست نییە، بەچاوی بێ ڕێز تەماشا بکرێن.

## (١٤) باب جَوَازِ إرْدَافِ المَرْأَةِ الأَجْنَبِيَّةِ إذا أَعْيَتْ في الطَّرِيقِ

١٤٠٨- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، وَمَا لَهُ فِي الأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلاَ مَمْلُوكٍ وَلاَ شَيْءٍ غَيْرَ فَرَسِهِ، قَالَتْ: فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ، وَأَكْفِيهِ مَئُونَتَهُ، وَأَسُوسُهُ، وَأَدُقُّ النَّوَى لِنَاضِحِهِ، وَأَعْلِفُهُ، وَأَسْتَقِي الْمَاءَ وَأَخْرِزُ غَرْبَهُ، وَأَعْجِنُ، وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ، فَكَانَ يَخْبِزُ لِي جَارَاتٌ مِنَ الأَنْصَارِ، وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ، قَالَتْ: وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَأْسِي، وَهْيَ عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ، قَالَتْ: فَجِئْتُ يَوْمًا وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ: «إِخْ إِخْ». لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، قَالَتْ: فَاسْتَحْيَيْتُ وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ، فَقَالَ: «وَاللَّهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى

عَلَى رَأْسِكِ أَشَدُّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ»، قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ، فَكَفَتْنِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَتْنِي. {الحديث: ٥٦٥٦ = ٥٦٤٨ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٨٠ = ٥٢٢٤، ٣١٥١}: [١٤٠٨]

ئەسمائى كچى ئەبوبەكرى صەدیق، کە خوشكى عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، فەرمووی: كاتێ زوبەیری كوڕی عەوام منی هێناو شووم پێی كرد، ئەوەی پێی بڵێی ماڵو بەندەو شتی تری وا نەیبوو لەسەر رووی زەوی، تەنیا ئەسپەكەی نەبێ، لەگەل وشترێكی ئاوكێش، وەمن خۆم ئالیكم دەدا بە ئەسپەكەی‌و خزمەتیم دەكردو دام دەكرد، وە ناوكی خورمام دەكوتی‌و وردم دەكرد بۆ ئالیكی وشترە ئاوكێشەكەی، وە ئاوم دەكێشا بۆ خۆمان‌و سەتڵ‌و دۆڵچەكەیم دەدووریيەوەو پینەو پەڕۆیم دەكرد، وە هەرخۆم هەویرو نانم دەكرد، بەڵام نەمدەزانی كە بەجوانی نان بكەم، چەند ژنێكی دراوسێمان هەبوو، ئەنصاری بوون، ئەوان نانیان بۆ دەكردم، بەڕاستی ژنی راست‌و دروست خۆیان بوون.

لەوپارچە زەویەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخەڵاتی دابووی بەزوبەیری مێردم، لەوێوە بەسەر سەر ناوكی خورمام دەگواستەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ئالیكی وشترەكە، زەویەكە نزیكەی دوو میل لەماڵەوە دوور بوو (میلێ چوار هەزار هەنگاوە).

ئەسماء فەرمووی: جا رۆژێ لەسەر ئەم بارودۆخە كۆڵێ ناوكە خورما بەسەر سەرمەوە بوو، لەرێ گەیشتم بە پێغەمبەرو بە كۆمەڵێ لەیارانی، كە لەكۆمەڵەی یاریدەدەران بوون، بانگی كردم بۆلای خۆی، ئەوجا خوڕی لە

---

[١٤٠٨] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٠ = ٥٢٢٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٣٦ = ٥٦٥٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/١٠٧) + تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٠ = ٥٢٢٤ بخاری.

وشترەکەی ژێری کەیبخی بدا، فەرمووی: (یبخ .. یبخ) هەتا من لە پاشکۆی خۆیەوە سواربکا، چونکە من بیانی نەبووم خوشکی عائیشەی ژنی بووم‌و ژنی زوبەیری کوڕی عەوام بووم، کە پورزای پێغەمبەرە، چونکە دایکی زوبەیر صەفییەی کچی عەبدولموطەلیبە، کە خوشکی عەبدوللای باوکی پێغەمبەرە، صەفییە موسوڵمان بوو، ئەسماء فەرمووی: بەلام من سوار نەبووم، چونکە شەرمم دەکرد، لەگەڵ پیاوانا بڕۆم بەڕێگەدا، لەهەمان کاتیشا بیری ئەوەشم کردەوە کە زوبەیری مێردم، بۆ شتی واو لەکاتی وادا تەنگە دەیگریۆ پێی ناخۆشە.

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمەی زانی، کەوا من شەرم دەکەم‌و شەرم دەمگرێ، تەشریفی ڕۆیشت‌و منیان بەجێ هێلا، جا کاتێ زوبەیرم دی، حاڵەکەم لەنووکەوە بۆیگێڕایەوە، کە لەسەر حاڵێکی وا بەخزمەت پێغەمبەرو کۆمەڵێ لە یاریدەدەران گەیشتم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشترەکەی یبخ دا، کەمن لەپشتی خۆیەوە سواربکا، بەلام من شەرمم کردو بیری غیرەکردنی تۆم کەوتەوە، ئیتر سوار نەبووم‌و ئەوان ڕۆیشتن‌و من مامەوە!

زوبەیر فەرمووی: (سوێندم بەخودا ئەوەم بەلاوە گرانتر بوو، کە لەسەر ئەو حاڵە کۆڵە ناوکە خورما هەڵبگری، هەتا ئەوەی کە لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە سوارببویتایە!).

ئەسماء فەرمووی: ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە مامەوە خۆم خزمەتی زوبەیرو ولاخەکانیم دەکرد، هەتا ماوەیێ لەوەدوا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهۆی ئەبوبەکری باوکمەوە کارەکەرێکی بۆم نارد، خزمەتی ئەسپەکەی لەکۆڵ خستم، ئەو خزمەتی ئەسپەکەی دەکرد، ئەم کارە ئەوەندە گرنگ بوو

بەلامەوە، وەك لەبەندەیی و كۆیلەیی ئازادم بكات وابوو ئەوەندەم پێ خۆش بوو).

**ڕوونكردنەوە:**

ڕاڤە نووسەكانی ئەم فەرموودەیە، ئەسماء بەبیانی دادەنێن بۆ پێغەمبەر چونكە ژنخوشك لەپیاو حەرام نابێ، بەتەواوی، هەروا ژنی پورزایش لەپیاو حەرام نابێ، بەتەواوی. ڕەنگبێ مەبەستی مامۆستای دانەری موختەصەری صەحیحی موسلیم، ئەوەبێ: كە مەحرەمییەتی كاتی بێ، بەتایبەتی بۆ پێغەمبەری خودا، لەناو كۆمەڵێ پیاو باشدا، لەگەڵ ژنێكی تەواو خزمی خۆیدا، شتی وا لەبڕیاری ئافرەتی خۆیی دابێ).

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لەژمارە (١٧٨٠)ی تەجریدی بوخاریدا، بەرگی پێنجەم:

عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ وَمَا لَـهُ فِـي الْـأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلَا مَمْلُوكٍ وَلَا شَيْءٍ غَيْرَ فَرَسِهِ فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ نَاضِحٍ وغَيْرَ وَأَسْتَقِي الْمَاءَ وَأَخْرُزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ وَكَانَ يَخْبِزُ لِي جَارَاتٌ مِنَ الْأَنْـصَارِ وَكُـنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ قَالَتْ وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَـهُ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَأْسِي وَهِيَ مِنّى عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ فَجِئْتُ يَوْمًا وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ نَفرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَدَعَانِي ثُمَّ قَـالَ إِخْ إِخْ لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ فَاسْتَحْيَيْتُ أن أسير مع الرجال وذكـرت الـزبير وَغَيْرَتَـهُ وَكَـانَ أَغْيَـرَ الناسِ فَعَرَفَ رَسُول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أنّى قَدْ اسْتَحْيَيْت فجئـت الـزبيرَ فَقُلْـتْ لَقِينِي رَسُولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى رأسي النـوس، وَمَعَـهُ نَفَـرٌ مِـنْ أصـحابه فَأَنَاخ لأَرْكَبَ فَاسْتَحْيَيْتُ منه وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ فَقَالَ وَاللَّهِ لَحَمْلُـكِ النَّـوَى كـان أَشَـدُّ

عليَّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ قَالَتْ حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ يَكْفِينِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَنِي.(الحديث ٥٢٢٤ طرفه في: ٣١٥١):

ئەسمای کچی ئەبوبەکر، کە خوشکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، فەرمووی: کاتێ زوبەیرمنی هێنا، ئەوەی پێی بڵێی ماڵو بەندەو شتی تریوا، نەیبوو، تەنیا وشترێکی ئاوکێش و ئەسپەکەی خۆی نەبێ، وەمن خۆم ئالیکم دەدا بە ئەسپەکەی و ئاوم دەکێشا بۆ خۆمانو، سەتڵو دوڵچەکەیم دە دووری یەوە و پینەو پەڕۆیم دەکرد، وە خۆم نانو هەویرم دەکرد، بەڵام نەم دەزانی بەجوانی نان بکەم، چەند ژنێکی دراوسێمان هەبوو، ئەنصاری بوون، ئەوان نانیان بۆ دەکردم، بەڕاستی ژنی راستو دروست خۆیان بوون. لەوپارچە زەویەوە، کە پێغەمبەر –دروودی خوای لەسەربێ- بەخەڵاتی دابووی بە زوبەیر، لەوێوە بەسەر سەر ناوکی خورمام دەگواستەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ئالیکی وشترەکان، زەویەکە نزیکەی دوومیل لەماڵەوە دوور بوو (میلێ چوار هەزار هەنگاوە)، جا رۆژێ لەسەر ئەم بارودۆخە، کۆڵێ ناوکە خورما بەسەر سەرمەوە بوو، لەڕێگە گەیشتم بە پێغەمبەر و کۆمەڵێ لەیارانی، لە کۆمەڵەی یاریدەدەران، جا پێغەمبەر بانگی کردم، ئەوجا خوڕی لەوشترەکەی کە ییخی بداو فەرمووی: (ییخ ... ییخ) هەتا من لەپاشکۆی خۆیەوە سوار بکا، چونکە من بیانی نەبووم، چونکە خوشکی عائیشەی خێزانی بووم، بەڵام من سوارنەبووم، چونکە شەرمم دەکرد کەلەگەڵ پیاوانا بڕۆم بەڕێگەدا، لەهەمان کاتیشا بیری ئەوەشم کردەوە کەزوبەیری مێردم، بۆ شتی واو لەکاتی وادا تەنگە دەیگرێ و پێی ناخۆشە، چونکە بەڕاستی لەهەموو کەسێ زیاتر زوبەیر بەتەنگی ناموسەوە هەبوو، جاکاتێ پێغەمبەر – دروودی خوای لەسەر- بەمەی زانی کەوا من شەرم دەمگرێ، تەشریفی ڕۆیشتو منیان بەجێ هێڵا، جا کاتێ زوبەیرم دی حاڵەکەم لەنووکەوە بۆیگێڕایەوە،

کەلەسەر حاڵێکی وا بەخزمەت پێغەمەرو کۆمەڵێ لە یاریدەدەران گەیشتم، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- وشترەکەی ییخ دا کە من لەپشتی خۆیەوە سواربکا، بەڵام من شەرمم کردو بیری غەیرەی تۆم کەوتەوە، ئیتر ئەوان رۆیشتن و من مامەوە!.

زوبەیر فەرمووی: (سوێندم بەخودا ئەوەم بەلاوە گرانتر بوو، کەلەسەر ئەوحاڵە کۆڵە ناوکە خورما هەڵبگری، هەتا ئەوەی کەلەپاشکۆی پێغەمەرەوە سواربوویتایە!).

ئەسما فەرمووی: ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە مامەوە، خۆم خزمەتی زوبەیرو وڵاخەکانیم دەکرد، هەتا ماوەیێ لەوەدوا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- بەهۆی ئەبوبەکری باوکمەوە خزمەتکارێکی بۆم نارد، خزمەتی ئەسپەکەی لەکۆڵ خستم، ئەم کارە ئەوەندە گرنگ بوو بەلامەوە، وەك لەبەندەیی و کۆیلەیی ئازادم بکات وابوو.

## (١٥) بابُ مُنَاجَاةُ الإثنين دُونَ الثَّالث بِغَيْرِ رِضَاهُ

## نا دروستە دوو کەس پێکەوە چپەچپ بکەن‌و لەنێو خۆیانا قسەی نهێنی بکەن‌و لە کەسی سێیەمی بشارنەوە

١٤٠٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى رجُلَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ. (الحديث ٦٢٩٠):[١٤٠٩]

---

[١٤٠٩] تجريد/٥، ژمارە: ١٩٧٢ = ٦٢٩٠ بخاری. مسلم: ٢١٨٤ ترقيم شيخ محمد فؤاد = ٥٦٥٨ شيخ خليل مأمون شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٩ رقم الباب/٤٥).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: کاتێ سێ کەس بوون، نابێ دوو کەستان بەبێ ئەوی ترتان سرتە بکەنو دوو بەدوو بەبێ ئەوی ترتان قسەی پەنهانی بکەن، چاوەڕوانکەن ئەگەر قسەیەکی نهێنی خۆتان هەبوو مەیکەن هەتا تێکەڵی خەڵکی تر دەبن، ئەوسا دوو بەدوو قسە نهێنییەکەی خۆتان بکەن، چونکە ئەگەر سێ کەس بنو دوانتان چپە چپ بکەنو لەوی ترتانی بشارنەوە ئەوە شتی وا دەبێ بەهۆی دڵتەنگی ئەوی ترتان. (ریاض/٤ ل/١١٧٩ ز/٢٨١ ژ/٣-ش).

١٤١٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رضی الله عنه) قَالَ النَّبِیُّ (صلى الله علیه وسلم): «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى رَجُلاَنِ دُونَ الآخَرِ، حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، أَجْلَ أَنْ يُحْزِنَهُ»:[١٤١٠]

دەقی ئەم ژمارەیە لە ژمارە: (١٤٠٩)دا رابورد.

## (١٦) باب الطب وَالمَرَضِ وَالرُّقى
## باسی پزیشکیو نەخۆشیو نوشتەو نزاو دۆعا

{بڕوانە: ریاض الصالحین، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ٢٥٠ لە ژمارە: ١٤٦٥٨وە هەتا ژمارە: ١٥٠٢ + تەجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری، بەرگی پێنجەم، ژمارە: ١٩٧٥ هەتا ژمارە: ١٩٩٦ + التاج الجامعُ لِلأُصُولِ فِي أحاديث الرسول (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، بەکوردی، بەرگی سێیەم لەزنجیرە: ٧٣وە هەتا زنجیرە: ٨٠ لەژمارە: ٣٠٢٠ وە هەتا ژمارە: ٣٠٦٦}.

١٤١١- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رضی الله عنه) عَنِ النَّبِیِّ (صلى الله علیه وسلم) قَالَ: «الْعَيْنُ حَقٌّ»:[١٤١١]

---

[١٤١٠] بڕوانە ژمارە: (١٤٠٩). (بخاری رقم الكتاب/٧٩ رقم الباب/٤٧).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چاوێنی ڕاستە).

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٤٥٤)ی پوختەی موسلیمە، لەم بارەیەوە کە دەفەرموێ:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا». {الحديث: ٥٦٦٦ – ٥٦٥٨ فم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چاوێنیی چاوی پیس ڕاستەو هەیەو کاریگەری هەیە، گریمان شتێ وابووایە کەدەست پێشکەریی لە چارەنووسی خودایی بکردایە، چاوی پیس دەستپێشکەریی لێ دەکردو دەیئەنگاوت، چونکە چاوی پیس ئەوەندە کاریگەرە، جا ئەگەر دنیابوو، کەسێ بوو بەچاوتانەوەو داوایان لێ کردن کە خۆتان بشۆرن بۆیان، ئەوە خۆتان بشۆرنو ئاوەکە لە شتێکا کۆبکەنەوەو لەپاشا ئاوی خۆشۆردنەکەتان بکەن بەسەر ئەوکەسەدا کەبووە بەچاوتانەوە، تا خودا شیفای بدا). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٩٩٩}.

### ڕوونکردنەوە:

لە تاجدا دەفەرموێ: دەستووری ئەم خۆشۆردنەیش ئاوایە: بەپێی ئەم فەرموودەیەی دواوە، کە ئەحمەدو نەسائیو ئیبنو حەببان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) گێڕاویانەتەوە:

---

(١٤١١) بخاری. طب: ٥٧٤٠ مسلم. طب: ٥٦٦٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٥ رقم الباب/٢٠).

(چاو پیسەکە دەموچاوی‌و هەردوو دەستی هەتا هەردوو ئانیشکی‌و لەشی لەناوکی بەرەو خوار، تا خوارەوە دەشۆری‌و ئەو ئاوە چۆڕاوەیە دەکەنە قاپێکەوەو دەیکەن بەسەر سەرو پشتی ئەو کەسەدا کەبووە بەچاویەوە، پاشان قاپەکە دەمەو نخوون دەکەنەوە، ئیتر بە فەرمانی خودا چاوێنیی بەچاوەبووەکە خۆش‌و چاك دەبێتەوە. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٣٠٠٠}.

## (١٧) بابُ السحْرِ
## باسی جادوو

١٤١٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِى زُرَيْقٍ، يُقَالَ: لَهُ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ قَالَتْ: حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفعَلُ الشَّىْءَ وَمَا يَفْعَلُهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ، دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِى فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ جَاءَنِى رَجُلاَنِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَىَّ، فَقَالَ الَّذِى عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِى عِنْدَ رِجْلَىَّ، أَوِ الَّذِى عِنْدَ رِجْلَىَّ لِلَّذِى عِنْدَ رَأْسِي: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ، قَالَ: فِى أَىِّ شَىْءٍ؟ قَالَ: فِى مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُبِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ، قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِى بِئْرِ ذِى أَرْوَانَ»، قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ»، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: « لاَ، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِى

اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا، فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ». {الحديث: ٥٦٦٧ = ٥٦٥٩ فم. بخاري. طب: ٥٧٦٦. تحفة الأشراف: ١٦٩٨٥} : [١٤١٣]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو یارانو هاوەڵانو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: جوولەکەیەکی بەنی زورەیقی، کە ناوی لەبیدی کوڕی ئەعصەم بوو، جادووی لە پێغەمبەر کردبوو، هەتا هەندێ جار شتی واهەبوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیکردبوو، کەچی بەخەیاڵ وایدەزانی کە کردوویەتی!

تا ڕۆژێکیان، یا شەوێکیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر زۆر پاڕایەوە لەخودا، کە ئەم وەیەی لەکۆڵ بخا، لەپاشا فەرمووی: ئەی عائیشە! ئاگات لێیە کەخودا هات بەدەنگمەوەو چارەی دەردەکەمی پێ فەرمووم: دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەسەرینمەوە دانیشتو ئەوی تریان لە پایینمەوە دانیشت، ئەومیان کە لەسەرینمەوە بوو گوتی بەومیان کە لەپایینمەوە بوو، یا فەرمووی: ئەومیان کە لە پایینمەوە بوو، گوتی بەومیان کە لەسەرینمەوە بوو: ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ گوتی: جادووی لێ کراوە، گوتی: کێ جادووی لێ کردووە؟ گوتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، گوتی: لەچی؟ گوتی: لەشانەو لە کوڵکو مووی دەمی شانە کە لەکاتی موو داهێنانا بەردەبێتەوە، یا لەناو ددانەکانی شانەکەدا دەمێنێتەوەو لەکیف (قاوغ)ی هێشووی خورمای نێردا، گوتی: جا ئەوە لەکوێیە؟ گوتی: لەناو بیری ذی ئەروان دایە، عائیشە گوتی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ دەستەیێ لەیارانی خۆیدا، چوون بۆ ئەوێ، لەپاشا کە گەڕایەوە فەرمووی: ئەی عائیشە! بەو خودایە ئاوەکەی

---

[١٤١٣] بخاری. طب: ٥٧٦٦. مسلم: ٥٦٦٧ = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٤٥ (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٤٩).

دەڵێی لینجاوی خەنەیەو، دارە خورماکانی دەڵێی سەرو گوێلاکی شەیتانن، وا ڕەزا قورس‌و نالەبارن. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دەریت هێنا لەبیرەکە؟ فەرمووی: (نەء، وەڵێ من خودا چاکی کردمەوەو حەزیشم نەکرد کە شەڕ بورووژێنم لەخەڵك، جا لەبەرئەوە دەستوورم دا بیرەکەیان پڕکردەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٢٩٤٩ چاپی چوارەم}.

## (١٨) باب السُمِ
## باسی زەهر

١٤١٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) أَنَّ يَهُودِيَّةً أَتَتِ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ ، فَأَكَلَ مِنْهَا فَجِيءَ بِهَا فَقِيلَ أَلاَ نَقْتُلُهَا. قَالَ « لاَ ». فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). [١٤١٣]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ژنێکی جوولەکە، مەڕێکی زەهراوی دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە گۆشتە زەهراوییەکەی خوارد، جا پیلانی ژنەکە ئاشکرابوو، ژنەکەیان هێنا، ددانی نا بەتاوانەکەیدا، هاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کرد: لەسەر ئەم تاوانە بۆ نەیکوژین؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: مەیکوژن! ئەنەس فەرمووی: هەتا کاتی مەرگی حەزرەت ئەسەرو ماك‌و کاریگەری ئەو خواردنە زەهراوییە، بەزمانە بچکۆلەو مەلاشووی پێغەمبەرەوە مابوو).

---

[١٤١٣] بخاری. هِبَة: ٢٦١٧. مسلم. سلام: ٥٦٦٩ + مسلم. سم: ٥٦٦٩ شیحا (بخاری رقم كتاب/٥١ رقم الباب/٢٨).

**فەرموودەی ژمارە (٢٩٥٠ و ٢٩٥١ و ٢٩٥٢ و ٢٩٥٣) لە تاجول ئوصول بەرگی سێیەم، چاپی چوارەم راگوێز دەکەم بۆ راڤەو تێگەیشتنی تەواو، سەبارەت بە بابەتی ئەم فەرموودەی ژمارە (١٤١٣)یەی ئێرە، کە ئەمە دەقەکەیانە:**

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ أُهْدِيَتْ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): «اجْمَعُوا إِلَيَّ مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ يَهُودَ » . فَجُمِعُوا لَهُ فَقَالَ « إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ » . فَقَالُوا نَعَمْ . قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَبُوكُمْ » . قَالُوا فُلاَنٌ . فَقَالَ « كَذَبْتُمْ ، بَلْ أَبُوكُمْ فُلاَنٌ » . قَالُوا صَدَقْتَ . قَالَ « فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُ عَنْهُ » فَقَالُوا نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ ، وَإِنْ كَذَبْنَا عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عَرَفْتَهُ فِي أَبِينَا . فَقَالَ لَهُمْ « مَنْ أَهْلُ النَّارِ » . قَالُوا نَكُونُ فِيهَا يَسِيرًا ثُمَّ تَخْلُفُونَا فِيهَا . فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « اخْسَئُوا فِيهَا ، وَاللَّهِ لاَ نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَدًا - ثُمَّ قَالَ - هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ » . فَقَالُوا نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ . قَالَ « هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هَذِهِ الشَّاةِ سُمًّا » . قَالُوا نَعَمْ . قَالَ « مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ » . قَالُوا أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا نَسْتَرِيحُ ، وَإِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ. {رواه البخارى}:**

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: لەکاتی گرتنی قەڵای خەیبەردا، مەڕێکی ژەهراوییان دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی خواردو دوایی فەرمووی: هەرچی جوولەکەیێ لێرە هەیە کۆیان بکەنەوە بۆم. کە کۆیان کردنەوە بۆی فەرمووی پێیان: من پرسیاری شتێکتان لێ دەکەم ئایا ئێوە راستم پێ دەڵێن؟ گوتیان: بەڵێ پێت دەڵێین، ئەی ئەبولقاسم! فەرمووی: کێ باوکی ئێوەیە؟ گوتیان: باوکی ئێمە فیسارە پیاوە، فەرمووی: درۆ دەکەن، بەڵکوو باوکی ئێوە فیسارە کەسە گوتیان: راست دەفەرمووی، قسەی تۆ تەواوە، فەرمووی: پرسیاری شتێکی ترتان لێ دەکەم**

ئایا راستم پێ دەڵێن؟ گوتیان: بەڵێ راستت پێ دەڵێین ئەی ئەبولقاسم! چونکە ئەگەر درۆت لەگەڵ بکەین تۆ بە درۆکەمان دەزانی، وەك چۆن بۆ مەسەلەکەی باوکمان پێت زانی، فەرمووی پێیان: کێ دۆزەخییە؟ گوتیان: ئێمە نەختێ لە دۆزەخدا دەبین، بەڵام ئێوە لەپاش ئێمە تیایدا دەمێننەوە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموون: چغەتان لێ بێ دۆزەخ جێگەی ئێومیە، بە یەزدانی پاك هەرگیزاو هەرگیز ئێمە لەپاش ئێوە لەوێ نامێنینەوە ئینجا پێی فەرموون: ئەگەر شتێکی ترتان لێ بپرسم ئەمجارە راستیم پێ دەڵێن؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئایا ژەهرتان کردۆتە ناو گۆشتی ئەم مەڕەوە کە ئێستا ئێمە لێمان خوارد؟ گوتیان: بەڵێ تێمان کردووە، فەرمووی: چی ئەمەی پێ کردن و لەبەرچی؟ گوتیان: ویستمان تاقیت بکەینەوەو گوتمان: ئەگەر تۆ پێغەمبەری راستی نەبیت و پێغەمبەرە درۆزنەبیت ئەوا دەتکوژین بەم ژەهرەو رزگار دەبین لەدەستت بەڵام ئەگەر پێغەمبەری راستی بیت ئەوا ئەم ژەهرە کارت لێ ناکاو زیانت پێ ناگەیەنێ.

عَنْ أَنَسٍ أَنَّ امْرَأَةً يَهُودِيَّةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ فَأَكَلَ مِنْهَا فَجِيءَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ فَقَالَتْ أَرَدْتُ لأَقْتُلَكَ. قَالَ « مَا كَانَ اللَّهُ لِيُسَلِّطَكِ عَلَى ذَاكِ ». قَالَ أَوْ قَالَ « عَلَىَّ ». قَالَ قَالُوا أَلاَ نَقْتُلُهَا قَالَ « لاَ ». قَالَ فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِى لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {رواه مسلم وأبو داود}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: ژنێکی جوولەکە مەڕێکی ژەهراوی دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێکی لێ خوارد، ئینجا ژنەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەسەلەی مەڕە ژەهراوییەکە لێی پرسی، کە بۆچی

ئەمەی کردووە، گوتی: ویستم کە بتکوژم، فەرمووی: خودا کارێکی واناکا کە ئەوە بەتۆ بکرێ یا فەرمووی: خودا شتی واناکا کەتۆ بەسەر مندا زاڵ بکا گوتیان: بۆ نەیکوژین؟ فەرمووی: مەیکوژن! ئەنەس گوتی: هەتا کاتی مەرگی حەزرەت ئەسەرو ماکی ئەو خواردنە زەهراوییە بە زمانە بچکۆلەو مەڵاشووی پێغەمبەرەوە مابوو.

عن جَابِرٌ (رضي الله عنه) أَنَّ يَهُودِيَّةً مِنْ أَهْلِ خَيْبَرَ أَهْدَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَاةً مَسْمُومَةً فَأَكَلَ مِنْهَا وَأَكَلَ مَعَهُ رَهْطٌ مِنْ أَصْحَابِهِ ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ، وَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ فَقَالَ لَهَا: « أَسَمَمْتِ هَذِهِ الشَّاةَ؟ قَالَتِ الْيَهُودِيَّةُ: مَنْ أَخْبَرَكَ؟ قَالَ: «أَخْبَرَتْنِي هَذِهِ الذِّرَاعِ، قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: « فَمَا أَرَدْتِ إِلَى ذَلِكَ؟». قَالَتْ: قُلْتُ إِنْ كَانَ نَبِيًّا فَلَنْ يَضُرَّهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنِ نَبِيًّا اسْتَرَحْنَا مِنْهُ فَعَفَا عَنْهَا:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێکی جوولەکە، خەڵکی خەیبەر بوو، مەڕێکی زەهراوی دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاش ئەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆیو دەستەیێ لە یارانی لێیان خوارد فەرمووی پێیان: دەستتان بگرنەوەو مەخۆن ئینجا ناردی بەدوای ژنەکەداو فەرمووی پێی: ئایا زەهرت کردووە بەم مەڕەوە؟ ژنەکە گوتی: کێ پێی گوتیت؟ فەرمووی: ئەم دەستی مەڕە پێی گوتم! گوتی: پێمەوە کردووە فەرمووی: بۆ وات کرد؟ گوتی: گوتم ئەگەر پێغەمبەر بێ زیانی پێ ناگەیەنێ، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش نەبێ ئەوا رزگار دەبین لەدەستی، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی بوورد.

وقال أبی هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) كَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَأْكُلُ الْهَدِيَّةَ وَلاَ يَأْكُلُ الصَّدَقَةَ. فَأَهْدَتْ لَهُ يَهُودِيَّةٌ بِخَيْبَرَ شَاةً مَصْلِيَّةً (أي مشويَّة

بالنَّار) مَسْمُومَةً فَأَكَلَ الْقَوْمُ فَقَالَ « ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ فَقَدْ أَخْبَرَتْنِي أَنَّهَا مَسْمُومَةٌ ». فَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ « فَسَأَلَهَا مَا حَمَلَكِ عَلَى هَذا. قَالَتْ: إِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ الَّذِي صَنَعْتُ وَإِنْ كُنْتَ مَلِكًا أَرَحْتُ النَّاسَ مِنْكَ. فَأَمَرَ بِهَا فَقُتِلَتْ لِأَنَّهُ مَاتَ بِشْرُ بْنُ مَنْ أَكَلِهَا ثُمَّ فِي وَجَعِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ « مَا زِلْتُ أَجِدُ مِنَ الأَكْلَةِ الَّتِي أَكَلْتُ بِخَيْبَرَ فَهَذَا أَوَانُ قَطَعَتْ أَبْهَرِي». رواهما أبو داود في الديات والله أعلى وأعلم.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: لە دیاریی دەخوارد بەلام لە زەکاتی نەدەخوارد، جا لە خەیبەر ژنێکی جوولەکە مەڕێکی برژاوی زەهراوی بە دیاری بۆ هێنا، جا هەم پێغەمبەر خۆیو هەم یارانی هەندێ لەو مەڕەیان خوارد، لە گەرمەی خواردندا بوون حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەست بگرنەوە ئەم مەڕە دەڵێ پێم: کە زەهری پێوەکراوە! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن ژنە جوولەکەکەداو لێی پرسی: بۆ وات کرد؟ گوتی: ئەگەر پێغەمبەر بیت زیانت پێ ناگەیەنێ، ئەگەر پادشایش بیت ئەوا ئەم خەڵکە لە دەستت قوتار دەکەم! لە پاشا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری دا ژنەکەیان کوشتەوە، چونکە بەو خواردنە بیشری کوڕی بەرائی پێ مرد، لە پاشدا لەو نەخۆشینەی حەزرەتدا کە وەفاتی تیا کرد، فەرمووی: هێشتاوەکوونێ هەست بە ئێشو ئازار دەکەم بەهۆی خواردنەکەی خەیبەرەوە هاکا کە بەندی دڵی پچڕاندم یا فەرمووی: هاکا تیرەی گازەرەی پشتی پساندم.

## (١٩) باب إستحباب رقية المريضِ
## له كاتى نەخۆشىو ئازارا، نزاو نوشتە سوننەتە

١٤١٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَتَى مَرِيضًا أَوْ أُتِيَ بِهِ قَالَ أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا .(الحديث ٥٦٧٥ اطرافه في: ٥٧٤٣، ٥٧٤٤، ٥٧٥٠):[١٤١٤]

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- وابوو، کاتێ دەچوو بۆلای نەخۆشێ، یا فەرمووی کاتێ نەخۆشێکیان دەهێنا بۆ لای ئاوا نزای چاکبوونەوەی بۆی دەکرد دەیفەرموو: (أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا: ئەی خودای من! ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە، ئەی لابەری ئێشو ئازار! شیفای بدەو خۆشو چاکی بکەرەوە، شیفادەری بەراستی هەرخۆتیتو خۆشبوونەوە هەربەدەستی تۆیە، بێجگە لەتۆ شیفادەری تر نییە، ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێ دەرمانو نووشتە پارەناکا، شیفایەکی تەواوی وا کەهیچ دەردێ نەهێڵێ!). (تاج/٤ ز/٧٤ ل/٢١٦).

ئەمەیش دەقی ژمارە: (١٤٦٠ و ١٤٦١)ی پوختەی موسلیمە، سەبارەت بەم بابەتە:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اشْتَكَى مِنَّا إِنْسَانٌ مَسَحَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ قَالَ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ

---

[١٤١٤] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٦٩ = ٥٦٧٥ بخاری. مسلم: ٢١٩١ ترقیم محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٦١ = ٥٦٦٨ شیحا + پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٦٠ = ٥٦٧١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٥ رقم الباب/٢٠).

الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا»، فَلَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَثَقُلَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ، لأَصْنَعَ بِهِ نَحْوَ مَا كَانَ يَصْنَعُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ يَدِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَاجْعَلْنِي مَعَ الرَّفِيقِ الأَعْلَى»، قَالَتْ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ، فَإِذَا هُوَ قَدْ قَضَى. {الحديث: ٥٦٧١ = ٥٦٦٣ فـم. تجريـد/٥، رقـم: ١٨٦٩ = ٥٦٧٥، ٥٧٤٣، ٥٧٤٤، ٥٧٥٠}:

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ کەسێ لەئێمە ئازارێکی ببوایە، دەستی راستی دەهێنا بەسەر شوێنی ئازارەکەداو دەیفەرموو: (أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا):

واتە: ئەی خودای من! ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە! ئەی لابەری ئێش‌و ئازار! شیفای بدەو خۆش‌و چاکی بکەرەوە، شیفادەری بەڕاستی هەر خۆتیت‌و خۆشبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لەتۆ شیفادەری تر نییە، ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێ، دەرمان‌و نوشتی پارە ناکا، شیفایەکی تەواوی وا کەهیچ دەردێ نەهێڵێ!).

جا کاتێ پێغەمبەر خۆی نەخۆش کەوت‌و دەردەکەی گران بوو، دەستیم گرت تالەسەر شێوەی جارانی خۆی ئەو دۆعایەی بۆ بکەم کە ئەو جاران کاتێ نەخۆش دەبووین دەیکرد بۆ ئێمە، کەچی دەستی خۆی لەدەستم راپسکاند، لەپاشا فەرمووی: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَاجْعَلْنِي مَعَ الرَّفِيقِ الأَعْلَى): خودایە! لێم خۆشبەو شادم کە بەدیداری هاوڕێی هەرە پایە بڵندو بمبەرەوە بۆناو یارانی ئەنجومەنی بالآ (مەلەئولئەعلا) کەوان لەپەنای خۆتا).

عائیشە فەرمووی: ئیتر کە سەرنجمدا روانیم واگیانی پاکی سپاردو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا. {تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٠٢٨} + {تاج/٣، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٣٠٣٧}.

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ يَرْقِي بِهَذِهِ الرُّقْيَةِ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفَاءُ، لاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ أَنْتَ». {الحديث: ٥٦٧٦ = ٥٦٦٨ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بەم دۆعایە نووشتەی دەکرد: (أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفَاءُ، لاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ أَنْتَ):

واتە: ئەی خودایە! ئەم ئازارە بەرەوە بۆلای خۆت، ئەی پەروەردگاری کۆمەڵەی ئادەمیزادەکان! چارەو چارەسەرو خۆشبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، لابەری ئەم ئێش‌و ئازارە تەنیا هەر تۆی‌و بەس).

## (٢٠) بابُ رُقيةِ المَريضِ بِالمُعوذاتِ وَالنَّفث
## نوشتەکردن بۆ نەخۆش بە خوێندنی «قُل أعوذ»ەوەکان لەگەڵ تەرایی دەمدا

١٤١٥- عنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) اخْبَرَتْهُ انَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ اذا اشْتَكَى نَفَثَ عَلَى نَفْسِهِ بالْمُعَوِّذاتِ وَمَسَحَ عَنْهُ بِيَدِهِ فَلَمَّا اشْتَكَى وَجَعَهُ الَّذي تُوُفِّيَ فِيهِ طفِقْتُ انْفِثُ عَلَى نَفْسِهِ بالْمُعَوِّذاتِ الَّتِي كَانَ يَنْفِثُ وَامْسَحُ بِيَدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْهُ. (الحديث: ٤٤٣٩، اطرافه في: ٥٠١٦، ٥٧٣٥، ٥٧٥١):[١٤١٥]

---

[١٤١٥] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٢٣ = ٤٤٣٩ بخاری. مسلم: ٢١٩٢ ترقیم شیخ محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٤٦ = ٥٦٧٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٦ رقم الباب/١٤).

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کەخۆی نەخۆش دەکەوت سوورەتی: ﴿قُلْ هوَ اللّٰه﴾ و سوورەتی: ﴿قلْ اعوذ بربِّ الفَلَق﴾ و سوورەتی: ﴿قل اعوذبرب الناس﴾ی بەسەر خۆیدا دەخوێند و لەپاشا بەتەڕایی دەمی پفی لەخۆی دەکرد، بەلام لەو نەخۆشییەدا کەتیادا وەفاتی کرد، کەنەخۆش کەوت، من خۆم سوورەتەکانم بەسەریدا دەخوێندو، ئەنجا بەتەڕایی دەمم فوم لێ دەکرد، بەلام دەستی پێغەمبەر خۆیم هەڵ دەگرت و دەمهێنا بەسەرجەستەی پیرۆزیدا، لەبەر ئەوەی کەدەستی ئەو گەلێ گەلێ لەدەستی من بەپیت و فەڕوو بەرەکەتترە. (تاج/٤ ل/٢٢٢ ز/٧٥ ف/١).

ئەمەیش دەقی ژمارە: (١٤٤٦)ی پوختەی موسلیمە، بەهرەی پتری واتیادا:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِهِ، لأَنَّهَا كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْ يَدِي. {الحديث: ٥٦٧٨ = ٥٨٧٠ فم. تجريد/٥، رقم: ١٦٢٣ = ٤٤٣٩، ١٦، ٥٠، ٥٧٣٥، ٥٧٥١}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ یەکێ لەکەسوکارەکەی خۆی نەخۆش دەکەوت، سوومەتی: (قُلْ هُوَ اللّٰهُ) و سوورەتی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَق) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النّاسِ)ی بەسەریدا دەخوێندو لەپاشا بە تەڕایی دەمی پفی لێ دەکرد، بەلام لەو نەخۆشییەدا، کە پێغەمبەر تیادا مەرگ بوو بەمیوانی، من خۆم سوورەتەکانم بەسەریدا دەخوێندو ئەنجا بە تەڕایی دەمم فووم لێ دەکرد، بەلام دەستی پێغەمبەر خۆیم هەڵدەگرتو دەمهێنا بەسەر جەستەی پیرۆزیدا، لەبەرئەوەی

کەدەستی ئەو گەڵ گەڵ لەدەستی من بەپیتو فەرو بەرکەتتر بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٣٠٣٧ ج/٤}.

## (٢١) بابُ إستحباب الرقيةِ مِنَ العَيْنِ والنَّمْلَةِ وَالحُمَّةِ وَالنَظْرَةِ
## چاوەزارو نوشتەی مێکوتەو دەمبەستی هەموو جانەوەرێکی زەهردارو نوشتووی بە چاوەوە بوون، ئەمانە هەموو سوننەتن

١٤١٦- عَنْ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ الرُّقْيَةِ؟ فَقَالَتْ : رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ. {الحديث: ٥٦٨١ = ٥٦٧٣ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٣ = ٥٧٤١. تحفة الأشراف: ١٦٠١١}: [١٤١٦]

ئەلئەسوەد فەرمووی: پرسیم لە عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) لەبارەی نووشتەو چاوەزارەوە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی دا بەماڵێ ئەنصاری کە نووشتەو چاوەزارو دەمبەست بکەن بۆ هەموو جانەوەرێکی زەهردار، وەك مارو دووپشكو زەردەواڵەو هەموو چزوودارو زەهردارێکی تر).

١٤١٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ إِذَا اشْتَكَى الإِنْسَانُ الشَّيْءَ مِنْهُ أَوْ كَانَتْ بِهِ قَرْحَةٌ أَوْ جَرْحٌ، قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِإِصْبَعِهِ هَكَذَا، وَوَضَعَ سُفْيَانُ سَبَّابَتَهُ بِالأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعَهَا: «بِاسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا»، قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: «يُشْفَى»، وَقَالَ زُهَيْرٌ: «لِيُشْفَى سَقِيمُنَا». {الحديث: ٥٦٨٣ = ٥٦٧٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٤ = ٥٧٤٥،

---

[١٤١٦] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٨٣ = ٥٧٤١ بخاری. مسلم: ٢١٩٣ = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٥٠ = ٥٦٧١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٣٧).

٥٧٤٦ فتح الباري. أبو داود. طبّ: ٣٨٩٥. ابـن ماجـة. طـبّ: ٣٥٢١. تحفـة الأشـراف: ١٧٩٠٦} : [١٤١٧]

عائيشه (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ئەگـەر كەسـێ ئێشێ، ئـازارێ لـە لەشیا بوایە، یاخود برینێ، یـا زامێكـی پێوە بوایـە، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسەر بێ) پەنجەی شـایەتمانی خـۆی بـەتفی خـۆی تـەڕ دەكـردو دەینایـە سـەر خاكو پەنجەی تۆزێ خۆڵی پێوە دەلكا، ئەوجا پەنجەی بـە خـۆڵو تەڕاییەكـەی دەمیەوە دەهێنا بەسـەر شـوێنی ئازارەكـەداو لەوكاتـەدا ئـەم نزایـەی دەخوێنـدو دەیفەرموو: {بِاسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا} :

واتە: بە پیرۆزیی ناوی خودای گەورە، دۆعاو نزاو نووشتەمت بۆدەكەم، ئەمە خاكی زەوی خۆمانە، لەگەڵ تـەڕاییی دەمـی موسـوڵمانێ لەخۆمانـە، بەفـەرمانی پەروەردگارمان، دەبێ بەچارەو دەرمان بۆ نەخۆشمان!).

ئەم فەرموودەیە ئیمـامی موسـلیم لەسـێ مامۆسـتای خۆیـەوە دەیگێڕێتـەوە، كـە ئەبوبـەكری كـوڕی ئـەبو شـەیبەو زوهـەیری كـوڕی حـەربو ئیبنـو ئـەبی عومەرە، هەركەسێ لەم سێ مامۆستایە رستەی كۆتاییان بەشێوەیێ گێڕاوەتـەوە، كەمێ جیایە لەوی تریـان، ئیبنـو ئـەبی عومـەر ئـاوای دەگێڕێتـەوە: (لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا). ئیبنو ئەبی شەیبە ئاوای دەگێڕێتـەوە: (يُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا) واتـە: بـەبێ لامی ئەمرەكە، زوهەیریش ئاوا: (لِيُشْفَى سَقِيمُنَا) واتە: بەبێ (بِـە). گەرچـی ئـەم سێ لـەفزە، لـەدەقی عەرەبییەكـەدا، رۆڵ دەبیـنـنو لـەواتادا كاریگـەرییان هەیـە، بەڵام لە كوردییەكەدا مەئالی هەرسێكیان ئەومیە كە نووسراوە.

---

[١٤١٧] تجریـد/٥، ژمـارە: ١٨٨٤ - ٥٧٤٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٤٥٨ - ٥٦٨٣ تـرقیم شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٣٨).

١٤١٨- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ أَمَرَ أَنْ يُسْتَرْقَى مِنَ الْعَيْنِ. (الحديث ٥٧٣٨): [١٤١٨]

**حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمەر (دروودی خوای لەسەر) فەرمانی پێم کردووە، یا فەرمووی فەرمانی بەموسوڵمانان کردووە، کە چاوەزار بکرێ بۆ ڕزگاربوون لەچاوی پیس).**

١٤١٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى فِي بَيْتِهَا جَارِيَةً فِي وَجْهِهَا سَفْعَةٌ فَقَالَ اسْتَرْقُوا لَهَا فَإِنَّ بِهَا النَّظْرَةَ. (الحديث ٥٧٣٩): [١٤١٩]

**ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمەر -دروودی خودا لەسەر پێغەمەرو ڕەزای خودا لەسەر هەموو هاوسەرەکانی- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی لەسەر- لەماڵی من بوو، کچۆڵەیەکی دی خەرکانە لەدەموچاوی هاتبوو، فەرمووی: (چاوەزاری بۆبکەن، ئەمە بووە بەچاوەوە). •تاج/٤ ز/٦٦ ل/٢٠٧ ژ/٦).**

## (٢٣) بابُ جَوَازِ أَخْذِ الأَجْرَةِ عَلَى الرُّقيَةِ بِالقُرْآنِ وَالأذْكارِ
## دروستە کرێو سەر قەڵەمانە لەسەر نوشتەکردن بە قورئانو بە ناوو یادو زیکرە پیرۆزەکان وەربگیرێ

١٤٢٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ أَبِي بِشْرٍ عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (انْطَلَقَ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

[١٤١٨] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٨١ = ٥٧٣٨ بخاری. مسلم: ٢١٩٥ ترقيم محمد فؤاد = ١٤٥٥ = ٥٦٨٦ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٣٥).

[١٤١٩] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٨٢ = ٥٧٣٩ بخاری. مسلم: ٢١٩٧ ترقيم محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٥٧ = ٥٦٨٩ حسب ترقيم شيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٣٥).

فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لا يَنْفَعُهُ شَيْءٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ فَأَتَوْهُمْ فَقَالُوا: يَا أَيُّهَا الرَّهْطُ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ وَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لا يَنْفَعُهُ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ مِنْ شَيْءٍ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَعَمْ وَاللَّهِ إِنِّي لارْقِي وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَقَدْ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنْ الْغَنَمِ فَانْطَلَقَ يَتْفِلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَا بِهِ قَلَبَةٌ قَالَ فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمْ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اقْسِمُوا فَقَالَ الَّذِي رَقَى لا تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : فَذَكَرُوا لَهُ فَقَالَ وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ ثُمَّ قَالَ قَدْ أَصَبْتُمْ اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ: وَقَالَ شُعْبَةُ: حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ سَمِعْتُ أَبَا الْمُتَوَكِّلِ بِهَذَا) (الحديث ٢٢٧٦، أطرافُهُ في: ٥٠٠٧، ٥٧٣٦، ٥٧٤٩): [١٤٢٠]

ئەبو سەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر - دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوڕێیانی بێ – دەچن بۆ سەفەرێ، دەڕۆن تا لای خێڵێ عەرەب دا لادەدەن، دەیانەوێ بەمیوان قەبوڵیان بکەن بەلاّم خێڵەکە ڕازی نابن‌و دایان ناکەن و، میوانداریيان پێ ناکەن، جا ئاغای خێڵەکە شت پێوەی دەدا، وە بەزۆر شت هەوڵی لەگەڵ دەدەن، بەلاّم سوودی نابێ بۆی تا هەندێکیان دەڵێن: بۆ ناچن بۆ ناو ئەم کاروانییە کەلێرەدا لایان داوە، سابەشکوو چارەیێ لەلای کەسێکیان هەبێ، جا

---

[١٤٢٠] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٠٦ = ٢٢٧٦ بخاری. مسلم: ٢٢٠١ محمد فؤاد - پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٤٩ = ٥٦٩٧ ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣٧ رقم الباب/١٦).

دەڕۆن بۆلایـانو دەڵێن: سـەرخێڵەکەمان شـت پێـوەی داوەو بەزۆرشـت هـەوڵمان لەگەڵی داوە، بەڵام سوودی نییە بـۆی، ئایا لـەلای کەسـێ لـەئێوە چارەیێ نییـە؟ یەکێـکیان دەڵێ: بـا، بەخوا مـن دوعـای گەزەنـدە دەکـەم، بـەڵام بـەخوا چونکە ئێمە داوای میوانداریمان لـێ کردن، کەچی ئیوە داتـان نـەکردینو رازی نـەبوون، منیش دوعاتان بۆ ناکەم تاسەرقەڵەمانەیێکمان بۆ دانەنێن.

ئینجا رێدەکەون لەسەر بڕکەیێ پەز، ئیتر ئـەویش لەگـەڵیان دەچی بـۆ لای سـەر خێڵەکـەو لـەوێ سـوورەتی ﴿الحمـدُ للهِ ربِّ العـالمین﴾ دەخـوێنێ بەسـەریاو کەمێ تفی لـێ دەدا، وەهـەتا حـەوت جـار، لەپێـشا فاتیحـە دەخـوێنێ، وەئینجا بەتەڕایی دەمی پفی لـێ دەکا، ئیتر شت پێوەدراوەکە وەك وشترێ لەپەت بـەربێ، دەستو پای کرایەوەو هەستاو کەوتە گـەڕو یـەك دەنـك پەلـەقاژێو پەلـەفرتێو پەلەپرووسکێی نەما. گوتی: ئیتر ئەو سەرقەڵەمانەی کەلەسەری پێـك هـاتبوون بەتەوای دایان پێیان.

جـا هەنـدێ کەسـیان گووتیـان: بابەشـی بکـەین لـەناو خۆمانـا، بـەڵام دوعـا خوێنەکـە گـوتی: دابەشـی مەکـەن تـا دەچـینەوە لای پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسەر بێ) وراستی رووداوەکەی عەرزدەکەین هەتا بزانین ئەو فەرمانی بەچییە پێمان، جا کەهاتنەوە لای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) و ئەمـەیان بـۆی گێڕایەوە، فەرمووی: چۆنت زانـی ئـەوە دۆعایـە، گـوتی: شـتێ راسـت بـوو خـودا خـستیە نـاو دڵمـەوە، فـەرمووی: شـتێ باشـتان کـردووە،دەی دابەشـی بکـەنو پشکێـکیش بۆ من دابنـێن لەگـەڵ خۆتانـدا، هـەتا بەتـەواوی دڵنیـابن لەدروسـتی کارەکەیانو لەحەڵاڵی سەرقەڵەمانەکەیان، ولەو کرێیەی کەوەریانگرتووە.

جاپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەپاش دابـەش کردنەکـە، دیـسانەوە رەزامەنـدی خـۆی دەربڕیـەوە بەزەردەخەنـەیێ) لەگێڕانەوەیـەکی تاجـا هەنـدێ

کەسیان ئەمەیان بەدڵ نەبووە، وەدەیانگوت: تۆ لەسەر نامەی خودا کرێت وەرگرتووە، تاکاتێ هاتنەوە بۆ مەدینە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە لەسەر نامەی خودا کرێی وەرگرتووە؟ ئەویش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (رەواترین شت کە کرێی لەسەر وەربگرن قورئانی پیرۆزە، کە نامەی خودای گەورەو سەرومرە) (تاج/٤ل/٢٢٣ف-٣ز-٧٥ش/ت/ن. باسی (الرّقيةُ بالقرآنِ الكريمِ وجَوازُ أخذِ الأَجرِ عليها).

بسم الله الرحمن الرحيم

بەندە لەم بابەتی دوعاو نووشتە کردن بەقورئانی پیرۆزو خواصی قورئان، لەپەڕاوی (بينَ يدَي كتابِ اللهِ)و شەرحەکەی دا کۆمەڵێ شتی جوانو بەسوودو راستو دروستم کۆکردۆتەوە. وا لێرەدا بۆ سوودی موسوڵمانان هەندێکی لێ ڕاگوێز دەکەین، لەخودا داوا دەکەم کەپیتو فەڕی تێ بفەرموێ:

فضائلُ القرآن لاتعد لجنزِ بحرها المدى والمدُّ
نذكرُ منها ههنا مُرادنا نشكُرُ من قدْ زادَ ما أفادَنا
من كانَ توفيقُ السّما سلّمَهُ (تعلّمَ القرآنَ أو علّمَهُ!)
كلامُ ربِّي إسمُهُ القرآنُ تُشفى بهِ القلوبُ والأبدانُ
بجينهِ تبارَكَ الزّمانُ وطابَ من ترتيلهِ المكانُ
ياحيُّ ياقيّومُ يا رحمانُ اجعَلْ قلوبَنا بهِ تزْدانُ
من مُعجزاتِ ربّنا القرآنُ على كمالِ ذاتهِ برهانُ
لشرحِ امرِ خلقهِ تبيانُ نعمَ المفسّرُ لهُ الزّمانُ!
لاتنقضي عجائبُ القرآنِ لأنّهُ معجزةُ الأزمانِ

إنْ غاصَ في غوره الأصغرانُ ... صادا معاً جواهرَ المعاني
ونُورُهُ للقلبِ روحٌ ثانِ ... ورفعُهُ في آخرِ الزّمانِ
بفضلكَ العميم ياشكور ... بالمصطفى المُختار ياغفورُ!
ياحيُّ يا قيّومُ يا قدير ... اجعل قلوبنا بهِ تنيرُ!
لاعيشَ الا العيشَ في ظلالِه ... لنناظر الحياة من خلالِه
أكْرِم بمبناهُ ففي جمالِه ... سامى علا معناهُ في كمالِه
يضفي على معناهُ من ظلالِه ... كأنّهُ العروسُ في حجالِه
قدْ ضاعَفَ الزّينَةُ في جلالِه ... كأجملِ العروسِ في غلالِه
بحقٌ ما جاءَ بِه محمّدُ ... تعبُّدٌ بلفظِه مؤكّدُ!!
ورقيَةٌ بِه صحيحٌ مسندُ ... من ربِّه الرّاقي بِه يسدَّدُ
إنَّ الرُّقى بالآي في القرآن ... من أهلِه منْ طبِّه الرّوحاني
وعندما عزّتْ على الإنسان ... مالُوا إلى طبِّهم الجسماني
عليكَ بالدُّعاء فالدّعاء ... لكلّ دائنا هوَ الدّواءُ!!
فخذ من القرآنِ ما تشاءُ ... لما تشاءُ يحصَلُ الرّجاءُ!
واعلم اذا تأخّر العطاءُ ... اختارَ غيرُهُ لكَ السّماءُ
عليكَ بالدّعاء والدّواء ... ففيهما شفاء كلّ داء
الاّ الذي يعصي على الشّفاء ... كالمَوتِ والهرم والقضاء!
ألا عليكم بالشفائين العسل ... وكلم القرآن أنوار الأمَلْ
يُرقى بِه قراءةً بلا مللْ ... مكرَّراً، أو مرّةً حسبَ العملْ
وكتبَ شيئٍ منهُ في اناء ... وأكْلَ ما فيه وشرْبَ الماء
منهُ أجزْ، بنيّة الشّفاء ... ثمّ استعنْ بخيرة الدّواء
النظرُ في المُصحفِ عبادةٌ ... و الموتُ في سبيلِه شهادةٌ
(الموتُ آتٍ منْ أتى الولادة ... أكرم بِه في صورة الشهادة)

لبعضهم بعض الخواص ينجلي للمعتنى به، كهند وعلي!
قرآنُ ربّي قلبُهُ ياسينُ فقلبُ تاليها بها يلينُ
ياسينُ تقرأُ على الأموات وجارةٌ لسورة الصّافات
ليسَ لتفريجِ القلوبِ مثلُها وكلّ ليلٍ قبلَ نومٍ فاتلها
إنَّ المدارَ على الإخلاصِ وقوّة اليقينِ للخلاصِ
يسينُ والصافاتُ قد تقاسموا (لو- زلَّ) عالمٌ لزلّ العالمُ

## (آدابُ تلاوَتِه)

كُنْ تالِياً يَحُوطُهُ الرِّضْوانُ
لا تالِياً يَلْعَنُهُ القُرآنُ
لِمَنْ يَمُسُّ المُصْحَفُ الطَّهَارَةُ
مِنْ حَدَثَيْنِ لِلْقُبُولِ شَارَةُ!
إلَيْكَ جُلَّ سُنَنَ التِّلاوَةِ
كَيْ تُصْبِحَ بِمُنْتَهَى الطَّراوَةِ
أنْ تَجْلِسَنْ مُتَقَبِلاً لِلقِبْلَةِ
مَعَ حُضُورِ القَلْبِ لا بِالغَفْلَةِ
فِي بُقْعَةٍ كَرِيمَةٍ كَالمَسْجِدِ
مُبْتَعِداً عَنْ شُبُهَاتِ المَرْبَدِ
أضِفْ إلَى تَخَيُّرِ المَكَانِ
تَخَيُّراً لأنْسَبِ الزَّمَانِ

كَاللَّيْـــلِ والـــصُّبْحِ وَكَالـــصَّلَاةِ
وَغَيْرِهَـــا كَأَفْـــضَلِ الْأَوْقَـــاتِ
وَكُـــنْ عَلَـــى طَهَـــارَةٍ كَامِلَـــةٍ
لِبَـــدَنٍ وَمَلْـــبَسٍ شَـــامِلَةٍ
وَفَـــاكَ نَظِّفَنْـــهُ بِالـــسِّوَاكِ
بِنَوْعِـــهِ الْمُفَـــضَّلِ الْأَرَاكِ
إِذَا تَلَـــوْتَ فَاسْـــتَعِذْ بِاللَّـــهِ
وَبَعْـــدَهَا تَقْـــرَأُ (بِـــسْمِ اللَّـــهِ)
تَغَـــنَّ بِـــالْقُرْآنِ فَـــالتَّغَنِّي
تَحْسِينُ صَوْتٍ لَيْسَ كَالْمُغَنِّي
إِقْـــرَأْ مُرَجِّعـــاً وَمُغَنِّمـــاً قَـــلاَ
تَكُـــنْ لِآدَابِ الـــتِّلَاوَةِ جَـــاهِلاً
وَرَتِّـــلِ الْقُـــرْآنَ تَـــرْتِيلاً قَـــلاَ
تَكُـــنْ بِـهِ مِـنْ غَيْـرِ رَبِّـي سَـائِلاً
عَلَيْـــكَ بِـــالْإِخْلَاصِ فِـــي الـــتِّلَاوَةِ
يَـــزْدَادُ حُـــسْنُ الـــدُّرِّ بِالنَّقَـــاوَةِ
لَـــكَ الْهَنَـــا يَـــا تَـــالِيَ الْقُـــرْآنِ
بَـيْنَ يَـدَيْكَ الْمُـصْحَفُ الْعُثْمَـانِي

عَلَى الخُدُودِ الدَّمْعُ كَالجُمَانِ
يَنْثُرُهُ تَأَثُّرُ الجَنَانِ
وَفِي الفُؤدِ الْوَجْدُ كَالنِّيرانِ
يَسْجُرُهُ تَرَنُّمُ اللِّسَانِ
يَا لُؤلُؤاً فِي صَدَفِ الْأَجْفَانِ
أَحَاطَ كَالقَدِيرِ بِالإِنْسَانِ
يَفْجُرُهُ تَدَبُّرُ الفُرْقَانِ
فِي نَسَقٍ تَحْدُرُهُ العَيْنَانِ
بُورِكْتَ يَا عُصَارَةَ الوِجْدَانِ
إذا نِلْتَ لِثْمَ صَفْحَةِ القُرآنِ
بُشْرى المِثِلِ ذلِكَ الإِنْسَانِ
إذْ قَلْبُهُ مَزْرَعَةِ الإيمانِ
فَتُبْ إِلَى إلهِكَ يَاعَبْدَهُ
وَاجْعَلْ دُمُوعَكَ الشَّفِيعَ عِنْدَهُ
نَفْسَكَ دَعْ فِي سَرْدِهَا سَارِحَةً
بِالنُّورِ عُمْقَ ذاتِهَا شَارِحَةً
حَتَّى إذا مَلَّتْ عَنِ الكَلاَمِ
أَمْسِكْ، مَسَكْتَ مِسْكَةَ الخِتَامِ

تُجْمِـــلُ مِـــنْ قُرَّائنَـــا الكِـــرامِ
كَلِمَـــةُ التَـــصْدِيقِ فِـــي الخِتَـــامِ
وَهَكَـــــذا شَـــــهَادَةُ الـــــبَلاَغِ
يَحْلُـــو الـــدُّعَاءُ عَقِـــبَ الفَـــرَاغِ
وَعَظِـــمِ المُـــصْحَفَ بِالقِيَـــامِ
لَـــهُ، وَقَبِّلْـــهُ مَـــعَ احْتِـــرَامِ
يَـــــاحَيُّ يَـــــاقيُّومُ يَاحَنَّـــــانُ!
اجْعَـــلْ قُلُبَنَـــا بِـــهِ تُـــلاَنُ
القَلْـــبُ كَـــالعَيْنِ بِـــذِكْرِ النَّـــارِ
نَزِيفُـــهُ مِثْـــلَ الـــدُّمُوعِ جَـــارِي
العَـــيْنُ كَالقَلْـــبِ لِـــذِكْرِ النَّـــارِ
لِـــدَمْعُهَا مِثْـــلَ النزِيـــفِ جَـــارِي!
كَأَنَّـــــهُ صَـــــدًى لِرَجْـــــعِ الغَـــــارِ
مُنْطِـــقُ العَبْـــرَةَ كَالأَوْتَـــارِ:-
كَأَنَّـــــهُ يَقُـــــولُ بِالجِهَـــــارِ:
وَصَـــيَّتِي بِاللَّيْـــلِ وَالنَّهَـــارِ:
((يُـــزْرِي جَمَـــالُ العَبْـــدِ بَالأَزْهَـــارِ
لَـــوْ صَـــانَهُ مِـــنْ لَوْثَـــةِ الأَوْزَارِ))

يَاعَبْدُ يَامَكْرُمَةَ الأقْدارِ
فِيكَ انْطَوَى خزينَتِهَ الأسْرارِ
خُلِقْتَ كَيْ تَعْبُدَ رَبَّ النَّارِ
حَذَارِ أنْ تُصْلَى بِهَا حَذَارِ!!
حَذَارِ مِنْ شَنَارِ نَارِ العَارِ
دِثَارُ مَنْ عَنِ الشِّعَارِ عَارِي!
فَجَاهِدِ النَّفْسَ بِهَذِي الدَّارِ
إنْ كُنْتَ لاَ تُطِيقُ مَسَّ النَّارِ!
يَاأيُّهَا الضَّلْضَالُ كَالفَخَّارِ
سَلْ جَارَكَ السَّاكِنَ بَالجِوَادِ:
يَانَفْسُ! يَايَمَامَ أيْكِ دَارِي!
يَاسَاكِنُ البُخَارِ فِي الغُبَارِ!
إلى مَتَى تَدْعُو إلى الفِرارِ
مِنَ الهُدى إلى هَوَى الشِّيرارِ؟
إنْ كُنْتَ لي مِصْدَاقَ خَيْرَ جَادِ
فَحَقَّ جَارِكِ عَلَيْكِ دَارِي!
وَمِنْ عَذَابِ سَجْنِكِ حَذَارِ
يَانَفْسُ، يَافَجَارِ، يَاحَقَارِ!

يَـــــانَفْسُ يَاغَـــــدَارِ، يَاآمَـــــارِ
بَالـــسُّوءِ أنْـــتِ لي أشَـــرُّ جَـــارِ!
إلى مَتَـــى الفِـــرارُ مِـــنْ خَيَـــارِ؟
وَالمَيْـــلُ وَالقَلْـــبُ مَـــعَ الـــشِرَارِ؟
ألا اخْلَعـــــى جَمَاعَـــــةَ الأشْـــــرارِ
ثُـــمَّ انْزِعـــي مَلابِـــسَ الأوْضَـــارِ
وَطَمْئِنـــــي قَلْبَـــــكِ بِالأذْكَـــــارِ
ثُـــمَّ ادْخُلـــي فـــي جَنَّـــةِ الأبْـــرارِ

وجاء في شرح الأرجوزة:

ان الرقية من حيث العموم جائزة خاصة بالقرآن الكريم، وهي مشروعة ومطلوبة عند الحاجة، بشرط أن تكون بكلام الله تعالى أو بأسمائه وصفاته الكريمة.

لاريب ان كلَ مسلم يجوز لهُ ان يحصّنَ نفسهُ وماله وعياله بقراءةِ آياتِ وسورِ من القرآن الكريم، أو بأدعية الحفظ الواردة في السّنةِ المطهَرة النبوية الشريفة ولكن المدار في النجاحِ والنيلَ بالمرادِ، على قوةِ اليقينِ وخلوصِ النيَة، وصدقِ الإخلاصِ، ومشروعيّة الدّعوى وخيريّة المطلوب، مع مراعاةِ آداب الدّعاء الأخرى، كاختيار المكانِ والزّمانِ.

لقد تأكد لدى المنصفين من أهلِ العلم أنَ حصول المطلوب ونيلَ المُنى قد تحقّقَ بادعية أهلِ الفضلِ، وببركةِ أنفاسهم الطيّبة بصورةِ مشهودةِ، لايسعُ العقل السليم إنكارَها، أو عدمَ الإعتراف بها، حتى أصبحت الحالة من الموروثاتِ الرّوحيّة، والحقائقِ الدّينيّة المعترفِ بها، لدى الصديقِ والمخالفِ!

وكلَ محاولَةِ لطمسِ معالِم هذهِ الحقيقة الحيـة، أيـا كـان مـصدرها، ومـن كـانَ منفذوها، وتحتَ أيَ شعار كان، محاولة مجهضة انَ القـرآن الكـريم والـسّنة المطهَـرة، وكـذلك الكُتـب المقدَسـة لـدى أهـل الكتـاب تؤكّـد هـذا الأمـر بقـوَة، وقـد روت لنـا أعاجيب من فضلِ الأدعية وتأثيرها الخارق. ثـمَ انَ للرقيَـة أنواعـاً، منهـا ملفوظـة يقرأهـا الرَاقـي علـى المرقـيَ، ومنهـا مكتوبـة، تكتـبُ في صـكَ، وتعلـق علـى المرقـيَ، كالتمائم المعلقة على الصغار.

ولاريبَ أنَ للرقيَ والعزائم آثاراً عجيبةً تتقاعدُ العقول عن الوصولِ إلى كنههـا، ولها ألفاظُ وكلماتٌ مخصوصة وعلى هيئـات وكيفيـات خاصَة، منهـا مـاثورةٌ ومنهـا مرتـبة ومرويَة من العلماء والمشايخ الكاملين من أهل الصَلاحِ والتقوى.

إنَ اولياء الشَياطين اليوم بايحاءِ منها، عندما صدمتهم الحقائق الصارخة، يحـاولون تسمية الأشياء بأسمـاء أضـدادها. وقـاموا بخـزعبلات سـحريَة متوارثـة مـن سـلفهم الخائب، على امل معارضة ما لأهل الـدين مـن التـأثير الرَوحـي الغـيبي التـابع مـن الإيمانِ باللهِ ورسولِهِ.

## (٢٦) باب لِكُلِ دَاءٍ دَوَاءٌ وَ إستحبابُ التَدَاوِي
## گشت دەردێ دەرمانی هەیە، خۆ دەرمانكردن سوننەتە

١٤٢١- عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ قَالَ: جَاءَنَا جَابِرُ بْـنُ عَبْـدِ اللَّـهِ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُما) فِي أَهْلِنَا، وَرَجُلٌ يَشْتَكِي خُرَاجًا بِهِ أَوْ جِرَاحًا، فَقَالَ: مَا تَـشْتَكِي؟ قَـالَ: خُـرَاجٌ بِي قَدْ شَقَّ عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا غُلاَمُ ائْتِنِي بِحَجَّامٍ، فَقَالَ لَهُ: مَا تَصْنَعُ بِالْحَجَّامِ يَا أَبَا عَبْـدِ اللَّهِ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَنْ أُعَلِّقَ فِيهِ مِحْجَمًا، قَالَ: وَاللَّـهِ إِنَّ الـذُّبَابَ لَيُـصِيبُنِي، أَوْ يُـصِيبُنِي الثَّوْبُ فَيُؤْذِينِي، وَيَشُقُّ عَلَيَّ! فَلَمَّا رَأَى تَبَرُّمَهُ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: إِنِّـي سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةٍ مِنْ عَسَلٍ أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ»، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «وَمَـا أُحِـبُّ

أَنْ أَكْتَوِيَ»، قَالَ: فَجَاءَ بِحَجَّامٍ فَشَرَطَهُ، فَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ. {الحديث: ٥٧٠٧ = ٥٦٩٩ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٧١ = ٥٦٨٠، ٥٦٨١}: [١٤٢١]

عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) هات بۆ ماڵمان، پیاوێکی لێ بوو، سکاڵای بوو، لەدەستی کوانێ (واتە: لەدەست دوومەڵێکی تەڕ) یا سکاڵای بوو لەدەستی برینێ، جابیر پێی فەرموو: ئەوە چیتە، سکاڵات لەچی دەردێکە؟ پیاوەکە گوتی: کوانێ زۆر ئازارم دەدا، بەرگەی ئازارەکەی ناگرم!

جابیر فەرمووی بەکەسێ: ئادەی کوڕەکە! کەڵەشاخگرێکم بۆ بهێنە. پێی گوت: ئەی باوکی عەبدوڵلا! کەڵەشاخگرت بۆچییە؟ جابیر فەرمووی: دەمەوێ کەڵەشاخی لێ بگرێ. پیاوەکە گوتی: ئەوە تۆ دەڵێی چی سوێندم بەخودا، مێشی پێوە بنیشێ ئێشم پێ دەگەیەنێ، تەنانەت جلەکەم بەری بکەوێ ئێش بەدڵم دەگەیەنێ، ئیتر چۆن دەتوانم کەڵەشاخی پێوە بنێم و کەڵەشاخی لێ بگرم؟ جا کاتێ ئیمامی جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم وەڕس بوون و بێزارییەی لێ بینی، لە کەڵەشاخگرتن، فەرمووی: دەی من بۆخۆم بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەگەر شتێ لەم دەرمانانەی ئێوە، خێریان تیادابێ) یا فەرمووی: (خێریان پێوە بێ، ئەوە لەم سێ شتەدا هەیە:

یەکەم: لەنەشتەری کەڵەشاخدا. دووەم: لەشەربەتی هەنگویندا.

سێیەم: لە داخکردن بەئاگر. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم، حەزناکەم کە خۆم داخ بکەم) عاصم فەرمووی: (جا کەڵەشاخگری هێنا، کەڵەشاخی لێ گرت، ئازارەکەی نەما).

[١٤٢١] تجرید/١٨٧١ = ٥٦٨١ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٨٠ = ٥٧٠٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٧ رقم الباب/١٨).

{تاج/٣، زنجیره: ٦٠، ژماره: ٢٩٧٢ ج/٤ + زنجیره: ٦٠، لاپەڕە: ٣٤١، ژماره: ٢٩٧١ ج/٤}.

لەژماره (١٨٧١)ی تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللّٰه عَنْهمَا قَالَ: الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثَةٍ شَرْبَةِ عَسَلٍ وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ وَكَيَّةِ نَارٍ وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ.(الحديث ٥٦٨٠ طرفه في: ٥٦٨١):

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: زۆرترین کات چارەو چاکبوونەوەی دەردو نەخۆشی، وا لەم سێ شتەدا: لەنەشتەرگەریدا، وەك: نەشتەری کەڵەشاخگرو خوێن بەردانو شتی تری لەم بابەتە، وە لەشەربەتی هەنگویندا، وە هەروەها بەداخ کردن بەئاگر، بەڵام من حەز لە خۆداخ کردن ناکەم بۆ گەلی خۆم، کە گەلی ئیسلامە). (تاج/٤ ل/١٩٤ ژ/١+٢) + (تاج/٤ ل/١٩٦ ژ/٦+٧+٨).

## ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودە پیرۆزەدا حەقیقەتێکی پزیشکی واتیادا، کەئەویش ئەوەیە، خوای گەورە هەنگوینو نەشتەرگەری و داخکردنی کردووە بەهۆی چاکبوونەوەی نەخۆشیو دەردی زۆر. ئێستا هەنگوین بەرێژەیەکی دیاری کراوی جیاجیا، لە زۆرینەی دەرمانە نوێ سەردەمی یەکاندا هەیە، وە نەشتەرگەری و کردەوە نەشتەرگەییەکان، کەناسراون بە عەمەلیاتی جیراحی، ئەوەندە زۆربوون لەڕادەبەدەرن، بگرە شێوەکارە کۆنەکان والە بیردەچنەوە، وەك کەڵەشاخ گرتنو خوێن بەدانو زالوگرتن، وەداخ کردنیش ئێستا گەشەی کردووە، وە بووە بەهونەرێکی گەلێ پێشکەوتووی سەردەمی نوێ، بەڕاستی ئێستا کە زۆرینەی ڕاستیەکان بەئەزموون و بەموشاهەدە چەسپاون، مرۆڤ بەدڵنیاییەوە دەتوانێ بڵێ: (ئەوەی لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆکراوە ڕاستیەکی پزیشکیو زانستییە

چونكە: نەشتەرگەری و هەنگوین و داخ كردن، بەهەموو جۆرو شێوەكانیەوە رۆح‌و گیانی پزیشكی ئەمرۆن).

١٤٢٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْتَجَمَ، وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ وَاسْتَعَطَ. {الحديث: ٥٧١٣ = ٥٧٠٥فم. بخاري. إجارة: ٢٢٧٨، ٢٢٧٩، ٢١٠٣. تجريد/٣/٢٧، رقم: ٩٥٤ = ٢١٠٣، ١٨٣} + {تجريد/٥، رقم: ١٨٧٥ = ٥٦٩٦ + تجريد/٩٥٣ = ٢١٠٢}: [١٤٢٢]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەڵەشاخی لەخۆی گرت‌و بەخششی بەو پیاوەدا، كە كەڵەشاخەكەی لێی گرت، دیارە ئەگەر مزو هەقدەستی كەڵەشاخگر حەرام بوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتی وای نەدەكرد/ كەبچێ بەخششێ بدا بەو كەسەی كەڵەشاخی لێ گرتووە، وە بۆ خۆتیماركردن دەرمانی دەتكاندە لووتی خۆی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٦، ژمارە: ١٧٧٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٤٢٣- حديث أَنَسٍ (رضي الله عنه) يَقُولُ كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَحْتَجِمُ، وَلَمْ يَكُنْ يَظْلِمُ أَحَدًا أَجْرَهُ: [١٤٢٣]

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو: كەڵەشاخی لەخۆی دەگرت، بۆ دەست هەق‌و كرێیش ناهەقی لەكەس نەدەكردو هەموو خاوەن مافێ، مافی خۆی بەتەواوی دەدایە.

---

[١٤٢٢] تجرید/٣، ژمارە: ٩٥٤ - ٢١٠٣ بخاری + تجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٥ = ٥٦٩٦ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٧٩ = ٥٧١٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٧ رقم الباب/١٨).

[١٤٢٣] بخاری. إجارە: ٢٢٨٠، مسلم: ٥٧١٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٧ رقم الباب/١٨).

**فـەرموودەی ژمـارە (١٨٧٥)ی تەجریـدی بوخـاری دەکـەین بـە پایـان‌و روونکردنەوە، بۆ بابەتی کەڵەشاخگرتن‌و خوێنبەردان:**

**عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللّٰه عَنْه أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الْحَجَّامِ فَقَـالَ احْـتَجَمَ رَسُـولُ اللّٰـهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَكَلَّمَ مَوَالِيَـهُ فَخَفَّفُـوا عَنْهُ وَقَالَ: إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ وَقَالَ: لَا تُعَذِّبُوا صِـبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ.(الحديث ٥٦٩٦ طرفه في: رقـم: ٩٥٣ تجريـد = ٢١٠٢ فتح الباري = بەرگی/٣ ل/٢٧):**

**پرسیارکرا لـەئیمامی ئەنـەس (رەزای خـوای لێ بـێ): ئایـا کرێـی کەڵەشـاخگر حەڵاڵە یا چییە؟ فەرمووی: (کرێی کەڵەشاخ گر دروستە، چونکە ئـەبو طـەیبـە کەڵەشاخی گرت لەپێغەمـەر -درودی خـوای لەسـەر بـێ- جـا حـەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- لـەباتی ئـەوە دوومـەن خـۆراکی پێـیدا، وە قـسەی لەگـەڵ ئاغـا ئازادکـەرەکانی کـرد، لـەبارەی پارمـەتی دانیـەوە، چـونکە ئـەم خزمەتـە باشـەی پێشکەش بـە پێغەمـەری خـودا کـردووە، ئـەوانیش ئەوسـەرانەی کـەدایان نـابوو لەسەری بەرامبەر بەئازادکردنی بۆیان کەم کردەوە).**

**وە خۆشەویـست (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (بەڕاسـتی باشـترین نموونە بۆ دەرمانی باش، بۆ ئێـوەی دانیـشتووانی گـەرمیان کەڵەشـاخ گرتنـە، وە هەروەها عوودی دەریایی، کە بەعـەرەبی پـێی دەگـوترێ: قوسـطی بـەحری). وە هەروەها حەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (منداڵتان ئەگـەر تووشـی دوومەڵی گەروو بوو، یا ئاڵووی کەوت، بەگوشینی پەنجە ئازاریان مەدەن، بەڵکوو لەباتی ئەوە بەعوودی هیندی واتە: بە قوسط دەرمانی بکەن. (بڕ: تـاج/٢ /٢٩٩ + ژ/١٨٧٤ + تاج/٤ ل/٢٠١ ژ/١).**

**ڕوونکردنەوە:**

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. کەڵەشاخ گرتنو خوێن بەردانو خۆ داخکردن و زالوو بەکارهێنان، لەشەرعا ڕێگەیان پێ دراوە، وەهەتا ئێستاش نیازمەندان بەکاریان دەهێنن، وە سودیان لێ وەردەگرن، وە پزیشکی و دوکتۆریش ڕێگەی شتی وا دەدا.

٢. هەرکاتێ باشتر هەبوو، کاربەو بکرێ نەوەك کار بە باش بکرێ. وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێ: کە عەرەبەکان بە ئەزموون لەکۆنا، دوومەڵی گەروو، وە یائالوو کەوتنیان، بەگوشینی سەری پەنجەو بەتەقاندن دەرمانو چارەسەر کردووە، بەلام ئەوەتا پێغەمەر -درودی خوای لەسەربێ- دەفەرموێ: لەوە باشتر هەیە، ئەوە دەبێ بەهۆی ئازار، تیمارکردنی ئەوجۆرە نەخۆشییانە بەدارە هیندی بکرێ بێ ئێشترو باشترە. بڕوانە: ژمارە: ٩٤٧=بەرگی/٣ ل/٢٠.

٣. لەفەرموودەکەوە دەردەکەوێ کەکەڵەشاخ گرتن، لەوڵاتی گەرمیان بەسوودترە، هەتا کوێستان، هەروەها بۆلاو بەسوودترە هەتا بۆ پیر.

٤. وەکی تریش ئێستا هەموو شتێ گۆڕاوە، وەئەم ڕێنماییە پزیشکیانە، پەیوەندی بەعیباداتەوە نییە، لەبەرئەوە دەتوانرێ خۆ دەرمان کردنو خۆ چارەسەرکردن بەشێوەیەکی سەردەمانە بێت نەك بەم شێوانە.

١٤٢٤- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا كَانَتْ تُؤْتَى بِالْمَرْأَةِ الْمَوْعُوكَةِ فَتَدْعُو بِالْمَاءِ، فَتَصُبُّهُ فِي جَيْبِهَا، وَتَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ:

«ابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ»، وَقَالَ: «إِنَّهَا مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ». {الحديث: ٥٧١٦ = ٥٧٠٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٧٩ = ٥٧٢٤ فتح الباري} : [١٤٢٤]

دەستووری ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودایان لێ بێ) وابوو، ژنێکی تاداریان دەهێنا بۆلای، لەکاتی تا لێ هاتنەکەدا، تا دۆعای بۆبکا، دەچوو ئاوی دەهێناو لە یەخەیەوە ئاوەکەی دەکرد بە باخەڵیدا بۆسەر لەشی، وە دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە پێمان کە تادار بە ئاو فێنك بکەینەوە!) وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (تا لەهاڵاوی دۆزەخە بەئاو فێنکی بکەنەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٩٩٧ ج/٤}.

١٤٢٥- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللَّه عَنْهمَا) أنها كَانَتْ إِذَا أُتِيَتْ بِالْمَرْأَةِ قَدْ حُمَّتْ تَدْعُو لَهَا أَخَذَتِ الْمَاءَ فَصَبَّتْهُ بَيْنَهَا وَبَيْنَ جَيْبِهَا وقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا أَنْ نَبْرُدَهَا بِالْمَاءِ. (الحديث ٥٧٢٤): [١٤٢٥]

فاتیمەی کچی مونزیر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) وابوو کاتی ژنێکی تاداریان دەهێنا بۆلای، لەکاتی تالێ هاتنەکەدا، هەتا دۆعای بۆ بکا، دەچوو ئاوی دەهێناو، لەیاخەیەوە دەیکرد بەباخەڵیا بۆ سەرلەشی، وەدەیگوت: پێغەمەر -دروودی لەسەر- فەرمانی کردووە پێمان کەتادار بەئاو فێنك بکەینەوە!). (تاج/٤ ل/٢٠٥ ز/٦٦ ژ/٢).

---

[١٤٢٤] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٩ = ٥٧٢٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٦٨ = ٥٧١٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٩ رقم الباب/١٠).

[١٤٢٥] بڕوانە فەرموودەی ژمارە: (١٤٢٤) (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٣٧).

١٤٢٦- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: «الْحُمَّى مِنْ فَوْحِ جَهَنَّمَ ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ»: [١٤٢٦]

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (تا لە هاڵاوی دۆزەخە، بەئاو فێنکی بکەنەوە).

## (٢٧) بابُ كَرَاهَةِ التَّدَاوِي بِاللُّدُودِ

## دەرمانکردن لەلای دەمەوە بە نا بەدڵ، بە دەمی نەخۆشەوە ناباشە

١٤٢٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: لَدَدْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، فِي مَرَضِ، فَأَشَارَ أَنْ لاَ تَلُدُّونِي، فَقُلْنَا: كَرَاهِيَةُ الْمَرِيضِ لِلدَّوَاءِ، فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: «لاَ يَبْقَى أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلاَّ لُدَّ، غَيْرُ الْعَبَّاسِ فَإِنَّهُ لَمْ يَشْهَدْكُمْ». {الحديث: ٥٧٢٥ = ٥٧١٧ فم. بخاري. مغازي: ٤٤٥٨، ٥٧٠٩، ٥٧١٠، ٥٧١١، ٦٦٨٦، ٦٨٩٧} : [١٤٢٧]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە نەخۆشینەکەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلادەمیەوە بەزۆر دەرمانمان دەکرد بەدەمیەوە، ئەویش کارەکەی ئێمەی بەدڵ نەبوو، ئاماژەی بۆدەکردین کەشتی وا نەکەین، ئێمەیش گوتمان: بۆیە وانیشان دەدا، چونکە نەخۆش حەزی لەدەرمان نییە، لەبەرئەوە بەگوێمان نەکردو بەزۆر لەلادەمیەوە دەرمانەکەمان کرد بەدەمیەوە!

بەڵام کەهۆشی هاتەوە فەرمووی: (ئەوە من جڵەوگیریم لێتان نەکرد، کە بەزۆر لەلاوە دەرمان مەکەن بەدەممەوە؟).

---

[١٤٢٦] بخاری. طب: ٥٧٢٤ مسلم: ٥٧٢١ — ٥٧٢٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٢٨).

[١٤٢٧] بخاری. مغازی: ٤٤٥٨ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٧٨ = ٥٧٢٥ (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٨٣).

گوتمان: بۆیـە بـەگوێمان نـەکردی، لـەدڵی خۆمانـا گوتمـان: نـەخۆش حـەزی لەدەرمان نییە. فەرمووی: (دەبێ لە تۆڵەی ئـەوەدا کـەواتان لـەمن کـرد، ئـەوەی لەم هۆدەیەدایە، لەبەر چاوی من بەزۆرو نابەدڵ، دەرمان بکرێ بـە لادەمیانـەوە یەکە یەکە، تەنیا عەبباس نەبێ، چونکە لەوکاتەدا ئەوتان لەگەڵ نەبوو).

لەتاجا ئەمەی پترە: تەنانەت لەبەر سوێندەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئوممولوئمنین مەیموونە، لەوکاتەدا بەڕۆژووش بوو، بەڵام دەرمانیان بەزۆر کرد بەلادەمیەوەو دەرخواردیان دا). {تـاج/٣، زنجیرە: ٦٤، ژمـارە: ٢٩٩٠ — ش/ت}.

## (٢٨) بابُ التَّدَاوِي بالعودِ الهِندی وَهُوَ الكُسْتُ
## تیمارکردن بە عوودی هیندی واتە: بە کوست

١٤٢٨- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ لَمْ يَأْكُلْ الطعَامَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَجْلَسَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجْرِهِ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ). (الحديث ٢٢٣- طرفه في: ٥٦٩٣)[١٤٢٨]:

ئوم قەیسی کچی میحصەن (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکی کۆرپـەم هـەبوو، نانـەخۆرە نـەبوو بـوو، بـۆ موبـارەکی بـردم بـۆلای پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لەکۆشـی خـۆی دا داینا، منداڵەکە میزی کرد بەجلەکانیدا، پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ)

[١٤٢٨] تجریـد/١، ژمـارە: ١٦٢ = ٢٢٣ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٤٧٧ = ٥٧٣٧ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٤ رقم الباب/٥٩).

داوای ئاوی کردو ئاوەکەی لەجلەکەی پرژاند، ئیتر نەیشۆرد (ت/ ١/ ١١١/ ٤ = ز-٢٣ ژ-١٦٦ - ش/ د/ ت/ ن).

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئوم قەیس خوشکی وەکاشەی کوڕی میحصەنە، لەدێرینا لەمەککە ئیسلام بووە، وە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، بیستو چوار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەصەحیحەیندا دوو فەرموودەی هەیە، زۆر تەمەندرێژ بووە. بەپێی ئەم فەرموودەیە سوننەتە ساوا بەنیازی پیرۆز بوونو نزای باش بۆکردن ببرێ بۆ خزمەتی پیاوچاکان.

ژمارە (١٨٧٤)ی تەجریدی بوخاریش بۆ بەهرەی پترو روونکردنەوەی مەبەست دەنووسم:

عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ. وَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِابْنٍ لِي لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ فَبَالَ عَلَيْهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَرَشَّ عَلَيْهِ.(الحديث ٥٦٩٢ أطرافه في: ٥٧١٣، ٥٧١٥، ٥٧١٨، و الحديث ٥٦٩٣ طرفه في: ٢٢٣):

ئوم قەیسی کچی میحصەن (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: عوودی هیندی بەکاربهێنن، چونکە حەوت دەرمانی پێوەهەیە، بەم شێوەیە بەکاردەهێنرێ: دەیکوتن و بەڕۆن زەیتوونەوە، یان ڕۆنەکەی دەگرن بۆ دوومەڵی مەلاشووی منداڵ دەیتکێننە کونە لووتی، وە ڕۆنەکەشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە، لەگێڕانەوەیەکدا: کوڕێکی خۆمم پێبوو، دوومەڵ لەناو قوڕگی هاتبوو، بەزەبری پەنجە دوومەڵەکەم تەقاند، کە چوومە خزمەتی حەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بۆچی

بەزمبری پەنجە دوومەڵی گەرووی منداڵتان دمتەقێنن‌و ئازارێکی زۆریان ئەدەن، بەڵکوو لەباتی ئەوە بەعودی هیندی دەرمانی بکەن، ئەم عوودی هیندییە، کە بەکوردی پێی دەگوترێ: دارەهیندی، دەرمانی حەوت دەردی واپێوە، بۆ دومەڵی گەرووی منداڵ، دەیتکێننە ناو کونەلووتی، وە ئاوەکەیشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە). (تاج/٤ ل/٢٠٢ ز/٦٣).

لەگێڕانەوەیەکی ئێرەدا دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی پێغەمەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کوڕێکی ساوای خۆمم پێ بوو، نانە خۆرە نەبوو بوو، میزی کرد بەجلەکانیدا پێغەمەر -درووودی خوای لەسەر بێ- داوای ئاوی کردو لێی پرژاندو ئیتر نەیشۆرد).

عودی هیندی واتە: قوسط، بۆ واتای ئەم وشەیە بڕوانە: ژمارە: ٢٠٥ تەجرید = ٣١٣ فەتح = بەرگی/١ ل/٢١٤ + ژ/١٦٢ تجرید = ٢٢٣ = بەرگی/١ ل/١٨٣.

١٤٢٩- عَنْ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أُمَّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ - وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللاَّتِي بَايَعْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَهِيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ أَحَدُ بَنِي أَسَد بْنِ خُزَيْمَةَ، قَالَ أَخْبَرَتْنِي أَنَّهَا: أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَأْكُلَ الطَّعَامَ وَقَدْ أَعْلَقَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ (قَالَ يُونُسُ: أَعْلَقَتْ غَمَزَتْ فَهِيَ تَخَافُ أَنْ يَكُونَ بِهِ عُذْرَةٌ) قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «عَلاَمَهْ تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذَا الإِعْلاَقِ؟! عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ (يَعْنِي: الْكُسْتَ) فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ»، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَخْبَرَتْنِي أَنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ وَلَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلاً. {الحديث: ٥٧٢٧ = ٥٧١٩ فم. تجريد/٥/١٦٥، رقم: ١٨٧٤ = ٥٦٩٢،

٥٧١٣، ٥٧١٥، ٥٧١٨} + {تجريـــد/١/١٨٣، رقـــم: ١٦٢ = ٢٢٣، ٥٦٩٣ فـــتح الباري}: [١٤٢٩]

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود فەرمووی: ئوم قەیسی کچی میحصەن، کە خوشکی وەکاشەی کوڕی میحصەن بوو، کە پیاوێ بوو لە خێڵی بەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە، کە ئوم قەیس لە کۆچبەرە پێشینەکان بوو، کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ و ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵەکانی بێ) عوبەیدوڵڵا فەرمووی: ئەم ئوم قەیسە هەواڵی پێمدا، گوتی: کوڕێکم هەبوو، شیرە خۆرە بوو، نانە خۆرە نەبوو بوو، دوومەڵ لەناو قوڕگی دەرچوو بوو، بەزەبری پەنجە دوومەڵەکەم تەقاند، وە بردم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆچی بەزەبری پەنجە دوومەڵی گەرووی منالتان دەتەقێنن و ئازارێکی زۆریان دەدەن، بە عوودی هیندی {واتە: بە کوست: بە قوسط} کەڕۆنێکە بۆ دەرمانی دەرد، دەرمانی بکەن، ئەم عوودی هیندی (دارە هیندی)یە، دەرمانی حەوت دەردە: بۆ دوومەڵی گەرووی منال دەیتکێننە ناو کونە لووتی، وە ئاوەکەشی بۆ نەخۆشی پالوو دەخورێتەوە). عوبەیدولاّ فەرمووی: ئوم قەیس پێی فەرمووم: ئەو کوڕەم میزی کرد بەکۆشی پێغەمبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردو پرژاندی لەشوێنی میزەکەی بە جلەکەیەوەو بەشۆردن نەیشۆرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ١٩٨٩ = چاپی چوارەم} + {تەجرید/٥، رقم: ١٨٧٥ = ٥٦٩٦}.

---

[١٤٢٩] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٤ - ٥٦٩٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٧٧ - ٥٧٢٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/١٠).

**ڕوونکردنەوە:**

**یەکەم:** عوودی هیندیو کوستو قوسط یەك بابەتن نەوەوی دەفەرموێ: (وَالعُـودُ الهنـديُّ يقـالُ لَـهُ القُـسْطُ والكُـسْتُ). عـوودی هینـدی دارێکـی پارچـە پارچەیە، لە ڕەگی ڕووەکی قوسط دەکرێ، کە ئەم ڕووەکی قوسطە لە هیندو لـە کیشمیرو لە وڵاتی چین دەڕوێ، بازرگانەکان جاران لەدەریاوە دەیانهێنا لەبەرئەوە پێیـان دەوت: قوسـطی بـەحری. بـەزۆر شـێوە بـەکاردەهێنرێ، وەك عەسـقەلانی دەفەرموێ:

١- طەلاء ئەوەیە کە دەکرێ بە مەڵهەمو بەزەیت چـەوردەکرێو شـوێنی ئـازاری پێ دەهەنوورێ.

٢- تەکمیدیش هەروەها.

٣- شـەراب، دەکـوترێو دەکرێتـە نـاو هـەنگوین، یـا نـاو ئـاو، یـا نـاو شـتی تـرو دەخورێتەوە.

٤- تەنطیلیش هەروەها.

٥- سموط، لەزەیتا دەکوترێو دەتکێنرێتە ناو کونە لووت.

٦- دهنیش هەروەها.

٧- تەبخیریش دەسووتێنرێو بە دووکەڵەکەی جێگەی مەبەسـت ڤـانگ دەدرێ.

هەروەها دەفـەرموێ: پزیـشکەکان دەڵـێن: قوسـط: پەلـە لـە سـوورِی مانگانـە دەکاو میز خێرا دەکاو کرمی نـاو گـەدە دەکـوژێو بـەری ژەهـر دەگـرێو بـۆ سێبەرۆ بەکاردێو گـەدە گـەرم دەکـاو ئـارەزووی جووتبـوونی نێـرو مـێ پـتر دەکاو پڵو شڵی لەش بە هەنوین لادەبا. بەشێوەی گشتی ئەم دارە هیندییـە: بۆ نەخۆشییەکانی سینگو بۆ بەڵغـەمو کۆکـەو هەلامـەتو بـۆ بـاو دوومـەڵ سوودی زۆرە، بۆ هەڵدانـەوەی ئـاڵو کـەوتنو بـۆ هـەوی نـاو دەمو نـاو گـەروو

سوودی هەیە. ئەم عووی هیندییە: هەیەتی سپییە، هەیەتی رەشە، هەیەتی شیرینە، هەیەتی تاڵە.

**دووەم:** عودی هیندی بۆندار (العود الهندی العطریّ) جیایە لەم عودی هیندییە، ئەمە لە بۆنە پیرۆزەکانا دەیسووتێنن تا بۆنی شوێنەکە خۆش بکا، لەچەشنی دەنکە شقارتەی درێژ وایە، وا لەناوپاکەتا.

**سێیەم:** (قسط أظفار) کە پێشی دەگوترێ (کوست) هەروەك پێی دەگوترێ (أظْفَارُ الطیب) لێرەدا مەبەست ئەم جۆرەش نییە، بەڵکوو ئەمە جۆرە بۆنێکی خۆشە، دەدرێ لەو جێگانەی لەش کە بۆنیان ناخۆشە، بۆ لابردنی بۆ درنو بۆ ساردیی. {تەجرید/٥/١٦٧، ژمارە: ١٨٧٥}.

## (٢٩) بابُ التَّدَاوِی بِالحَبَةِ السَّوْدَاءِ
## خۆ دەرمانکردن بە ڕەشکە

١٤٣٠- حدیث أَبَا هُرَیْرَةَ أَخْبَرَهُمَا أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) یَقُولُ: « فِی الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ السَّامَ»: [١٤٢٠]

لەژمارە (١٨٧٣)ی تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ هَذِهِ الْحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا مِنَ السَّامِ. قُلْتُ: وَمَا السَّامُ؟ قَالَ: الْمَوْتُ.(الحدیث ٥٦٨٧):

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (ڕەشکە دەرمانی هەموو دەردێکە، مەرگی لێ دەرچێ).

---

[١٤٢٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٣ = ٥٦٨٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٧٧ = ٥٧٢٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٧).

عەرزم کرد: مەبەست لەمەرگ چىيە؟ فەرمووى: مەبەست لەمەرگ مردنە).
(تاج/٤ ز/٦٢ ل/٢٠٠ ژ/١ ش/ت).

له پوختەی موسلیمیشا، ژماره (١٤٧٣) ئاوایه:

عَنِ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِنَّ فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إلاَّ السَّامَ». وَالسَّامُ: الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ: الشُّونِيزُ. {الحديث: ٥٧٢٨ = ٥٧٢٠ فم. تجريد/٥/١٦٥، رقم: ١٨٧٣ = ٥٦٨٧}:

ئەبو هورەیره (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)م بیست دەیفەرموو: (رەشکە دەرمانی هەموو دەردێکە، مەرگی لێ دەرچێ) عەرزیم کرد مەبەست لەمەرگ چییە؟ فەرمووی: مەبەست لەمەرگ مردنە، رەشکەش سیاوڵەیە). {تاج/٣، زنجیره: ٦٢، ژماره: ٢٩٨٧}.

## (٣٠) بابُ التَّلْبِينَةِ مَجَمَّةٌ لِفُؤادِ المَرِيضِ
## پەڵووله بەری دڵی نەخۆش دەکرێ

١٤٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا، فَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النِّسَاءُ ثُمَّ تفَرَّقْنَ إلاَّ أَهْلَهَا وَخَاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ، فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ تُذْهِبُ بَعْضَ الْحُزْنِ». {الحديث: ٥٧٣٠ = ٥٧٢٣ فم. تجريد/٥/٨٥، رقم: ١٨١٢ = ٥٤١٧، ٥٦٨٩، ٥٦٩٠}: [١٤٣١]

---

[١٤٣١] تجريد/٥، ژماره: ١٨١٢ = ٥٤١٧ بخاری. مسلم: ٢٢١٦، محمد فؤاد - پوختەی موسلیم/٤، ژماره: ١٤٧١ = ٥٧٣٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٠ رقم الباب/٢٤).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو یارو هاوەڵو هاوسەرانی بێ) کاتێ کەسێکی دەمرد، ژنان کە بەم بۆنەیەوە لێی کۆدەبوونەوە، کاتێ کە بڵاوەیان لێ دەکردو بەس کەسوکارو دەستو پێوەندەکەی خۆی دەمانەوە، دەستووری دەدا، کەپرِ دیزەیێ پەڵوولەیان دەکردو دەیان کرد بەسەر تریتدا، ئەوسا عائیشە بەژنەکانی دەفەرموو: لەمە بخۆن، چونکە ئەمە بۆ خەم باشە، من بۆ خۆم بیستوومە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (پەڵوولە بەری دڵی نەخۆش دەگرێو ناوسکی دەحەوێنێتەوەو خەمو خەفەتیش دەرەوێنێتەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٣٠٠٣}.

## (٣١) بابُ التَّدَاوِي بِسَقْيِ العَسَلِ
## خۆ دەرمانکردن بە شەربەتی هەنگوین

١٤٣٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلًا ثُمَّ أَتَى الثَّانِيَةَ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلًا ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلًا ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ؟ فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ اسْقِهِ عَسَلًا فَسَقَاهُ فَبَرَأَ.(الحديث ٥٦٨٤ طرفه في: ٥٧١٦)؛ [١٤٣٢]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گوتی: برایەکم هەیە سکی دێشێ؟ فەرمووی: هەنگوینی بدەرێ، بۆ جاری دووهەم هاتەوە خزمەتیو دیسان فەرموویەوە: هەنگوینی بدەرێ، بۆجاری سێهەم هاتەوە خزمەتی: دیسان

[١٤٣٢] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٧٢ = ٥٦٨٤ بخاری. مسلم: ٢٢١٧ ترقیم الشیخ محمد فؤاد = ٥٧٣١ ترقیم شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/٤).

فەرموویەوە: هەنگوینی بدەری، بۆجاری چوارەم هاتەوە گوتی: قوربان! هەنگوینی دەدەمێ، کەچی زیاتر ڕەوانی دەکا؟ فەرمووی: -درووودی خوای لەسەر بێ-: خودا لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمویێ: (فِهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ = لەهەنگوینا شیفاو دەرمان هەیە. کەواتە: ئەم فەرمایشتەی خودا ڕاستە بەڵام ئەوەی کە تۆ هەنگوین دەدەی بەبراکەت و سکی چاك نابێ، سکی براکەت درۆدەکا، دیسان هەنگوینی پێ بدە، جا هەنگوینی جارێ تر دەداتێ، وەسکی چاك دەبێ). (تاج/٤ ل/١٩٥ ژ/٣).

## (٣٢) بابُ الطاعون، وَالطيَرةِ وَالكَهَانَةِ وَغيرَها
## باسی تاعوونو بەد بینیو ڕەشبینیو کوڵەنانیو کاهینی

١٤٣٣- عنْ اسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قيلَ لهُ: مَاذا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الطاعُونِ فَقَالَ اسَامَةُ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الطاعُونُ رِجْسٌ ارْسِلَ عَلَى طائِفَةٍ مِنْ بَنِي اسْرَائِيلَ اوْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَاذا سَمِعْتُمْ بِهِ بارْض فَلا تَقْدَمُوا عَلَيْهِ وَاذا وَقَعَ بارْض وَانْتُمْ بِهَا فَلا تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ قَالَ ابُو النَّضرِ: لا يُخْرِجْكُمْ الا فِرَارًا مِنْهُ) (الحديث: ٣٤٧٣، طرفاه في: ٥٧٢٨، ٦٩٧٤): [١٤٣٣]

پرسیارکرا لە ئوسامەی کوڕی زید (ڕەزای خودایان لێ بێ) سەبارەت بەپەتای تاعوون چیت لە پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) بیستووە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (تاعوون دەردێکی پیسە، خودا لەسەر شێوەی سزا ناردی بۆ سەر بەرەمێی لەنەوەی ئیسرائیل)

---

[١٤٣٣] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٨٥ = ٣٤٧٣ بخاری. مسلم: ٥٧٣٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).

یافەرمووی: (سزایە بوو خودا ناردی بۆسەر نەتەوەکانی پێش ئێوەی نەتەوەی ئیسلام. جا ئەگەر بیستتان کەوا تاعوون لە شوێنێ داکەوتووە ئێوە لەخۆتانەوە، بەبێ پێویستی مەچن بۆسەری بۆ ئەوێ، کاتێ تاعوون لە شوێنێ پەیدا بووکە ئێوە لەوێ بوون ئەوە دەرمەچن لەوێ و لەدەستی رامەکەن). (تاج/٤ ل/١٧٦ ف/٣/١+٢+٣ - باسی: پاداشتی ددان بەخۆداگرتن لەکاتی داکەوتنی تاعووندا).

١٤٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَرَجَ إِلَى الشَّامِ حَتَّى إِذَا كَانَ (بِسَرْغٍ) لَقِيَهُ أَهْلُ الأَجْنَادِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَالَ عُمَرُ: ادْعُ لِيَ الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، فَاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ: بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ، وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَلاَ نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، قَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِيَ الأَنْصَارَ، فَدَعَوْتُهُمْ لَهُ، فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ، وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ فَلَمْ يَخْتَلِفْ عَلَيْهِ رَجُلاَنِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ، وَلاَ تُقْدِمْهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، فَنَادَى عُمَرُ بِالنَّاسِ: إِنِّي مُصْبِحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللَّهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ! وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُ خِلاَفَهُ، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ إِلَى قَدَرِ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ فَهَبَطْتَ وَادِيًا لَهُ عِدْوَتَانِ إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ؟ قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي مِنْ هَذَا عِلْمًا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ

تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ»، قَالَ: فَحَمِدَ اللَّهَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ثُمَّ انْصَرَفَ. {الحديث: ٥٧٤٥ = ٥٧٣٨ فم. بخاري. طبّ: ٤٧٢٩} : (١٤٣٤)

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا کەوتەڕێو چوو بۆ شام، کە گەیشتە سەرغ لەوێ فەرماندارەکانی سەر گەورە شارەکانی شام هاتن بە پیریەوە، کە بریتی بوون لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحو هاوڕێکانی، عەرزیان کرد: کەوا تاعوون لەشام بڵاوبۆتەوە، جا عومەر فەرمووی بەمن: کۆچکارە پێشینەکانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کردن بۆی، جا عومەر بۆ ئەم باسە راوێژی پێ کردن، بەڵام قسەیان یەك نەبوو، هەندێکیان دەیانگوت: تۆ هاتووی بۆ کارێکی وا، لەبەرئەوە بەباشی نازانین کە نەچیو بگەڕێیتەوە، هەندێکی تریان دەیان گوت: تۆ هاوەڵانی پێغەمبەرو خەڵکی تریشت لەگەڵ دایە، لەبەرئەوە ئێمە بەباشی نازانین کە بیانبەیت بۆناو ئەم پەتایە، عومەریش فەرمووی: دەورم چۆڵ کەن.

ئینجا بەمنی فەرموو: یاریدەدەران (ئەنصار)ەکانم بۆ بانگکە. منیش بانگیانم کرد بۆی، راوێژی بەوانیش کرد، ئەوانیش وەك کۆچکاران (وەك: موهاجیرین) رایان یەك نەبوو، جا بەوانیشی فەرموو: دەورم چۆڵ کەن. ئینجا فەرمووی: کێ لێرەیە لە پیرە مێردانی قوڕەیش، ئەوانەی کە لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا کۆچیان کردووە، ئەوانەم بۆ بانگ کە، جا کەبانگم کردن بەیەك دەنگ سەرجەم گوتیان: ئێمە رامان وایە کە خەڵکەکە بگێڕیتەوە بۆ دواوەو نەیان بەیت بۆناو ئەم پەتایە، ئیتر عومەر جاڕیدا بەناو عەشاماتەکەدا: کە سبەینێ

---

(١٤٣٤) تجرید/٤، ژمارە: ١٣٨٥ = ٣٤٧٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٨٤ = ٥٧٣٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/٣٠).

سـەر لەبـەیانی سـواردەبین‌و دەگەڕێنـەوە بـۆ مەدینـە. ئـەبو عوبەیـدەیش فەرمووی: ئایا لەدەستی چارەنووسی خودا هەڵدێن؟ عومـەریش فـەرمووی: ئـەی ئەبو عوبەیدە! کاشکی کەسێکی تر ئـەم قسەیەی تـۆی بکردایـە! عومـەر حـەزی نەدەکرد کەبێ دڵی ئەبو عوبەیدە بکا، ئینجا عومـەر فـەرمووی: بـەڵێ لەدەست چارەنووسـی خـودا رادەکـەین بـۆلای چارەنووسـی خـودا خـۆی! ئـەدی پـێم بڵـێ: ئەگـەر تـۆ رانـێ وشـترت هـەبێ‌و بـچێتە نـاو دۆڵێکـەوە، کـەدوو لاپـاڵی هـەبێ، لا پاڵێکیان بژوێن‌و ئەویتریان چەقەن‌و رەقەن بێ، جا ئەگـەر ئـەو رانـە لـە لاپاڵە بژوێنەکـەدا بلـەوەرێنیت، هـەر بەچارەنووسـی خـودا نییـەو ئەگـەر لەلاپاڵـە رەقەنەکەشـدا بیلـەوەڕێنیت هـەر بەچارەنووسـی خـودا نییـە؟ فـەرمووی: جـا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هات بەسەر ئەم مشت‌و مڕەدا، کە لـەوەپێش لـەوێ نەبوو، چوو بوو بۆ هەندێ ئیشی خۆی، جا عەبـدوڕەحمان هـات فـەرمووی: مـن شارەزاییم لەم باسـە هەیـە، لـە پێغەمبـەرم بیـست دەیفـەرموو (دروودی خـودای لەسەر بێ): (کاتێ بیستتان کەوا تاعوون لەجێگەیێ بڵاوبۆتەوە مەچن بۆلای بۆ ئەوێ‌و بەپێی خۆتان مەچن بە پیریەوە، کاتێ لەو جێگەیەش بڵاوبـۆوە کـەئێوە لەوێن، دەرمەچن لەوێ‌و لەدەستی رامەکەن).

فـەرمووی: ئـیتر عومـەر سـوپاس‌و ستایـشی خـودای کـردو گەڕایـەوە بـۆ مەدینـەو سـەفەرەکەی بـڕی‌و نەچوو بـۆ شـام. {ریـاض/٤، زنجیرە: ٣٦١، ژمـارە: ١٧٩٢. چـاپی دووەم + تـاج/٣، زنجـیرە: ٥٣، ژمـارە: ٢٩٤٨ ج/٤ = چـاپی چـوارەم}. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٨٢، ١٠٨٣ لەپێشەوە}.

**ڕوونكردنەوە:**

تاعوون پەتایەكی تایبەتە، زۆرینەی كات لەشێوەی دوومەڵی تەڕ لەناكاو بە مرۆڤ دەگاو، لە بنباڵو ئانیشكو دەستو پەنجەو نەرمەی لووتو پشت گوێو شوێنەكانی تری جەستە دەردێو پەیدا دەبێ، جا تاعوون، چی دوومەڵ بێو چی برین بێ، بەرە بەرە دەوروبەرەكەی یارەش دەبێتەوە، یا سوور دەبێتەوە، لە ڕەنگی سووری وەنەوشەیی، یا مەیلەو سەوز هەڵ دەگەڕێو ئەنجا زەهرو ژارەكەی دەگاتە ناو دڵو ناو گەدەو مرۆڤەكە تووشی دڵە تەپێو ڕشانەوەو چاوە قوولە دەبێ!

ڕەشەكەی كەم كەس لەدەستی ڕزگاری دەبێ، سوورەكەی لەهەموو جۆرەكانی تری باشترە. خوا بمانپارێزێ لێی.

تاعوون پەتایەكی زۆر زۆر مەترسیدارە، گەلێ جار شارێكی بەتەواوی وێران كردووە، كەسێ بەتاعوون بمرێ، پلەی شەهیدی بۆ هەیە. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٨٢ و ١٠٨٣ لە زنجیرە: ٨٥٩و زنجیرە: ٨٦٠ كە لەپێشەوە لەم پەڕاوە پیرۆزەدا ڕابورد}.

## (٣٣) باب لا عَدْوى وَلا طيرَةَ وَلاَ هَامَةَ وَلاَ صَفرَ وَلاَ نوْءَ وَلاَ غوْلَ وَلاَ يُورَدُ مُمرِضُ علَى مُصِحٍ

## باسی نەخۆشی تەنینەو بەدبینیو ڕەشبینیو بەد بوومیو كوندەپەپووو مانگی صەفەرو بورجو غوولی بیابانو نەخۆش نەكرێتە ناو ساغەوە

١٤٣٥- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): حِينَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ عَدْوَى، وَلاَ صَفَرَ، وَلاَ هَامَةَ»، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا بَالُ الإِبِلِ تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ فَيَجِيءُ الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ فِيهَا فَيُجْرِبُهَا كُلَّهَا؟ قَالَ: «فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ»؟ وَفِي رِوَايَةٍ: «لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَلاَ صَفَرَ وَلاَ هَامَةَ». {الحديث: ٥٧٤٩ = ٥٧٤٢ فم. بخاري. طب: ٥٧٥٤، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣،

٥٧٧٥. أبو داود. طب: ٣٩١١} + {تجريد/٥/١٧٤، رقم: ١٨٧٧ = ٥٧١٥، ٥٧٠٧ فتح الباري} : [١٤٣٥]

ئـەبو سـەلەمەی كـوڕی عەبـدوڕەحمان ئەفـەرموێ: ئـەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە هەیەو، نە مانگی موحـەررەم دەبێ بـەمانگی صەفەرو نەهامە هەیـە). پیـاوێكی عـارەبی دەشـتەكی عـەرزیكرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبەری خودا! وادەبێ كە وشترەكان لەناو لی ئـەو دەشـتەدان، لەبـەر گـورج و گۆڵی و پاكی و پوختی دەڵێی رەوە ئاسكن، چ دەردیان نییـە، كەچی كـە وشـترێكی لاوەكـی گـەڕیان تێكـەڵاو دەبـێ، هـەموویان گـەڕدەكا، ئـەی ئـەوە بۆچـی وایـە؟ فەرمووی: (ئەی باشە نەخۆشییەكەو گەڕییەكە لـەكێوە تەنییـەوەو گەیـشت بـە یەكەم وشتر؟!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤٣}.

لە گێڕانەوەی ژمارە (٥٧٥٠)دا دەفەرموێ: (نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە هەیـەو نـە نوقلانـەی خـراپ هەیـەو نـەپێ رەشـیو بـەد قـوومی هەیـەو، نـە پاشخـستنی موحـەررەم بـۆ كـاتی صـەفەرو نـە پێشخـستنی صـەفەر بـۆ كـاتی موحەررەم هەیەو، نەماری وا هەیـە لـەناو سـكا، كـە نـاوی صـەفەر بێو لـەكاتی برسێتیدا ئازاری ئادەمیزاد بداو، لەویشەوە تەشەنە بكاو بتەنێتەوە بۆ یـەكێكی ترو نە (هامە) هەیە، كە گوایـە: ئێـسكی كوژراو ببـێ بـە مـەلێك و هەمیـشە، لـە دەوروبەری گۆڕەكەی بقێـژێنێ هـەتا كەسوكارەكەی تۆڵـەی بـستێنن!). {تـاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٣٠٤٥}.

---

[١٤٣٥] تجریـد/٥، ژمـارە: ١٨٧٧ = ٥٧١٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٤٨٦ = ٥٧٤٩ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٢٥).

ئـەم گێڕانـەوەی ژمـارە (٥٧٥٠)ی موسـلیمە لـە تەجریـدی بوخاریـدا ئەمـەی زیاترە: (لەگەڵ ئەوەیشە، ئەمە واتـای وا نییـە، کـە پـارێز لـە نەخۆشـی نـەکرێ، بەڵکوو پارێزکردنو خۆپاراستن لـە نەخۆشـیو لەپـەتاو دووربینـی لـەکاتی وادا، کاری باشو دروستە، دەی کەواتە هەتا بۆت دەکرێ پارێز لە گول بکـە، کـە گـولی دەردێکی پیسە، زوو تەشـەنە دەکا، وە لەبـەر گـول هـەڵێ، نـەبادا تـۆش تووشـی ببی هەروەك چۆن لەترسا لەبەر شێر هـەڵ دێیـت ئـاوا). {تجریـد/١٧٣/٥، رقـم: ١٨٧٧ = ٥٧٠٧، ٥٧١٧، ٥٧٥٧، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣} + {تاج/٣، زنجیرە: ٧٦، ژمـارە: ٣٠٤٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- پوختـەی قـسەی سـاخ لـەم شـوێنەدا ئەمەیـە: (ئەفـسانەو قـسەی کـۆنی سەردەمی نەزانی، بێ بایەخە، هەموو شت لە بنەڕەتدا بەدەست خودا خۆیـەتی، بـەڵام بـەپێی یاسـای ئاسـاییو بـەپێی حـاڵو عـادەتو بـاوو بـەراورد، دەبـێ بـۆ ئیحتیاطو دوور بینی، خۆت لـەدەردو نەخۆشـی بپـارێزی، نـەبادا تـۆیش تـووش ببـی، بەتایبـەتی لەنەخۆشـی خـراپ، کـە بەئـەزموون دەرکـەوتووە، لـەکاتی تێکلاویو خۆنەپارستندا، بەئاسانی لە یەکێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ یەکێ تر.

ئەمە پوختەی فەرمایشتی ئیمامی نەوەوییە لەم شوێنەدا.

٢- مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودانە دوو ئامانجی سەرەکین:

أ/ پووچکردنەوەی بیرو باوەڕی سەردەمی نەزانی، کە زۆرینەیان قسەی پـڕو پووچو ئەفسانەنو لە ڕاستیدا، هـیچ بنەمایـەکی دروسـتو ڕاسـتیان نییـە. وەك: کونە پەپوو شـوومە، کەروێـشك کوڵوڵە، قەلـەڕەش بـەد قوومـە، ڕێـوی بێـت بـە پیرتـەوە، بایـە قـووش لەشـوێنێ بخوێنـێ کـاول دەبـێ، گیـانی کـوژراو دەبـێ بـە

باڵندەیێ، لەدەوری گۆڕەکەی دەخوێنێو بانگی کەسوکارەکەی دەکا، تا تۆڵەی بستێنن، زۆر بەیتو باڵۆرەی تری لەم بابەتە.

١٤٣٦- عن أبي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «لاَ تُورِدُوا الْمُمْرِضَ عَلَى الْمُصِحِّ». [(١٤٣٦)]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەخۆش نەکرێتە ناو ساخەوە!).

## (٣٤) بابُ الطيرةِ والفألِ وَمَا يكونُ فيهِ الشُّؤْمُ
## باسی بەدبینیو نوقلانەو نوخشەی باشو پیرەشی

١٤٣٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ عَدْوَى ، وَلاَ طِيَرَةَ ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ » . قَالُوا وَمَا الْفَأْلُ قَالَ « كَلِمَةٌ طَيِّبَةٌ». [(١٤٣٧)]

بڕوانە فەرموودەی ژمارە: (١٤٣٨) کەوا لەدوا ئەم ژمارەیەوە، واتاکەی لەوێ بەتەواوی دێ.

١٤٣٨- عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لاَ طِيَرَةَ وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: «الْكَلِمَةُ

---

(١٤٣٦) تجريد/٥، ژمارە: ١٨٨٨ = ٥٧٧١ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٨٧ - ٥٧٥٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/٥٣).

(١٤٣٧) بخاری. طب: ٥٧٧٦، مسلم: ٥٧٦١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/ ٥٤).

الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ». {الحديث: ٥٧٥٩ = ٥٧٥٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٥ = ٥٧٥٤، ٥٧٥٥ فتح الباری}:(١٤٣٨)

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (نوقلانەی خراپ بایەخی نییە، باشترین نوقلانەیش نوخشە لێدانە!). گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! نوخشە لێدان وەکوو چی؟ فەرمووی: (وەك ئەوە دەتانەوێ کارێ بکەن لەکاتی نیازی کردنەکەیا، وشەیەکی باش بەرگوێتان بکەوێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٣٠٤٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ نموونە: یەکێ بچێ بۆ حەجو عەمرە، لەکاتی باسکردنی ئەو سەفەرەدا، بەرگوێی بکەوێ کەسێ ئەم ئایەتە بخوێنێ:

{فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ} ئەوە جۆرە نوقلانەیەکی باشە لەخوداوە، نیشانەی ئەوەیە کە حەجو عەمرەکەی بەنسیب دەبێ. زۆر جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ ئەرکێکی دەسپارد بەیەکێ، ئەگەر ناوەکەی بەدڵی نەبوایە پێی ناخۆش بوو، بەوێنە: ئەگەر کارمەندێکی دابنایێ لەسەر کارێ، ناوی سەرکەوت بوایە پێی خۆش بوو، بەلام ئەگەر ناوی ژێرکەوت بوایە پێی ناخۆش بوو. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٣٠٤٩ تا دوایی}.

١٤٣٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «إِنْ يَكُنْ مِنَ الشُّؤْمِ شَيْءٌ حَقٌّ فَفِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالدَّارِ». {الحديث: ٥٧٦٨ = ٥٧٦١ فم}:(١٤٣٩)

---

(١٤٣٨) تجرید/٥، ژمارە: ١٨٨٥ = ٥٧٥٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٩١ - ٥٧٥٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/٤٣).

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: {ئەگەر شوومیو بەدبوومی هەبێو هەقو راست بێ، ئەوا لەم سێ شتەدا هەیە:

**یەکەم:** ماینو ئەسپ.

**دووەم:** ژن.

**سێیەم:** خانوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ٣٠٤٧}.

١٤٤٠- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاثَةٍ فِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالدَّارِ) (الحديث ٢٨٥٨، طرفُهُ في: ٢٠٩٩=٩٥٢ت ٢٠٩٩ف)[١٤٤٠]:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەدەمی پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (نە نەخۆشی تەنینەوە هەیە، نەنوفڵانەی خراپ بایەخی هەیە، شوومیو بەدبوومی ئەگەر لەشتێکدا هەبێ، لەم سێ شتەدا هەیە: لەماینو ئەسپدا و، لەژنداو لەخانوودا) (تاج/٤/٢٣١-ز-٧٧-باسی شوومی).

لێرەدا ئاوایە: سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر شوومیو بەدبوومی هەبێ، ئەوا هەندێ جار: لەژندا هەیەو هەندێ ژن شوومەو بەدقوومە، وە هەروەها هەندێ جار لەماینو ئەسپدا هەیەو هەندێ ماین، یا

---

[١٤٣٩] بخاری. نكاح: ٥٠٩٣، ٥٧٧٢، مسلم: ٥٧٦٥ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٤٣).

[١٤٤٠] تجرید/٢، ژمارە: ١١٨١ = ٢٨٥٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٩٢ = ٥٧٦٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٤٧).

هەندێ ئەسپ شوومەو بەدبوومە، وە هەروەها لە جێگەو شوێندا هەیەو هەندێ جێگە شوومە).

وە ئەمەیش ژمارە: (١٤٩٣)ی پوختەی موسلیمە، لەگەڵ ڕوونکردنەوەیەکی ئەم بابەتە:

عَنِ جَابِرًا يُخْبِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنْ كَانَ فِى شَىْءٍ فَفِى الرَّبْعِ وَالْخَادِمِ وَالْفَرَسِ». {الحديث: ٥٧٧٣ = ٥٧٦٦ فم} :

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێ ڕەشیو شوومی ئەگەر لەشتێکا هەبێ، ئەوا لەهەندێ لەم سێ شتەدا هەیە:

١- لەخانووماڵدا.

٢- لە نۆکەرو کارەکەردا.

٣- لە ئەسپو مایندا.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (زاناکان لەم پرسی پێ ڕەشیو بەدقوومییەدا، دوو بۆچوونی سەرەکییان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** کە بەڵێ لەڕاستیدا، ئەم سێ شتە بەپێی ئەو سروشتەی کەخودا دروستی کردوون لەسەری، لەهەندێ لەمانەدا، لەسەر ڕووی ڕاستی، پێ ڕەشیو بەدقوومی هەیە، جا هەرکاتێ مرۆڤ هەستی بەشوومی یەکێ لەژنو ئەسپو ماینو نۆکەرو کارەکەر کرد، بەزوویی لێی جیابێتەوە، بە تەڵاق دان بێ، بە فرۆشتن بێ، بەهەر شێوەیێ تر بێ).

بە بۆچوونی بەندەی وەرگێڕیش، ڕووداوەکانیش ئەم بۆچوونی یەکەمە دووپات دەکەنەوە، گەرچی ڕای دووەمیش بێ بایەخ نییە.

**بۆچوونی دووەم:**

١- بەدبوونی ژن شتێکی سروشتی نییە، کەشتی وا لەچارەی نووسرابێ، بەڵکوو هەر ژنێ بیگری، کە ئەم کێشانەی هەبوو، ئەوە پێ ڕەشیو بەدقوومە: نەزۆك بێو زمان درێژبێو بەدڕەوشت بێو هۆی دڵ لێپیسکردنی مێرد بێو ماڵکەر نەبێ.

٢- شوومی ماڵو خانوو، لەوەدایە کە تەنگەبەر بێو ناخۆش بێو دراوسێی خەراپی زیانەخرۆی هەبێ.

٣- شوومی ئەسپو ماین لەوەدایە کە غەزای پێ نەکرێو بۆ کاری خێر بەکار نەهێنرێو بۆشتی دنیایی ڕووت بەکاربهێنرێ.

٤- شوومیو پێ ڕەشی کارەکەرو نۆکەریش لەوەدایە: کە خووی خراپ بێو درۆزن بێو هەرچی پێ بسپێری بەجوانی نەیکا.

ئەوەوی دەفەرموێ: زاناکان دەفەرموون، لەبارەی نەخۆشی تەنینەوەو نوقلانەو پێ ڕەشیو ئەم جۆرە شتانەوە: کۆگیرێ بۆ ئەم بابەتانە، ئەم سێ ڕێبازەیە:

١- ئەوەی کەنابێ بەهۆی زیانی ڕاستو دروست، دەبێ پشتگوێ بخرێو بایەخی پێ نەدرێ، وەك نوقلانەی خراپ (طيرة).

٢- ئەوەی زیانی ئاشکرای هەیەو بە ئەزموون زیانی چەسپاوە، دەبێ پارێزی لێ بکرێ، وەك پەتاو تاعوونو گوڵیو ... تاد.

٣- ئەوەی کە جاروبار وا چەسپاوە زیانی هەبێ، ئەوە دروستە پارێزی لێ بکرێ، وەك: ژنو ماینو خانوو.

## کورت و پوخت بەکوردی پەتی

١- پارێزو خۆپاراستن لەنەخۆشی خراپ و پەتاو شتی وا کارێ رەوایە.

٢- لەم جۆرە شتانەدا واباشە راوێژ بە پسپۆڕی ئەم بابەتانە بکرێ.

## (٣٧) بابُ قتلِ الحيَّاتِ وَغيرَها
## باسی کوشتنی مارو شتی تری لەم بابەتە

١٤٤١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ فَإِنَّهُمَا يَـطمِسَانِ الْبَصَرَ وَيَسْتَسْقِطَانِ الْحَبَلَ) (الحديث٣٢٩٧، أطرافُهُ في: ٣٣١٠، ٣٣١٢، ٤٠١٦، ٤٠١٧):[1441]

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر مینبەر ووتاری دەدا، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (هەموو جۆرە مارێ بکوژن، بەتایبەتی ئەو چەشنە مارانەی کە دوو هێڵی رەش وەك هێڵی پەلکە خورما وابەسەر پشتیانەوەو هەروا کوڵەومیباب، چونکە ئەم دوو جۆرە مارە ئاوی چاو دەبەن و سك لەباری ژن دەبەن، ئەوەندە رەزایان تاڵە وئێسکیان قورس و رەزایان بێ رەزایە، تەنانەت بەچاوپێکەوتنیان ئاوی چاو دادێ و کۆرپەلە لەبار دەچێ!) (تاج/٤ل –١٩ ز- ٥ ف –١. باسی ماری ماڵی ناوماڵ..).

ئەمەیش دەقی ژمارە: (١٤٩٧)ی پوختەی موسلیمە، دەینووسین بۆ راڤەو روونکردنەوە:

---

[1441] تجرید/٣، ژمارە: ١٣٢٩ - ٣٢٩٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٩٧ - ٥٧٨٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/١٤).

عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْمُرُ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ يَقُولُ: «اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ وَالْكِلاَبَ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَلْتَمِسَانِ الْبَصَرَ، وَيَسْتَسْقِطَانِ الْحَبَالَى». قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَنُرَى ذَلِكَ مِنْ سُمَّيْهِمَا وَاللَّهُ أَعْلَمُ. قَالَ سَالِمٌ: قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: فَلَبِثْتُ لاَ أَتْرُكُ حَيَّةً أَرَاهَا إِلاَّ قَتَلْتُهَا، فَبَيْنَا أَنَا أُطَارِدُ حَيَّةً يَوْمًا مِنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ مَرَّ بِي زَيْدُ بْنُ الْخَطَّابِ، أَوْ أَبُو لُبَابَةَ، وَأَنَا أُطَارِدُهَا، فَقَالَ: مَهْلاً يَا عَبْدَ اللَّهِ! فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَمَرَ بِقَتْلِهِنَّ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ نَهَى عَنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ. {الحديث: ٥٧٨٧ = ٥٧٨٠فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١٣٢٩ = ٣٢٩٧، ٣٣١٠، ٣٣١٢، ٤٠١٦، ٤٠١٧. أبـو داود. أدب: ٥٢٥٢. تحفة الأشراف: ١٢١٤٧}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: لـە پێغەمبـەرم بیـست، لەسـەر دوانگـە وتـاری دەدا، گـوێم لێ بـوو دەیفـەرموو: (گـشت مـارێ بكـوژن، هەروەها گشت سەگێ بكوژن، بەتایبەتی ئەو چەشنە مارانەی كەدوو هێڵی ڕەش، وەك هێڵی پەلكە خورما وا بەسـەر پـشتیانەوەو هـەروا هـەموو كوڵـە ومیبابـێ بكوژن، چونكە ئەم دوو جۆرە مارە، ئاوی چاو دەبەنو سك لەباری ژنی دووگیان دەبـەن، ئەوەنـدە ڕەزایـان تاڵـەو ئێـسكیان قـورسو گرانـەو ڕەزایـان بـێ ڕەزایـە، تەنانەت بە چاوپێكەوتنینان ئاوی چاو دادێو كورپەلە لەباردەچێ!).

زوهری (كە ئەم فەرموودەیە، لە سالمی كوڕی عەبدوڵلاوە، لە ئیبنو عومەرە، دەگێڕێتەوە) دەفەرموێ: وادەزانم كە ئەم سك لەبارچوونو ئاوی چاو بردنە، لـە كاریگـەریی ژەهـری ئـەم دوو جـۆرە مارانەوەیـە، وە خـودا بۆخـۆی باشـتری لێ دەزانێ!.

سالم دەفەرموێ: عەبدوڵلای كوڕی عومەر فەرمووی: ئیتر كە ئەمـەم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بیـست، هـەر مـارێكم دەبینـی بـوارەم نەدەدا، دەمكوشت، جارێ مارێكم ڕاودەنا تا بیكوژم، لەو چەشنە مارانە بـوو، كـە

پێیان دەگوترێ ماری ماڵی ناو ماڵ، لەو کاتەدا زەیدی کوڕی خەطاب، یا فەرمووی: ئەبو لوبابە بانگی لێ کردم: هێواش ئەی عەبدوڵڵا! مەیکوژە. گوتم: بۆچی؟ خۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەکوژتنی مار. فەرمووی: ئاخر لەوەدوا، کوشتنی ماری ناو ماڵی قەدەغە کردووە، کە بەو مارانە دەڵێن: (عَوَامِرُ البُيُوتِ: خێوی ناو ماڵ، نەبادا جنۆکەی ماڵی موسوڵمان بن). {تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٢٥٨٤ چ/٤}.

١٤٤٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَارٍ بِمِنًى، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِ ( وَالْمُرْسَلاَتِ ) وَإِنَّهُ لَيَتْلُوهَا، وَإِنِّي لأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ، وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا، إِذْ وَثَبَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « اقْتُلُوهَا ». فَابْتَدَرْنَاهَا، فَذَهَبَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « وُقِيَتْ شَرَّكُمْ كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا ». (الحديث ١٨٣٠، أطرافه ٣٣١٧، ٤٣٣، ٤٩٣١، ٤٩٣٤): [١٤٤٢]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشەوی عەرەفەدا لەمینا کە خاکی بەست (حەرەم)ە، لەئەشکەوتێکا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، سەرگەرمی حەجی ماڵاوایی بووین، لەوکاتەدا سوورەتی (والمرسلات)ی بۆهات، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی ئەم سوورەتەی بەقەدرو ڕێزەوە دەخوێندەوە، منیش وشە بەوشەو ئایەت بەئایەت لەدەمی پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) وەرم دەگرتو لەبەرم دەکرد، ئالەم کاتەدا کە هێشتا سوورەتەکە بەسەر زاری پێغەمبەرەوە بوو، وە دەمی پیرۆزی پێی تەڕو پاراو بوو، لەپڕ لەناکاو مارێ دەرپەڕیو پەلاماری داین!.

---

[١٤٤٢] تجرید/٢، ژمارە: ٨٤١ = ١٨٣٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٩٩ = ٥٧٩٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٧٧).

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی بیکوژن، بەڵام مارەکە دەرباز بوو، رۆیشت بۆمان نەکوژرا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەم ئەو قوتاری بوو لەچنگی ئێوەو هەم ئێوە قوتار بوون لەوەزنی ئەو!. (تاج/٢٣٤/٧ ز/٦٠ – ش).

ئەمەیش ژمارە: (١٤٩٩)ی پوختەی موسلیمە، روونکردنەوەی زۆر جوانی واتیادا:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي غَارٍ وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ (وَالْمُرْسَلاَتِ عُرْفًا) فَنَحْنُ نَأْخُذُهَا مِنْ فِيهِ رَطْبَةً إِذْ خَرَجَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ: «اقْتُلُوهَا»، فَابْتَدَرْنَاهَا لِنَقْتُلَهَا، فَسَبَقَتْنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «وَقَاهَا اللَّهُ شَرَّكُمْ كَمَا وَقَاكُمْ شَرَّهَا». {الحديث: ٥٧٩٦ = ٥٧٨٩ فم. تجريد/٢/٢٤١، رقم: ٨٤١ = ١٨٣٠، ٣٣١٧، ٤٩٣١، ٤٩٣٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشەوی عەرەفەدا، لەخاکی مینادا، لە ئەشکەوتێکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا، سوورەتی (وَالْمُرْسَلاَتِ)ی هات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ئەم سوورەتەی بەقەدرو رێزەوە دەخوێندەوەو منیش وشە بەوشەو ئایەت بەئایەت، لەدەمی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وەرم دەگرت‌و لەبەرم دەکرد، جا لەمکاتەدا کە هێشتا سوورەتەکە بەسەر زاری پێغەمبەرەوە بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) وەدەمی پیرۆزی پێی تەڕو پاراو بوو، لەپڕ لەناکاو، مارێ دەرپەڕی‌و پەلاماری داین!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی بیکوژن! بەڵام مارەکە دەرباز بوو رۆیشت، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ)

فەرمووی: (هەم ئەو فوتاری بوو لەچنگی ئێوەو هەم ئێوە فوتارتان بوو لەچنگی ئەو!). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٤١٩٩ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

لەپەڕاوی ڕاڤەکانا دەفەرموون: (جنۆکەو پەریو شەیاتینی، خودای گەورە توانای ئەوەی پێیان داوە، کە شکلو شێوەی خۆیان بگۆڕنو بچنە شێوەو شکڵو بیچمی شتی ترەوە، جاری واهەیە لەشێوەی مارێکا خۆیان نیشان دەدەن، یا لەشکڵی دووپشکێکا دەردەکەون، یا لەوێنەی پشیلەیەکا خۆی پیشان دەدا، یا لەهەر شێوەیەکی تردا، خۆیان دەنوێنن! تەنانەت دەتوانن بچنە کلێشەی مرۆڤەوە!).

جا پاش ئەمە ئەوەوی دەفەرموێ:

١- ئەم ئاگاداریو هەڕەشەیە، کە لەجنۆکەی ناو ماڵ دەکرێ، تا سێ جار، بەس بۆشاری مەدینە وایە، لەشوێنانی تر، هەموو مارێ بەبێ هۆشیاری پێدانو هەڕەشە کردن لێی دەکوژرێ.

٢- مارو دووپشك، بەبێ بوارەدان، لەدەشتو دەر دەکوژرێن. ئەوەوی دەفەرموێ: ئیمامی مالیك دەفەرموێ: بەبێ مەرجو قەید ماری ناو مزگەوت دەکوژرێ.

٣- شێوەی هەڕەشەکە ئاوایە: (سوێندتان دەدەم بەو پەیمانەی کە سولەیمانی کوڕی داوود لێی وەرگرتوون، کە ئازارمان مەدەنو مەیەنە بەرچاومان!). ئیمامی مالیك دەفەرموێ: (ئەوەندە بەسە کەبڵێ: (بەپشتی خودا، بەحەقی ڕۆژی قیامەت تەنگتان پێ هەڵ دەچنم، کە مەیەنە بەرچاومانو ئازارمان مەدەن!).

## (٣٨) بابُ إستحباب قتلِ الوَزَغِ
## كوشتنی شەوگەرد سوننەتە

١٤٤٣- حديث أُمَّ شَرِيكٍ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَمَرَهَا بِقَتْلِ الأَوْزَاغِ: (١٤٤٣)

ئوم شەریك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم کرد کە شەوگەرد بکوژم).

لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە: (١٣٥٠)دا ئاوایە:

عَنْ امِّ شَرِيكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) امَـرَ بِقَتْلِ الْوَزَغِ وَقَالَ: (كَانَ يَنْفُخُ عَلَى ابْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلام) (الحديث: ٣٣٥٩، طرفه في:٣٣٠٧):

ئوم شەریك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خواد (دروودی خودای لێ بێ) فەرمانی دەکرد بەکوشتنی شەوگەرد ودەیفەرموو: کاتێ مەنجەنیقەکەیان دانا بۆ حەزرەتی ئیبراهیم شەوگەرد فووی لە ئاگرەکەی دەکردو بەفوو ئاگرەکەی خۆش دەکرد.

### راڤەو شیکردنەوە:

شێخی ئیبن حەجەری عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە(اصابة) دا دەفەرموێ: ئوم شەریك دەوسیەو بەنهێنی لە مەککە موسوڵمان دەبێ، وەبەنهێنی پەیوەندی بەژنانی قورەیشەوە دەکاو بەرەبەرە لێیان موسوڵمان دەکا، کاتێ خەڵکی بەمە دەزانن، پێی دەڵێن: لەبەر هۆزەکەت نەبێ واوامان لێ دەکردی، بەڵام دەتبەینەوە بۆ ناو هۆزەکەت، ئوم شەریك دەفەرموێ: جا

(١٤٤٣) تجرید/٤، ژمارە: ١٣٥٠ = ٣٣٥٩، ٣٣٠٧، مسلم: ٥٨٠٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/١٥).

بەسواری وشترێکی پشت ڕووت بردمیانەوە، سێ شەوو سێ ڕۆژ نان و ئاویان نەدا پێم، بەرەبەرە گوێم لەهیچ نەما، تا لەهەواری لایان دا، دەستووریان وابوو، کە لەشوێنێ لایان دەدا، لەبەر خۆرەکە منیان توند توند دەبەستەوەو خۆشیان دەچوونە بەر سێبەرو سێبەریان بۆ خۆیان دەکرد و نان و ئاویان لێ قەدەغە دەکرم، هەتا باریان دەکردەوە.

لەکاتێکدا کە ئەمە حاڵم بوو، وام هەست کرد کە شتێکی تەڕی فێنك وابەسەر سەرمەوە، لەپاشا شتەکە نەما، دیسانەوە ئەو شتە هاتەوە، جا دەستم بردو هێنام، دەبینم جەوەنەیێ ئاو بوو، کەمێکم لێ خواردەوە، بەلام دیسانەوە بەرزبووەوەو نەما، کەچی دووبارەو سێ بارە چەند جارێتر دەهاتەوەو بەرزەوە دەبوو، هەموو جارێ کەمێکم لێ دەخواردەوە، تا تێراو بووم، لەپاشا ئەو ئاوەی لەجەوەنەکەدا مابوو کردم بەسەر جەستەمو جلەکانم دا، جا لەخەو خەبەریان بۆوە، کاتێك ڕوانییان من سەرو لەش‌و جلەکانم تەڕەو، تەواو گەش بوومەتەوە، گوتیان: دیارە خۆت کردۆتەوەو جەوەنەکانی ئێمەت بەکارهێناوەو لێیانت خواردۆتەوە، منیش گوتم نەبەخودا شتی وام نەکردووە، بەڵام ڕاستی ڕووداوەکە خۆی واو وایە، گوتیان: ئەگەر قسەکەت ڕاست بێ ئایینەکەی تۆ لەئایینەکەی ئێمە باشترە، کەتەماشایان کرد، کوندەو جەوەنەکانی خۆیان وەك خۆیان مابوون کەمیان نەکردبوو، ئیتر هەموو موسوڵمان دەبن ئەوجا ئوم شەریك دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لە مەدینە.

ئوم شەریك یەك فەرموودەی لەصەحیحی بوخاریدا هەیە کە ئەم فەرموودەی ئێرمیە، کەسەعیدی کوڕی موسوییەب لەوەوە گێڕاویەتەوە، لە فەتحولباریدا مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: ئوم شەریك ناوی غوزەییەیە، گوتراوە: ناوی غوزەیلەیە، ئەم زاتانە لەپەیڕەوان، واتە لەچینی دووەمی موسوڵمانان کەبەعەرەبی پێیان دەگوترێ تابعین، فەرموودەی پێغەمبەریان لەم

ژنـه بـەرێزە وە كـەهاورێ و صـەحابەی پێغەمبـەر بـووە گێڕاوەتـەوە: سـەعیدی كـوڕی موسـەییب و عـورووەی كـوڕی زوبـەیر (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای گـەورە لەهەموویان بێت).

مامۆسـتای عـەینی (ڕەحمـەتی خـودای لەسـەر بێـت) لێـرەدا دەفـەرموێ: (هەندێ لەحەكیمەكان دەڵێن وەزەغ: واتە: شەو گـەر (د) كـەرە، ناچێتە شوێنێ زەعفەرانی تێدا بێت، لەدەمەوە جووتە ئـەگرێ، وە هێلكە دەكا، بەگەورەكـەیان دەگوترێ: (سامّ ابرص) لەحاجەتو شتی وادا دەتفێتەوە بەهۆی ئـەوەوە زیـانێكی زۆر لەمرۆڤ دەكەوێ، كاتێ خـوێی دەسـت دەكـەوێ خـۆی تیـا دەگـەوزێنێ، ئـەوە دەبێ بەهۆی كەوتنەوەی گولی وە وەك مار لەزستانا چوار مانگ سڕ دەبێ و لـەو ماوەیـەدا لـەكونێكا بـەبێ خـواردن حـەپس دەبێ وە لەگـەڵ مـارا زۆر هـۆگری یەكترین، هەروەك چۆن دووپشك و قۆلانچە هۆگری یـەكترین!... تـەواو) شـێخی خـاڵ (ڕەحمـەتی خـودای لـێ بـێ) لەفەرهـەنگی خـاڵ دا دەفـەرموێ: (شـەوگەرد دەعبایەكە وەك مارمێلكە، بەڵام ئەم پێوە دەدا).

١٤٤٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ لِلْوَزَغِ « فُوَيْسِقٌ ». وَلَمْ أَسْمَعْهُ أَمَرَ بِقَتْلِهِ. (الحديث ١٨٣١، طرفه ٣٣٠٦): [١٤٤٤]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبـەر دروودی خـوا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خـوا لەهاوسـەرانی بـێ فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـەبارەی شـەوگەردەوە فـەرمووی: (شـەوگەرد جانـەوەرە زیانـە خۆرۆیانەیـە كـە وەزەنو

---

[١٤٤٤] تجرید/٢، ژمارە: ٨٤٢ = ١٨٣١ بخاری، مسلم: ٢٢٣٩ محمد فؤاد = ٥٨٠٦ مسلم/شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٨ رقم الباب/٧).

زيانيان لەڕادە بەدەرە، عائيشە فەرمووی: بەڵام لەپێغەمبەرم نەبيستووە كە دەستووری كوشتنی شەوگەرد دەربكات). (بڕوانە: تاج/١٨/٤ ز/٤).

**راڤەو شيكردنەوە:**

مەبەست لەوەی كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەشەوگەرد دەفەرموێ: لەڕادە دەرچووە ئەوەيە كە كوشتنی لەخاكی بەست (حەرەم)و لەخاكی نابەست (حل)دا دروستە، هەتا بۆ ئيحرام داريش چونكە پێشەوا بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەيەی لە صەحيحی بوخاريدا، بەم ناونيشانەيە گێڕاوەتەوە: (باب ما يقتل المحرم من الدواب / باسی ئەو جانەوەرانەی كە دروستە بۆ ئيحرام دار بيان كوژێ). (بڕوانە: رياض/١٣٥٩/٤).

**(٣٩) بابُ النَّهي عَنْ قَتْلِ النَّمْلِ**
**ڕێگريی لە كوشتنی مێروولە**

١٤٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (قَرَصَتْ نَمْلَةٌ نَبِيًّا مِنْ الأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَحْرَقْتَ أُمَّةً مِنْ الأُمَمِ تُسَبِّحُ) (الحديث ٣٠١٩، طرفهُ في: ٣٣١٩)؛[١٤٤٥]

ئەبوهورەيرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەخۆشەويست (درودی خوای لەسەر بێ) دەيفەرموو: (جارێ مێروولەيێ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەكان دەگەزێ، پێغەمبەرەكە فەرمان دەدا شارە مێرولەكە هەموو

[١٤٤٥] تجريد/٣، ژمارە: ١٢٣٦ - ٣٠١٩ بخاری. مسلم: ٢٢٤١ ترقيم محمد فؤاد لصحيح مسلم = ٥٨١٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٥٣).

دەسوتێنن، جا خودا لەسەر ئەوە گلەیی لێ دەکاو سروشی بۆ دەنێرێ، خۆ تۆ تاقە یەك مێروله گەستتی کەچی نەتەوەیەکت لەنەتەوەکان سەر تۆپ سووتاند کە حاڵیان وابوو تەسبیحاتو سوپاسو ستایشی خوایان دەکرد) (تاج/٤ل -١٥ز-٤ گیانلەبەرێ کوشتنی قەدەغەبێ).

## (٤٠) بابُ تحريم قَتْلِ الهِرَّةِ
## کوشتنی پشیلە ناڕەوایە

١٤٤٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ، سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَسَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا، وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ». {الحديث: ٥٨١٣ = ٥٨٠٥ فم. بخاري. بدء الخلق: ٣٤٨٢} : [١٤٤٦]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژنێ لەسەر پشیلەیێ سزادراوە، پشیلەکەی بەند کردبوو، هەتا لەبرسانا مردبوو، لەو ماوەیەدا نەخۆی ئاوو نانی دابوو پێی، وەنە بەرەڵای کردبوو هەتا بۆخۆی لەچرو جانەوەری ناو زەوی بخوات لەسەر ئەوە خودا خستیە ناو ئاگری دۆزەخەوە). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠٠}.

[١٤٤٦] بخاری. بَدْءُ الخَلْقِ: ٣٤٨٢ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٠٢ = ٥٨١٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠. رقم الباب/٥٤).

## (٤١) باب فضل ساقي البهائم المحترمة وإطعامها

## خێری خۆراکو ئاودان بە ئاژەڵی بەستەزمانی خاوەن ڕێزوی شەرعی

١٤٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَإِنَّ لَنَا فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ لأَجْرًا؟ فَقَالَ: «فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ». {الحديث: ٥٨٢٠ = ٥٨١٣ فـم. تجريد/٣، رقم: ١٠٣٨ = ٢٣٦٣ فتح الباري} : [١٤٤٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ لە چۆڵێ بە ڕێگەیەکا دەڕۆیشت، توونێتی زۆری بۆ هێنا، تا بیرێکی دۆزییەوەو چووە ناویو تێر ئاوی خواردەوە، کاتێ هاتە دەرەوە ڕوانی وا سەگێ لەتوونیانا وازمانی دەرکێشاوەو هاسکە هاسکیەتیو، لەتاوا تەڕایی دەوری بیرەکە دەلێسێتەوە، جا پیاوەکە، لەبەرخۆیەوە دەڵێ: ئەم سەگەیش لە توونیانا وەکوو منی بەسەرهاتووە! جا دیسانەوە ڕۆیشتەوە خوارەوە بۆناو بیرەکەو کاڵە (خوففە)کەی پێی داکەندو پڕی کرد لەئاوو، گرتی بەدەمیەوەو بەدیواری بیرەکەدا هەڵزنییەوەو سەرکەوتەوە سەرێو سەگەکەی ئاودا، جا خودا لەسەرئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆیکردەوەو لێی خۆش بوو!)

---

[١٤٤٧] تجرید/٣ ژمارە: ١٠٣٨ = ٢٣٦٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٠٥ = ٥٨٢٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٢، رقم الباب/٩).

هاوەڵان عەرزیانکرد: قوربان ئەی فروستادەی خودا! ئەی رەوانەکراوی خودا! ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە هەر چاکەیێ لەگەڵ گیانلەبەری بێزمانا بکەین، خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ وایە، هەرچاکەیێ لەگەڵ هەرشتێ بکرێ کە تەڕایی ژیانی تیابێ خێرێکی گەورەیە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٧، ژمارە: ١٩٣٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ( پوختەیەکی کورتی نامەی مار )

١- جۆرە مارێکی تایبەت هەیە، وەك کوڵە ومیباب، لەهەر شوێنێ بینران، سوننەتە بکوژرێن‌و مۆڵەت‌و مەودای دەربازبوون نەدرێن.

٢- مارو دووپشك‌و جانەوەری تری زیانە خرۆ، لەدەشت‌و دەر، بەبێ مەرج دەکوژرێن.

٣- ماری ناو ماڵ، بەتایبەتی ئەوانەیان کەپێیان دەگوترێ: (عَوَامِرُ البُيُوتِ = خێوی ناو ماڵ) واباشە تا سێجار، کە دەردەکەون، هۆشیار بکرێنەوە کە ماڵەکە چۆڵ بکەن، دەنا دەکوژرێن، جا ئەگەر پاش سێ جارەکە دەرکەوتن، ئەوا دەکوژرێن بەبێ مەرج.

٤- کوشتنی شەوگەرد سوننەتە، چونکە زیانی زۆرە.

٥- کوشتنی میروولە بەبێ هۆی رەوا ناباشەو حەرامە، دەبێ مرۆی موسوڵمان لەشتی وا خۆی بپارێزێ، جۆرێ لە مێروولە پێوە دەدا.

١٤٤٨- وعنه أن رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بطَرِيقٍ اشْتَدَّ عليْهِ الْعَطشُ، فَوجد بِئراً فَنزَلَ فيها فَشَرِبَ، ثُمَّ خرج فإذا كلْبٌ يلهثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فقال الرَّجُلُ: لَقَدْ بلَغَ هَذَا الْكَلْبُ مِنَ العطشِ مِثْلَ الَّذِي كَانَ قَدْ بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَملأَ خُفَّه مَاءً ثُمَّ أَمْسَكَه بِفيهِ، حتَّى رقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ،

فَشَكَرَ اللّٰهُ لَه فَغَفَرَ لَه. قَالُوا: يا رسولَ اللّٰه إنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْراً ؟ فَقَالَ: (فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ) متفقٌ عليه. وفي رواية للبخاري: (فَشَكَر اللّٰه لَهُ فَغَفَرَ لَه، فَأَدْخَلَه الْجَنَّةَ). وفي رواية لَهُما: (بَيْنَما كَلْبٌ يُطيف بِركِيَّةٍ قَدْ كَادَ يقْتُلُه الْعطَشُ إِذْ رأَتْه بغِيٌّ مِنْ بَغَايا بَنِي إِسْرَائيلَ، فَنَزَعَتْ مُوقَهَا فاستَقت لَهُ بِهِ، فَسَقَتْهُ فَغُفِر لَهَا بِهِ)): [1428]

دیسان له ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پیاوی لە چۆڵێ، بەڕێگایەکا دەڕۆیی، توونێتی زۆری بۆ هێنا، تا بیرێکی دۆزییەوەو چووە ناوی‌و ئاوی خواردەوە، کە هاتە دەرەوە، ڕوانی وا سەگێ لە تووینیانا زمانی دەرکێشاوەو هاسکە هاسکێتی‌و لەتاوا تەڕایی دەورو بەری بیرەکە دەلێسێتەوە، جا پیاوەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەم سەگەیش لە تووینیانا وەکو منی بەسەر هاتووە! جا دیسانەوە ڕۆیشتە خوارەوە بۆناو بیرەکەو کاڵە (خوففە)کەی خۆی پڕ کرد لە ئاوو گرتی بە دەمیەوەو سەرکەوتەوە سەرێ‌و سەگەکەی ئاودا، جا خودا لەسەر ئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆ کردەوەو لێی خۆش بوو.

یارانیش گوتیان: ئەی ڕەوانەکراوی خودا دیارە هەر چاکەیێ لەگەڵ گیانلەبەری بێ زمانا بیکەین خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ هەر چاکەیێ لەگەڵ هەر شتێ بکرێ، کە تەڕایی ژیانی تیا بێ خێرێکی گەورەیە (ش). لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا (ڕەزای خودای لەسەر بێ): جا خودا لەسەر ئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆ کردەوەو لێی خۆش بوو، وە ناردی بۆ بەهەشت.

لە گێڕانەوەیەکی شەیخەین (بوخاری موسلیم)دا: جارێکیان سەگێ لەدەوری بیرێ دەخولایەوە، خەریك بوو توونێتی بی کوژێ، لەو دەمەدا ژنێکی

---

[1428] بخاری/٢٣٦٣. مسلم/٢٢٤٤، ٢٢٤٥ - ٥٨٢١ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠، رقم الباب/٥٤).

داوێن پیس- لەنەوەی ئیسرائیل- چاوی بەحاڵی کەوتو کاڵەکەی خۆی لەپێ داکەندو بەکاڵەکەی ئاوی بۆ هەڵ گۆزیو ئاوی دایە، خودا بەوە لێی خۆش بوو.

## پوختەی نامەی نزاو نووشتە

**یەکەم:**

أ/ لە تەجریدی بوخاریدا، کە ناوداره بە (مختصر صحیح البخاری) بابەتێکم نووسیوه، لەکۆتایی فەرموودەی ژمارە: ١٠٠٦وە، ئەگەر تەماشای بفەرموون جێگەی خۆیەتی.

جا والێرەدا بۆ تەواوکەری ئەو بابەتە ئەم فائیدەیە لەهەمان سەرچاوەوە، کە پەڕاوی (بَيْنَ يَدَى كِتَابِ الله)یە، لەپاش بەکوردی کردنی، بەکورتیو پوختی ڕاگوێز دەکەم، ئومێدەکەم کە خودای گەورە بیکا بە سەرچاوەی قەبووڵی نزای نزاکاران:

**١/ دەستوورەکانی نزاو نووشتەو دووعا:**

١- رووکردنە رووگە.

٢- لەشی پاك بێ.

٣- دەستی بەدەستنوێژەوە بێ.

٤- جلو بەرگی پاك بێ.

٥- هەردوو دەستی بەپاکی هەتا ئاستی هەردوو سەرشانی هەڵبڕێ، وەك کەسێ لەئاودا نوقم بووبێو دەست درێژبکا بۆلای خودا لێی بپاڕێتەوە، کە رزگاری بکاو نەهێڵێ بخنکێ.

٦- نزاو یادو زیکردو دووعاو نووشتەکە بەنهێنی بێ، مەگەر هۆیەك هەبێ بۆ دەنگ هەڵبڕین، وەك ئەوە کۆمەڵێ لەدوا ئەوەوە هەمان زیکر، یا هەمان پاڕانەوەو نزابکەن، لەکاتی وادا واباشە بەدەنگی بەرزبێ.

٧- لەسەرەتاوە بە حەمدو سوپاسو ستایشی خودا دەست پێ بکا، وەك گوتنی زیکری (الباقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ) کە ئەمەیە: (سُبْحَانَ اللّـهِ، وَالْحَمْدُ لِلّـهِ، وَلاَ إِلَـهَ إلاَّ اللّـهُ، وَاللّـهُ أكْبَـرُ). وەهەروەها بە صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر، لەپاش سوپاسی خودا، دەست پێ بکا.

٨- کۆتایی نزاو پاڕانەوەکەیش بە سوپاسی خوداو صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر کۆتایی بێت.

٩- لەدوا دواییدا بڵێ (ئامین).

١٠- زۆر ورك بگرێ لەکاتی نزاکردنەکەدا، بەکوڵی دڵ بپاڕێتەوە.

١١- دڵی لای نزاو پاڕانەوەکەی بێ.

١٢- بەری دەستی بکاتە ئاسمانو وەك سوالکەر هەردوو لەپی پان بکاتەوە، وەك کەسێ لەدۆستێ دیارییەك وەربگرێ. ئەمە لەکاتێکا بەری دەستی بکاتە ئاسمان، کەداوای شتێ باش لەخودا بکا، بەڵام ئەگەر داوای ئەوەی لێ دەکرد، کە بەڵایەکی لەسەر لابەرێ، واباشە پشتی دەستەکانی بەکراوەیی بکاتە ئاسمان.

١٣- بەجەختو بە باوەڕی تەواوەوە داواکەی پێشکەش بە بارەگای زاتی پەروەردگاری هەرە پاكو پیرۆز بکا.

١٤- لەپێشا بەخودی خۆی دەست پێ بکا، لەمەدا حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خودای لەسەر بێ) بکا بەسەر مەشق، کە دەفەرموێ: (رَبَّنَـا اغْفِـرْ لِـي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلمُؤْمِنِين يَوْمَ يَقُومُ الحِسَابُ – ١٤/١١).

واتە: ئەی پەروەردگارمان! لەخۆم خۆشبە، لەدایكو باوکم خۆشبە، لەسەرجەمی موسوڵمانان خۆشبە، لەو رۆژەدا کە حیسابو لێپرسینەوە بەرپا دەبێ).

١٥- چەند جارێ نزاکە دووبارە بکرێتەوە، واباشە تا سێ‌جار، دەقی نزاکە دووبارە بکرێتەوە، گشت جارێ کەدەمیکا.

١٦- واباشە ئەگەر دەکرا، بەو نزایانە نزا بکرێ، کە لەقورئان‌و سوننەتدا هاتوون، وە دەقەکەیان پیت بەپیت بگوترێ، کە ئەمە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (الإقتصار على اللفظ الوارِدِ في القرآن والسنة بحروفه). یا دووعای مەئثوور.

١٧- باوەڕی تەواوت وابێ کە نزاو پاڕانەوەکەت گیرایە ئەگەر مەرجەکانی گیرابوونیان هاتە جێ کە ئەمانەن:

١٨- خۆراکی پاك‌و حەڵاڵ، پاکخۆرو حەڵاڵ خۆر.

١٩- خۆپاراستن لەشتی نادروست‌و ناڕەواو لە زوڵم‌و زۆرو تاوان.

٢٠- ئەرکە ئاینییەکان بەجوانی بەجێ بهێنرێ.

٢١- پاکی لەش‌و دەروون‌و دەرەوەو ناوەوە.

٢٢- هەڵبژاردنی کاتی باش‌و دۆخی باش‌و جێگەی باش بۆ نزاو پاڕانەوەو نووشتەو بەرزکردنەوەی داوا بۆلای خودا، وەك: رۆژی هەینی، نێوانی بانگ‌و قامەت، بەتایبەتی سێیەکی کۆتایی شەوو دەمەو سەحەرو مەلا بانگدان، لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکان، لەناو کڕنووشدا، لەناو قونووتدا، کە لەنوێژی بەیانی‌و لەنیوەی دوایی رەمەزاندا دەخوێنرێ، یا لەوەتری مانگی رەمەزاندا دەخوێنرێ، لەسەرەتاوە تاکۆتا.

٢٣- بۆنەکانی نزاو پاڕانەوەو نووشتە هەر زۆر زۆرن، هەموو کون‌و قوژبنێکی ژیان دەگرنەوە، لەچرکە ساتی لەدایکبوونەوە، هەتا ئەو دەمەی دەچینەوە ناو دوو تۆی خاکی دایکمان! لە ناونان‌و حەوتمەوە دەست پێ دەکات، هەتا نوێژی تەرم‌و تەڵقینی مردوو.




٢٤- واباشه نزا هەمیشه دووباره بکرێتەوه، لەڕۆژەکانا، له هەینییەکانا، هەتا گیرا دەبێ، مرۆڤ لەکردنی کۆڵ نەدا.

٢٥- نزاو پاڕانەوەو نووشته جۆری زۆره، به نووسین دەبێ، بەگوتن دەبێ، به نوێژدەبێ وەك نوێژی ئیستخارەو نزاو نوێژی گیرابوونی مرازو نوێژه بارانەو ناو قوونووتو ناو تەحیات.

٢٦- واباشه لەکاتی کردنی نووشتەو نزادا، که بەئومێدی گیرابوونی مرازبێ ئەم سێ شته یەك بگرن: (قول وفیعلو صەدەقه: گوتنو کردارو خێر!).

٢٧- هەموو نزاو نووشتەیێ که بەناوی خوداو نیشانه جوانەکانی بێ دروسته، وه هەموو جۆره نووشتەو نزاو پاڕانەوەیەکی تر، با مەئثووریش نەبێ، بەمەرجێ بۆنی بتپەرستیو بێباوەڕیو جادووبازیی لێ نەیێ دروستەو کارێ باشه، ئیتر نووسراوبێ یا خوێندراو جیاوازی نییه.

٢٨- هەڵگرتنی نووشته، بەهەر شێوەیێ بێ دروسته، بەمەرجێ نووشتەکه لەزاتی خۆیدا ڕەوابێ، عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص وایدەکرد {بڕوانه: تاج/٣، زنجیره: ٧٤، ژماره: ٣٠٣٣}.

**دووەم:**

١- لەکاتی نەخۆشیو ترسو وەسوەسەو شتی وادا نزاو دووعا سوننەته، پەنا گرتن بەخودا لەشەڕی دروستکراوانی خۆی سوننەته.

٢- نووشتەو نزای خراپ، ئەگەر بەنووسین بوو، کاتێ دەدۆزرێتەوه واباشه یا بسووتێنرێ، یا بکرێ بەژێر خۆڵەوه، تا مەردوم لەزیانی بەدووربنو شەڕ نەورووژێنرێ.

٣- کرێو سەر قەڵەمانەی نووشتوو حەڵاڵه.

٤- نووشتەی تایبەت بۆهەندێ نەخۆشیو پەتا هەیه.

٥- چاوێنی راستەو چاوەزارکردن سوننەتە.

٦- دروستە هەندێ شتی تایبەت بەکاربهێنرێن لەکاتی نووشتەکردندا، وەك: تفو تەڕایی دەمو خۆڵو بۆنی خۆشو ئاوی زەمزەمو هەنگوین، وەك: کاتی ناونانو، ئاوی دەستنوێژو خۆشۆردن لەگەڵ نووشتووی تایبەت. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٩٩٨} و دەستهێنان بەشوێنی ئازارداو تەکاندنو...هتد.

٧- درووستە لەگەڵ نزاو نووشتەکردندا، داو دەرمانیش بەکاربهێنرێن، هاموشۆی پزیشك بکرێ، هەموو هۆیەكو ڕێگەیەکی ڕەوا بۆ گەیشتن بەمەبەست بگیرێتە بەر. دوعاو نزا بەبێ پەیرەوی ئەم دەستوورو مەرجانەیش دروستەو زۆر باشە.

## ٤٠- كتَابُ الألفَاظِ مِنَ الأدَبِ وَغيْرِهَا
## نامەی کۆمەڵێ وشەی ئەدەب
### (١) باب النهي عن سب الدهر

١٤٤٩- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْذِينِي ابْنُ ادَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَانَا الدَّهْرُ بِيَدِي الامْرُ اقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ( الحديث ٤٨٢٦- طرفاه في: ٦١٨١- ٧٤٩١ ):

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: ( خوای گەورەو سەروەر دەفەرموێ : ئادەمیزاد ئازاری من دەدات، کاتێ جنێو بە چەرخ وبەگەردون دەدا، وەکوو ئەوەی کاتێ کەسێ هەست بە ئێش وئازارێ دەکا، لە داخی دڵی خۆی ناسوپاسی دەکا ودەڵێ: ئەی فەلەك واو وات لێ بکرێ، یادەڵێ: ئەی گەردونی چەپ گەرد ! بزانن گەردوون یا فەلەك، یا چەرخ، هیچی بەدەست نییە، ئەوەی کە ئێوە نیسبەتی لە گەردوون دەدەن ودەڵێن : گوایە هەموو کاروبارێ، چەرخ وگەردوون هەڵی دەسوڕێنێ ئەوە وا نییە، بەڵکوو من خۆم هەموو شتێ هەڵ دەسوڕێنم، گەردوون وەك هەموو شتێکی تر من دروستم کردووە، ئەو چی بەدەستە، هەموو کارو بارێ بە دەستی خۆمە، خۆم ئەم شەو ورۆژەم دروست کردووە، خۆم تاو وتوێیان دەکەم و دەیان هێنم ودەیانبەم ) (تاج/٧ ل/١٣٦ ز/٢٨ - سوورەتی جاثیة ژ/١).

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِى ابْنُ آدَمَ يَقُولُ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَلاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنِّى أَنَا الدَّهْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا». {الحديث: ٥٨٢٥ = ٥٨١٨ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٤، رقم: ١٦٩٤ = ٤٨٢٦، ٦١٨١، ٧٤٩١} :

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (خـودای گـەورەو سـەروەر دەفـەرموێ: ئـادەمیزاد ئازاری من دەدات، کاتێ جنێو بە چەرخو گەردوون دەدات، وەك کاتێ هەسـت بـە ئێشو ئـازارێ دەکـا، لـەداخی دڵـی خـۆی نـا سوپاسـی دەکـاو دەڵـێ: داخ لەدەسـت زەمانـە، ئـەی فەلـەك واوات لێ بـێ، ئـەی گـەردوونی چـەپگەرد! ئـەی ڕۆژگـاری ناهەموار نائومێد خۆت!

دەی باکەستان ئەم جۆرە قسانە نەکاو نەڵێ: ئەی فەلەك! کۆسـتت کـەوێ، بەشت نائومێدی بێ، چونکە گەردوون، یا فەلـەك، یـا چـەرخ، یـا ڕۆژگـار، هیـچی بەدەست نییە، ئەوەی کە ئێوە دەیدەنـە پـاڵ گـەردوونو ڕۆژگـارو دەڵـێن: گوایـە هەموو کاروباری، چەرخو گەردوون هەڵی دەسووڕێنێ ئـەوە وانییـە، بـەڵکوو مـن خـۆم هـەموو شـتێ هـەڵ دەسـووڕێنم، گـەردوون وەك هـەموو شـتێکی تـر مـن دروستم کردووە، ئەو چی بەدەسـتە، هـەموو کـارێ بەدەسـتی خۆمـە، خـۆم ئـەم شەوو ڕۆژەم دروست کردووە، خۆم تاوتوویان دەکـەمو بـەردەوام، بـە شـێوەیەکی ڕێـكو پێـك، بەشـوێنی یـەکا دەیـانهێنمو دەیانبـەم! وە هـەرکاتێ ئـارەزوو بکـەم دەیان پێچمەوەو نایانهێڵم). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٤٠٩١ ج/٤}.

## ڕوونکردنەوە:

وشەی ڕۆژگارو چـەرخو گـەردوونو فەلـەك، هـەر یەکـەیان بـەپێی دانـانی زەمـانو زەمانـەوانی، واتـای تایبـەتی خـۆی هەیـە، لەسـەر ڕووی ڕاسـتینە، بـەڵام لەهەمان کاتا، بە مەجازیش بەزۆر واتای تر دەگوترێنو هەر لەکۆنـەوە گلـەییو سەر زەنشتو سەرکۆنە لە چەرخو گەردوونو زەمانەو ڕۆژگاری ڕەشو چەرخی چەپگەرد کراوەو دەکرێ. وە لەم لایەنەوە زانایان دەفەرموون:

١- بیرو باوەڕو ڕەفتاری سەردەمی نەفامی، بەشێوەیەکی سەرەکی دەبن بەدوو بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** هەڵەی رووتەو ئیسلام قەدەغەو نادروستی کردووەو بەهیچ شێوەیێ دروست نییە، کاری پێ بکرێ، وەك: فرە خوایی‌و کاریگەری بورج‌و ئەستێرەو فاڵچێتی‌و پەرستنی بت‌و دارو بەردو خۆرو مانگ یا وەك: مارەکردنی خوشك‌و باوەژن‌و مەحرەم‌و ژنهێنانی بێ سنوور، یا وەك: خواردنی سوودو قومارو ئارەق‌و خوێن‌و مردارو زیندە بەچاڵکردن!

**بەشی دووەم:** فرە واتایە، واتای جیا جیا هەڵ دەگرێ، ئەمانەیش وەك جنێودان بە زەمانەو بە رۆژگارو بەگەردوون، یا وەك: حەج‌و عەمرەو ژنهێنان‌و ژن تەڵاقدان‌و ظیهارو رێزی مانگەکان.

ئەم بەشەیان بەواتای سەردەمی نەفامی، لە ئیسلاما نادروست‌و تاوان‌و ناڕەوان، وەك: کەسێ باوەژنی خۆی مارەبکا بۆ خۆی، یا کار بە ئەزلام بکا، یا هامووشۆی فاڵچی‌و کۆڵەنانی‌و فالگرەوە بکاو باوەرشی پێ بکا، یا بەبێ شمار ژنی خۆی تەڵاق بداو دوایی بیگێڕێتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی، یا ژن بەژن بکا لەسەر شێوازی نەفامی. بەڵام ئەم بەشەیان هەیانە بە شێوازێکی تر، ئیسلام چەسپاندوویەتی، وەك حەج‌و عەمرەو تەوافی ماڵی خواو مارەو تەڵاق‌و کەلەپوور گرتن‌و خواردنی گۆشت‌و ئاژەڵ سەربڕین لەسەر شێوازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، نەك لەسەر شێوازی کۆنی کاتی نەفامی!

کەواتە: ئەم بەشەیان بە واتە کۆنەکەو لەسەر شێوازە نەفامییەکە ناڕەواو نادروستە، بەڵام لەسەر شێوازە نوێ ئیسلامییەکە، دروستە، بگرە زۆرجار پێویست‌و واجبە، وەك حەج‌و عەمرە، یا سوننەتە وەك: ژنهێنان‌و خەڵوە کێشان‌و خزمەتی ماڵ‌و میوان، گەڵێ جاریش رەوایە، نە پێویستە، نە سوننەتە،

وەك مەبەست لە زەمانەو گەردوونو ڕۆژگارو چەرخ! چەپاڵەی ڕەشی ستەمكاریی و هانە بردنە بەر خودایی، كەخودا هەقت لەناهەقیكار بستێنی.

مەحوی لەم ڕوانگەوەو لەم بوارەدا دەفەرموێ:

زەمانەی سوفلە پەروەر، وا ڕەواجی سوفلەیی داوە
كە دانیم ئەو دەمە سوێرە لەگەڵ نان و نمەك دەدوێ

یا دەفەرموێ:

مومەییز چەرخی كە چڕەوبێ، نەكەی (مەحوی) كەماڵت خەرج
زوبانی تیغی ئەو دەرحەق بە حەرفی من لە حەك دەدوێ!

منیش لە سكاڵای حاڵا دەڵێم:

ئەی كوردی بێكەس! ئای بێكەسی تۆ
بۆمن بووەتە خەمی كۆن و نۆ
بووی بەگۆی مەیدان ڕۆژگاری نامەرد
پێت دەكا شەقێن، بەدارشەقی بەرد
ڕۆژێ ئینگلیزو ڕۆژێ ئەمریكا
ڕۆژێ كوردی خۆت یاریت پێ دەكا
هەروا سێ قۆڵی: عەرەب، تورك، عەجەم
خوێنت دەمژن، وەك زالووی ناو دەم
كەر دەستم دەڕۆی بەسەر ڕۆژگارا
ڕۆژێ هەزارجار دەمكرد بەدارا!

واقـــــــــى وپەـــــــــاوم بۆچـــــــــى زەمانـــــــــە
هەمیـــــــــشە پیـــــــــشەى دژى ویژدانـــــــــە
خوایـــــــــە ! بیـــــــــبڕى نـــــــــەم گوزەرانـــــــــە
دەڵێـــــــــى ڕزقمـــــــــان بەدەســـــــــت شـــــــــەیتانە

(٢) باب كراهة تسمية العنب كرماً

نا باشە – واتە: كەراهەتى هەیە – كە بە دارى مێو بگوترێ: كەرم

١٤٥٠- حَدَّثَنَا أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): « لاَ تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ إِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤمِنِ»:(١٤٥٠)

ئـــەبوهورەیرە (ڕەزاى خــوداى لێ بــێ) فــەرمووى: پێغەمبــەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (بە تـرێو دارى مێـو مـەڵێن: (كـەرم) كـە بـە واتـا ڕێـزدارىو نازدارییـە، چـونكە مـەىو بـادەى لێ دروسـت دەكـرێ، بۆیـە واى پـێ دەڵێن، لـە ڕاسـتىدا شـتى وا ناڕاسـتە، چـونكە دڵـى موسـوڵمان شـایانى ئـەم نـاوە جوانـەیە).

ئەمەیش دەقى ژمارە: (١٤٠٨)ى پوختەى موسلیمە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ): «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ لِلْعِنَبِ الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَـرْمَ الرَّجُـلُ الْمُـسْلِمُ». {الحديث: ٥٨٢٨ = ٥٨٢٣ فم}:

ئـــەبو هـــورەیرە (ڕەزاى خــوداى لێ بــێ) فــەرمووى: پێغەمبــەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەترێو دارى مێو مەڵێن: (كەرم) چونكە مرۆى

(١٤٥٠) تجرید/٥، ژمـارە: ١٩٥٨ – ٦١٨٢ بخـارى. مـسلم: ٢٢٤٧، محمـد فـؤاد = پوختـەى موسـلیم/٤، ژمارە: ١٤٠٨ = ٥٨٢٨ شیحا (بخارى رقم الكتاب/٧٨ رقبم الباب/١٠٢).

موسوڵمان شایستەی ئەم ناوە جوانەیە، نەوەك ترێو بەری داری مێو کەمەیو بادەی لێ دروست دەکرێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥٤٧٠، ٥٤٧١ ج/٤} .
بۆنەوەی تەواو لەمەبەستی ئەم فەرموودەیە تێ بگەین بفەرموو بڕوانە: تاج بەکوردی، بەرگی پێنجەم لاپەڕە (٥١٢) لەزنجیرە: ٨٣دا، روونکردنەوەکە هەتا کۆتایی.

(٣) بابُ حُكْمِ إطلاقِ لَفْظَةِ العَبْدِ والأمَةِ وَالمَولى وَالسَّيِدِ
بڕیاری شەرعی سەبارەت بەم بێژانە: (العبد: بەندەو کۆیلە) و (الأمة: کەنیزەك) و (المَولى: خاوەن) و (السَّيِد: گەورەو سەروەر)

١٤٥١- عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يُحَدِّثُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: لا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلايَ وَلا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي، أَمَتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ، وَفَتَاتِي، وَغُلامِي) (الحديث٢٥٥٢): [١٤٥١]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ داوای شتێ لەبەندەو کۆیلەو کەنیزەکەکانتان دەکەن پێیان مەڵێن: أطعم ربك: نان بێنە بۆ من کە ڕەببی تۆم، یان ئاوی دەستنوێژ بێنە بۆمن کە ڕەببی تۆم، یان خواردن بدە بە من کە ڕەببی تۆم!) با بەندەو کۆیلەکانتان لەکاتی گفتوگۆدا پێتان نەڵێن: ڕەببی، باپێتان بڵێن: گەورەم، سەروەرم، ئێوەش کە بانگی ئەوان دەکەن، مەڵێن: عەبدەکەم، ئەمەتەکەم، بەڵکو بڵێن: کوڕە، کچە، خولامەکەم. (تاج/١٠/١٦١).

---

[١٤٥١] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٩١ = ٢٥٥٢ بخاری. مسلم: ٢٢٤٩، محمد فؤاد - پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٣٧٢ = ٥٤٣٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/١٧).

**راڤەو شیکردنەوە:**

مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە ئەمەیە: کە موسوڵمان بەچاوی خوایی تەماشای خواردەستی خۆیان نەکەن، لەعەرەبیو لەهەر جۆرە زمانێکی تردا، ئەو جۆرە بێژەو ووشانە بۆ خۆیان بەکارنەهێنن، کە لەسەر رووی راستەقینەیی هەر بۆ خوا بەکاردێن، وەك وشەی (ربّ) لەعەرەبیداو وشەی (خوداوەند) لە کوردیدا.

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٤١٣)ی پوختەی موسلیمە بۆ ئەم فەرموودەیە:
عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: اسْقِ رَبَّكَ، أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: رَبِّي، وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلاَيَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي، أَمَتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ، فَتَاتِي، غُلاَمِي». {الحديث: ٥٨٣٨ = ٥٨٣١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٩١ = ٢٥٥٢ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٧١٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی قسەکردنو گوفتوگۆدا، بەکارەکەرو خزمەتکارەکانتان مەڵێن: ئاو بدە بەخاوەنەکەت، یا نان بدە بە خاوەنەکەت، یا ئاوی دەسنوێژ بکە بە دەستی خاوەنەکەتا، هەروا بەیەکتریش مەڵێن: (رَبِّي: خاوەنم!) بەڵام بڵێن: (سَيِّدِي: گەورەم، مَوْلاَيَ: سەرومەرم) وەیا مەڵێن: (عَبْدِي: عەبدەکەم: بەندەکەم،) بەڵام لەجیاتی ئەوە بڵێن: فَتَاتِي: کارەکەرەکەم: نۆکەرەکەی من، کەنیشکەکەی من. غُلاَمِي: خوڵامەکەم). {تاج/٥، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٥٤٦٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

### (٤) بابُ كَرَاهَة قَوْلِ الإنسانِ خَبُثَتْ نَفْسِي
### ناباشی گوتەی مرۆڤ کە بڵێ: (خَبثتْ نَفسِي: گەدەم گەنیوە)

١٤٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلَكِنْ لِيَقُلْ لَقِسَتْ نَفْسِي». {الحديث: ٥٨٣٩ = ٥٨٣٢ فم. بخاري. أدب: ٦١٨٠. أبو داود. أدب: ٩٧٨} :[١٤٥٢]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووردو سڵاوی خودای گەورەو سەروەری لێ بێ) فەرمووی: (کاتێ دڵتان دێ بەیەکا، مەڵێن: خَبُثَتْ نَفْسِي: گەدەم گەنیوە، بەڵام بڵێن: لَقِسَتْ نَفْسِي: دڵم تێك هەڵ دێ). {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٢٩، ژمارە: ١٧٣٩ + تاج/٥، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٥٤٦٩ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) مەبەستی ئەوەیە کە موسوڵمانان فێری قسەو گفتو لفتی شیرینو جوان بن‌و قسەو گوتەی ناشیرین واز لێ بێنن، لەکاتی گفتوگۆدا ناسكو بەنەزاکەت بن، دەنا (خَبُثَتْ نَفْسِي) لە عەرەبیدا، دەق بەواتای (لَقِسَتْ نَفْسِي)یە، بەڵام وشەی (خَبُثَ) وشەیەکی قێزەونە، بۆ نموونە، بەپێی ئەم فەرموودەیە، ئەم رستانەی دواوە لە کوردیدا، گەرچی رستەی یەکەم دەق بەواتای رستەی دووەمە، بەڵام یەکەمیان ناسکترە لە دووەمیان:

١- سەراو دەکا: پیسایی دەکا.

٢- لووتت بسرە: چڵمەکەت بسرە.

---

[١٤٥٢] بخاري. أدب: ٦١٨٠ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٦٦ = ٦١٨٠ شیحا (بخاري رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/١٠٠).

٣- ئینتەلای کردووە: ترخەی کردووە.

١٤٥٣- حَدَّثَنَا سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم– قَالَ « لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسِي وَلْيَقُلْ لَقِسَتْ نَفْسِي». (١٤٥٣)

ئـەم فەرموودەیـە دەقـی فـەرموودەی ژمـارە: (١٤٥٢)وە، بـەڵام یەکـەم لـە عائیشەوەیەو دووەم لە سەهلەوەیە.

## ٤١- كِتَابُ الشِعْرِ
## نامەی شیعر

١٤٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا شَاعِرٌ كَلِمَـةُ لَبِيـدٍ: أَلاَ كُـلُّ شَـيْءٍ مَـا خَـلاَ اللَّـهَ بَاطِـلٌ». {الحديث: ٥٨٤٩ = ٥٨٤٣ فم}: (١٤٥٤)

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (راسـترین گوتـەیێ کە هەستیار (شاعیر) وتبێتی، ئەم گوتەیەی لەبیدە کەدەڵێ:

(أَلاَ كُـلُّ شَـيْءٍ مَـا خَـلاَ اللَّـهَ بَاطِـلٌ
(وَكُـلُّ نَعِـيمٍ لاَ مَحَالَـةَ زَائِـلُ)

واتە:

ئـەم دنیایـە کـاوو بایـە
هـیچ و پـووچ و بـێ بەهایـە

---

(١٤٥٣) بڕوانە ژمارە: (١٤٥٢) (بخاری رقم الکتاب/٧٨ رقم الباب/١٠٠).

(١٤٥٤) تجریـد/٤، ژمـارە: ١٥٠٤ = ٣٨٤١ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٠٧ = ٥٨٤٩ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٨ رقم الباب/٩٠).

نـــــــــازو بـــــــــەهرەی بــــــــیٚ بەقایــــــــــە

نــــــــەوەی راســــــــت بــــــیٚ بــــــەس خوایــــــــە !

{تاج/٥، زنجيره: ٦٩، ژمارە: ٥٤٢٦ ج/٤ + تجريدى بوخارى بەرگى چوارەم، لاپەڕە: ١٩٠، ژمارە: ١٥٠٤}.

لە تەجريدى بوخاريدا، لە كورديیەكەيدا، دەفەرمویٚ:

**ڕوونكردنەوە:**

(لەسەر فەرمایشتى فەتحولبارى شەرحى صەحيحى بوخارى لەڕاڤەى ئەم فەرموودەيەدا، كە ژمارەكەى لە فەتحولباريدا = ٣٨٤١، كەدوو طەرەفى هەيە، ژمارە: ٦١٤٧ و ٦٤٨٩، لەوێدا دەفەرمویٚ: لەبيد ئيسلام بووە، وە ئيمامى بوخارى بە صەحابەى داناوە. لە ئيصابەو ئيستيعابيشدا دەفەرمویٚ: ناوى لەبيدى كوڕى ڕەبيعەى كوڕى عاميرە، شاعيرێكى بەناوبانگە، سوار چاكێكى ئازاو دلێر بووە، لەدوو سەردەما ژياوە، زۆرينەى شيعرەكانى لەپێش ئيسلامبووندا گوتووە، موسوڵمانێكى زۆر جوانو ڕێكو پێك بووە، لەگەڵ دەستەيێ كە ژمارەيان سيازدە پياو بوو، لەهۆزى بەنى كلاب، كە نوێنەرى هۆزەكەيان بوون، هات بۆ خزمەتى پێغەمبەرو ئيسلام بوو). عائيشە (ڕەزاى خوداى لیٚ بیٚ) گەلیٚ جار دەيفەرموو: ڕەحمەتى خودا لە لەبيد كە دەڵیٚ (كامل):

ذَهَـــــبَ الَّـــــــذِينَ يُعَـــــاشُ فِـــــى أَكْنَـــــافِهِمْ

وَبَقِيـــــــتُ فِــــــى خَلَـــــفٍ كَجِلْـــــدِ الْـــــأَجْرَبِ

واتە:

ڕوويـــــــين ئەوانــــــــەى كـــــــە لـــــــەژيانا

كـــــــوزەران خــــــۆش بــــــوو لـــــــە پـــــــەنايانا




مامـــــــەوە لــــــــەناو وەچــــــــەیێ بــــــــی فــــــەڕ

بــــــێ وەچ و بــــــێ فـــــەڕ، وەکــــــوو کــــــەوڵی گــــــەڕ!

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: دەی ئەگەر لەبید فریای ئەم سەردەمەی ئێمە بکەوتایە، دەبێ چی بگوتبایە! ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەبارەی شیعر وتنەوە، لەپاش ئیسلامبوونی پرسیاری لێ دەکا، دەڵێ: خودا لەجیاتی شیعر، بەسوورەتی بەقەرە هەقی بۆ کردوومەتەوە، سەدو پەنجا ساڵ ژیاوە، لەکووفە نیشتەجێ بوو، هەر لەوێ لەکاتی حوکمڕانی وەلیدی کوڕی عوقبەدا دەمرێ، لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عوسماندا گیانی پاکی بەخزمەتی خودای گەورە شاد دەبێ، لەساڵی چڵو یەکی کۆچیدا، لەو ڕۆژەدا کە موعاوییە دەچێتە ناو کووفە. لە ئیصابەدا ئاماژە دەکا، کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەر دوانگە، شیعرەکەی لەبید دەخوێنێتەوە.

ئیبنو عەبدول بەرر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە ئیستیعابا دەفەرموێ: (کاتێ دەگاتە تەمەنی سەدو بیست ساڵ ئەم هۆنراوەیە، دەڵێ (کامل):

وَلَقَـــــــدْ سَـــــــئِمْتُ مِـــــــنَ الحَيَـــــــاةِ وَطُولِهَـــــــا

وَسُـــــــؤَالِ هَـــــــذَا النَّـــــــاسِ: كَيْـــــــفَ لَبِيـــــــدُ

واتە:

لـــــــەژین و درێـــــــژیی، تـــــــەواو بێـــــــزارم

{چـــــــۆنی؟ نـــــــەی لەبیـــــــد!} دەدا نـــــــازارم!

ئەمـەیش دەقـی ئـەم فەرموودەیـە لـە تەجریـدی بوخاریـدا ژمـارە (١٥٠٤) بەرگی چوارەم:

عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ): اصْـدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: الا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلا اللَّـهَ باطِـلٌ وَكَـادَ امَيَـةُ بْـنُ ابِـي الصَّلْتِ انْ يُسْلِمَ. (الحديث: ٣٨٤١، طرفاه في:٦١٤٧، ٦٤٨٩):

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لــێ بــێ) فـەرمووی: پێغەمبــەر (درووودی خودای لـێ بێ) فەرمووی: (ڕاستترین گوتەیێی کە هۆنەر واتە: هەسـتیار: شاعیر: گوتبێتی، ئەم گوتەیەی لەبیدە کە دەڵێ:

الا كُـلّ شـيئ مـا خـلا الله باطـلُ
وكُـلّ نـَعـِـيم لا محالــة زائــل

واتە:

ئــەم دنیایـــە کـــاو و بایـــە
هـــیچە پـــووچە بـــێ بەهـــایە
نـــازو بەهـــرەی بـــێ بەقـایـــە
ئـەوەی ڕاسـت بـێ بـەس خوایـە!

(تاج/٥ ل/١٧٤ ز/٦٩ ف/٢).

پێغەمبەر (درودی خودای لـێ بـێ) هـەروا فەرمووشـی: ئومـەییی کـوڕی صەلتیش لە شیعرەکانیەوە، وا دەردەکەوێ خەریك بووە ئیسلام ببێ - ش/ت).

١٤٥٥- عَنْ سَعْدِ بْنُ أَبِی وَقَاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا يَرِيهِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا». {الحـديث:

٥٨٥٣ = ٥٨٤٨ فم. تجريد البخاري/٥/٢٢٣، رقم: ١٩٥٥ = ٦١٥٤. ترمذي. أدَب: ٢٨٥٢. ابن ماجة. أدب: ٢٧٦٠. تحفة الأشراف: ٢٩١٩} : [١٤٥٥]

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەڕاستیدا ناودڵی مرۆڤ پڕبێ لەکێم و زوخاوێکی وا، کە ناوسکی بگەنێنێ، هێشتا ئەوەی باشترە لەوە کە دڵی پڕبێ لە هەڵبەست و هۆنراوە). {تاج/٥/٤٩٠، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٥٤٢٢ چ/٤} .

لێرەدا لە ئەبو هورەیرەوە، لە تەجریددا لە ئیبنو عومەرەوە، بڕوانە: تاجول ئوصول بە کوردی بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٦٨، لاپەڕە: ٦٨٨، لە ژمارە: ٥٤٢٢ هەتا ژمارە: ٥٤٥٣، زنجیرە: ٧٥ + تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٥٤، ١٩٥٥.

---

[١٤٥٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٥٥ = ٦١٥٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٠٨ = ٥٨٥٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٩٢).

# ٤٢- كِتَابُ الرُّؤْيَا
# نامەی خەون بینین

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ٦٠٥ چاپی چوارەم، زنجیرە: ١، ژمارە: ٤٢٣٩ هەتا زنجیرە: ١١، لاپەڕە: ٦٤٣، ژمارە: ٤٢٩٦} + {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣٠٨، چاپی دووەم، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨٣٨ هەتا ژمارە: ٨٤٤ + تەجریدی بوخاری = پوختەی (مختصر صحیح البخاری) بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٣٤٠، چاپی یەکەم، زنجیرە: ٩٣، لە ژمارە: ٢٠٨١ هەتا لاپەڕە: ٣٥٢، ژمارە: ٢٠٩١}.

١٤٥٦- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ حُلْمًا يَكْرَهُهُ، فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثًا وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ»، فَقَالَ: إِنْ كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنْ جَبَلٍ، فَمَا هُوَ إِلاَّ أَنْ سَمِعْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ فَمَا أُبَالِيهَا. {الحديث: ٥٨٦٠ = ٥٨٥٤ فم}: [١٤٥٦]

ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لەئەبو قەتادە دەیفەرموو: بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خەونی خۆش‌و باش لەخوداوەیە، خەونی ناخۆش‌و خراپیش لە شەیتانەوەیە، جاکاتێ کەسێکتان خەونێکی دی‌و ئەو خەونەی پێ ناخۆش بوو، با لەلای چەپیەوە سێ تف ڕۆبکاو پەنابگرێ بەخودا لەشەڕی شەیتان‌و لەشەڕی ئەو خەونەو ئیتر بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، ئیتر زیانی نابێ بۆی).

---

[١٤٥٦] بخاری طب: ٥٧٤٧. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥١٦ = ٥٨٦٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٦ رقم الباب/٣٩).

ئـەبو سـەلەمە دەفـەرموێ: کـە ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەرم لـە ئـەبو قەتادە بیست، ئیتر دەربەستی خەونی ناخۆش نەبووم، بـەڵام لـەوەپێش خـەونی ناخۆشی وام دەبینی، لەکێو قورستربوو، بەڵام لەپاش بیستنی ئـەم فەرموودەیـە، ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەرم جێبـەجێ دەکـرد، ئـیتر زیـانی نـەدەبوو بـۆم). {ریاض/٢، لاپەڕە: ٣١٠، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨٤٢}.

١٤٥٧- عن أبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رؤيا المؤمن تكذب وَرُؤْيَا الْمُـؤْمِنِ جُـزْءٌ مِـنْ سِـتَّةٍ وَأَرْبَعِـينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. وَمَا كَانَ مِنَ النُّبُوَّةِ فَإِنَّهُ لَا يَكْذِبُ. (الحديث ٧٠١٧): [١٤٥٧]

ئـەبو هـوریرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمـەر -درودی خـوای لەسەر- فەرمووی: (کاتێ شەوو ڕۆژ بەرابەر بوون، وەك ناوەڕاستی وەرزی پـایزو ناوەڕاسـتی وەرزی بـەهار، لـەو کاتـەدا زۆر نزیکـە کەخـەونی موسـوڵمان هەڵـەی نەبێو ڕاست دەرچێ.ئەو کەسەیشتان خەونی زۆر ڕاستو دروسـتە کـەخۆی زۆر ڕاستگۆیە، وەخەونی موسوڵمان، پیاوبێ یـاژن، بەشـێکە لەچلو شـەش بـەش لـە پێغەمەرایـەتی). (شـتێکیش کـە لەبابـەتی پێغەمەرایـەتی بـێ، قـەت بـەدرۆ دەرناچێ). (تاجی کوردی/٨ ل/٤ ژ/١ ژ/٤ - باسی: بەشەکانی خەون).

لەژمارە (١٥٢٠)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَـالَ: «إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْـذِبُ، وَأَصْـدَقُكُمْ رُؤْيَـا أَصْـدَقُكُمْ حَـدِيثًا، وَرُؤْيَـا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ، وَالرُّؤْيَا ثَلاَثَةٌ: فَرُؤْيَـا الـصَّالِحَةِ بُـشْرَى

---

[١٤٥٧] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٨٧ = ٧٠١٧ بخاری. مـسلم: ٢٢٦٣، تـرقیم الـشیخ محمـد فـؤاد لـصحیح مـسلم = پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٢٠ = ٥٨٦٥ شـیحا (بخـاری رقـم الكتـاب/٩١ رقـم الباب/٢٦).

مِنَ اللَّهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ، فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ، وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ»، قَالَ: «وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ، وَالْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِى الدِّينِ». فَلاَ أَدْرِى هُوَ فِى الْحَدِيثِ أَمْ قَالَهُ ابْنُ سِيرِينَ. {الحديث: ٥٨٦٥ = ٥٨٥٩ فم. تەجریدی بوخاری بەكوردی/٥/٣٤٥، رقم: ٢٠٨٧ = ٧٠١٧ فتح الباری. أبو داود. أدب: ٥٠١٩. ترمذی. رؤیا: ٢٢٧٠. تحفة الأشراف: ١٤٤٤٤} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ شەوو رۆژ بەرابەر بوون، وەك ناوەڕاستی وەرزی بەهارو ناوەڕاستی وەرزی پاییز، لەوكاتەدا زۆر نزیكە كە خەونی موسوڵمان هەڵەی نەبێو راست دەرچێ، ئەوكەسەیشتان خەونی زۆر راستو دروستە كە خۆی زۆر راستگۆیە. وە خەونی موسوڵمان بەشێكە لەچلو پێنج بەش لە پێغەمبەرایەتی، خەونیش سێ جۆرە: خەونی باش، ئەمەیان مژدەی خۆشە لە خوداوە بۆ بەندە. هەندێ خەونی تریش خەمو خەفەتە، ئەمەشیان لەشەیتانەوەیە. هەندێ خەونی تریش قسە جوینەوەو ووڕاوەی دەروونە، كەسێ خەیاڵی لای شتێ بێ دیارە خەونی پێوە دەبینێ! چونكە لەوەپێش ئەوەندە لەدڵی خۆیدا بیری لێ كردۆتەوە لەخەویشدا هەر دێتەوە خەوی، ئەمەشیان بایەخی نییە. جا ئەگەر كەسێكتان خەونێكی وای دی كە بەدڵی نەبوو با هەڵسێو نوێژبكاو ئەو خەونە نەگێڕێتەوە بۆ خەڵك!).

ئەبو هورەیرە دەیفەرموو: من بەش بەحاڵی خۆم دیتنی پێوەندو پابەندم لەخەوندا پێ خۆشە، چونكە نیشانەی بەندەیی خودایە، بەڵام حەز لەدیتنی زنجیری مل ناكەم لەخەوندا، چونكە نیشانەی باش نییە، بەڵام پابەند نیشانەی دامەزراوییە لە ئاییندا، بۆیە حەزم لێیەتی. {فتح الملهم رقم: ٥٨٦٠}.

بـەڵام عەبـدول وەهـابی ئـەل – ئـەقـەفی لـەكۆتایی ئـەم گێڕانەوەیـەدا دەفـەرموێ: (نـازانم ئـەم رسـتەی: «وَأُحِـبُّ الْقَیْـدَ وَأَكْـرَهُ الْغُـلَّ، وَالْقَیْـدُ ثَبَـاتٌ فِـی الدِّینِ»: واتە: من بـەش بـەحاڵی خـۆم، دیتنـی پێوەنـدو پابەنـدم لەخەونـدا پـێ خۆشـە، چـونكە نیـشانەی بەنـدەیی خودایـە، بـەڵام حـەز لـەدیتنی زنجـیری مـل ناكەم لەخەوندا، چونكە نیشانەی باش نییە، بەڵام پابەند نیشانەی دامەزراوییە لە ئاییندا، بۆیە حەزم لێیەتی).

بەڵام نازانم ئەم رستەیە بەشێكە لـە فەرموودەكـەی پێغەمبـەر یـا قـسەی موحەممەدی كوڕی سیرینە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١، ژمارە: ٤٢٤٢}.

١٤٥٨- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ». {الحـديث: ٥٨٦٩ = ٥٨٦٣ فم. تجريد/٥/٣٤٥، رقـم: ٢٠٨٧ = بخـاری. تفـسير: ٧٠١٧. ترمـذی. رُؤيـا: ٢٢٩١. أبو داود. أدَب: ٥٠١٨}: [١٤٥٨]

عوبـادەی كـوڕی صـامیت (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خەونی موسوڵمان یەك بەشـە لەچڵو شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی). {تاج/٤، زنجیرە: ١، ژمارە: ٤٢٣٩}.

١٤٥٩- حَدَّثَنَا أَنَسٌ – رضى الله عنه – قَالَ قَالَ النَّبِىُّ – صلى الله عليه وسلم – «وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ».

بڕوانـە ژمـارە: (١٤٥٨) جیـاوازی ئـەم دوو ژمارەیـە لەوەدایـە: یەكـەم لـە عوبادەی كوڕی صامیتەوەیە، دووەم لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوەیە.

---

[١٤٥٨] بخاری. تفـسير: ٧٠١٧. مختـصر صحيح مـسلم/٤، ژمـارە: ١٥١٩ = ٥٨٦٩ شـيحا (بخـاری رقـم الكتاب/٩١ رقم الباب/٤).

١٤٦٠- حَدَّثَنَا أَبِى هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ – صـلى الله عليـه وسلم – قَالَ « رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ».

بڕوانە ژمارە: (١٤٥٨).

## (١) بابُ قَوْلِ النَّبِي (ﷺ) (مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي)
## فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) (کەسێ لە خەونا من ببینێ، ئەوە لە ڕاستیدا منی لەو خەوەدا بینیوە!)

١٤٦١- و عنه رضي الله عنه قَالَ سمعت رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقُـول: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي اليَقْظَةِ و لَا يَتَمَثَّلُ الشَيطَانُ بِي. (الحديث ٦٩٩٣):

دیسان ئەبو هوریرە- ڕەزای خودای لێ بێ- فـەرمووی: ژ نـەوتم لەپێغەمـەر — دروودی لەسـەر- دەیفـەرموو: (هەرکەسێ بەخـەو مـن ببینـێ، ئـەوە بەچـاوی سەریش لەحاڵی هۆشیاریدا من دەبینێ، شـەیتان قـەت ناچێتە شـەکڵی منـەوە). (تاج/٨ ل/٢٣ ز/٧ ژ/٢).

ئەمەیش ژمارە (١٥١٥)ی پوختەی موسلیمە، بـەهرەی پـتری واتیـادا، وەك گشت جارێ دەینووسین، تا ببێ بە ڕاڤەو ڕوونکردنەوە سەبارەت بەم بابەتە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «مَنْ رَآنِى فِـى الْمَنَـامِ فَسَيَرَانِى فِـى الْيَقَظَـةِ، أَوْ لَكَأَنَّمَـا رَآنِـى فِـى الْيَقَظَـةِ، لاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِى»، وَقَالَ: فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ): «مَـنْ رَآنِـى فَقَـدْ رَأَى الْحَـقَّ». {الحـديث: ٥٨٧٩ = ٨٧٤ فـم. تجريـد البخاري/٥/٣٤٢، رقم: ٢٠٨٤ = ٦٩٩٣، ٦٩٩٦. أبو داود. أدب: ٥٠٢٣} :

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بیـستم لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفـەرموو: (هەرکەسـێ بەخـەو مـن ببینـێ، ئـەوە بەچاوی سەریش لەحاڵی هۆشیاریدا من دەبینێ، یا وەك ئەوە وایـە کـە بەچـاوی

سەر لەحاڵی بێداریدا من ببینێ، شەیتان خۆی بۆناکرێ بەمن. واتە: ناتوانێ خۆی بگۆڕێو خۆی بباتە شێوەو شەکڵی منەوە) + {ریاض/٢، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٨٤٠}.

ئیبنو شەهاب، ئیمامی زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەخەونیدا من ببینێ، ئەوە خەوێکی راستو دروستی دیوە، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێ بەمنو، ناتوانێ بەهیچ شێوەیێو لەهیچ حاڵێکا بچێتە شکڵو شێوەی منەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٢٦٧، ٤٢٦٨، ٤٢٦٩ + بخاری. تعبیر: رقم: ٦٩٩٦} + {فتح الملهم. رقم: ٥٨٧٥ = ٦٩٩٥، ٦٩٩٦ = فتح الباری} + {تەجریدی بوخاری/٥/٣٤٢، ژمارە: ٢٠٨٥ = ٦٩٩٧ فتح الباری}.

## (٣) باب في تَأوِيلِ الرُّؤيَا
## باسی خەوپەرژێنی خەون

١٤٦٢- عن ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنهما أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطُفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ وَإِذَا سَبَبٌ وَاصِلٌ مِنَ الْأَرْضِ إِلَى السَّمَاءِ فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلَا بِهِ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلَا بِهِ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ ثُمَّ وُصِلَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وَاللَّهِ لَتَدَعَنِّي فَأَعْبُرَهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْبُرْهَا. قَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَالْإِسْلَامُ وَأَمَّا الَّذِي يَنْطُفُ مِنَ الْعَسَلِ وَالسَّمْنِ فَالْقُرْآنُ حَلَاوَتُهُ تَنْطُفُ فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِي أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللَّهُ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُهُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ ثُمَّ يُوَصَّلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ فَأَخْبِرْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ

أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا. قَالَ: فَوَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّي بِالَّذِي أَخْطَأْتُ قَالَ لَا تُقْسِمْ. (الحديث ٧٠٤٦):[١٤٦٢]

ئیبنو عەبباس –ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەبابی- فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! ئەمشەو لەخەوما پەڵەیەك هەورم دیت، ڕۆن‌و هەنگوینی لێ دەچۆڕایەوە، دیشم کەئەو خەڵکە بەهەردوو لەپ لێیان دەگرتەوە، هەبوو زۆرو هەبوو کەمی گرتبۆوە! وەدیشم کەمەندێ لەئاسمانەوە شۆڕبۆتەوەو گەیشتۆتە سەرزەوی، وەتۆم دی، ئەو کەمەندەت گرتبوو سەرکەوتیت، لەپاش تۆ پیاوێکی تر گرتی‌و ئەویش سەرکەوت، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش هەروا، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش گرتی، بەڵام کەمەندەکە لە دەستی دا پسا! هەتا بەستیانەوە بەیەکەوە بۆی‌و ئەویش سەرکەوت. ئەبوبەکریش – ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئەی پێغەمەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، بەخودا دەبێ لێم گەڕێیت من ئەو خەونە لێك دەدەمەوە، فەرمووی: (باشە خەوپەرژینی بکە). ئەبو بەکریش فەرمووی: پەڵە هەورەکە کەپرو ساباتی ئیسلامە ئەو ڕۆن‌و هەنگوینەیش کەدە چۆڕایەوە، ئەوە شیرینی‌و نەرم‌و ناسکی ی قورئانە،ئەوەیش کەخەڵك بەهەردوو دەست لێیان دەگرتەوە ئەوەیە کەهەندێ کەس زۆر لەقورئان وەردەگرن‌و هەندێ کەس کەم، ئەو کەمەندەش کە لەئاسمانەوە گەیشتبوە سەرزەوی ئەو هەق‌و ڕاست‌و دروستیە یە کەتۆی لەسەریت، ڕێگەی هەق‌و ڕاستی ئیسلامە، هەر لەسەری دەڕۆیت‌و هەرخودا پلەو پایەت، جار لەگەڵ جاردا، بڵند ترت دەکا.

---

[١٤٦٢] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٩١ = ٧٠٤٦ بخاری. مسلم: ٢٢٦٩ = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٢١ - ٥٨٨٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٩١ رقم الباب/٤٧).

لەپاش تۆش پیاوێ ڕێگەی ڕاستی تۆ دەگرێتو پێی بڵند دەبێتەوە، پیاوێکی تریش دوای ئەو هەروەها، لەپاشا پیاوێکی تریش ئەو کەمەندە دەگرێو لەسەری دەڕوا، بەلاَم لەدەستیدا دەپچڕێو بۆی دەبەستنەوە بەیەکەوە، جا ئەویش پێی بەرز دەبێتەوە!، جا ئەی پێغەمەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، پێم بفەرموو ئایا پێکاومە یابەهەڵەدا چووم؟ فەرمووی: (هەندێکیت پێکاوەو هەندێکیت هەڵە کردووە) جا گوتی: دەسا بەخودا ئەی پێغەمەوری خودا! دەبێ پێم بفەرموویت کە کامەیم بەهەڵە خەو پەورژێن کردووە، فەرمووی: (سوێن مەخۆ پێت نالێم. (تاجی کوردی/٨ ل/٢٠ ز/٦ ژ-٤-ش/د/ت- باسی: ئەو خەونانەی کەپێغەمەر -درودی خوای لەسەر- خۆی خەوپەرژینی کردوون).

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٥٢١)ی پوختەی موسلیمە:

عَنِ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَرَى اللَّيْلَةَ فِى الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطِفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ، فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا بِأَيْدِيهِمْ، فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ، وَأَرَى سَبَبًا وَاصِلاً مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ، فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ، فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ بِهِ، ثُمَّ وُصِلَ لَهُ فَعَلاَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِى أَنْتَ وَاللَّهِ لَتَدَعَنِّى فَلأَعْبُرَنَّهَا. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اعْبُرْهَا». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَظُلَّةُ الإِسْلاَمِ، وَأَمَّا الَّذِى يَنْطِفُ مِنَ السَّمْنِ وَالْعَسَلِ فَالْقُرْآنُ حَلاَوَتُهُ وَلِينُهُ، وَأَمَّا مَا يَتَكَفَّفُ النَّاسُ مِنْ ذَلِكَ، فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ مِنْهُ. وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِى أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللَّهُ بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ، رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ، ثُمَّ يُوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ، فَأَخْبِرْنِى يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِى

أَنْتَ أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا»، قَالَ: فَوَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّي مَا الَّذِي أَخْطَأْتُ؟ قَالَ: «لاَ تُقْسِمْ». {الحديث: ٥٨٨٧ = ٥٨٨٢ فـم. تجريد/٥، لاپـەڕە: ٣٤٧، رقـم: ٢٠٩١ = ٧٠٤٦، ٧٠٠٠. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٦٧، ٣٢٦٩}:

عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمشەو لەخەومدا پەڵەیەك هەورم دینی، ڕۆنو هەنگوینی لێ دەچۆڕایەوە، بینیشم کە ئەو خەڵکە بەهەردوو لەپی دەستیان لێیان دەگرتەوە، هەبوو زۆرو هەبوو کەمی گرتبۆوە!

وەبینیشم کەمەندێ لە ئاسمانەوە شۆڕبۆتەوەو گەیشتۆتە سەر زەوی، وە تۆم دی ئەو کەمەندەت گرتو سەرکەوتیت، لەپاش تۆ پیاوێکی تر گرتیو ئەویش سەرکەوت، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش هەروا، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش گرتی، بەڵام کەمەندەکە لەدەستیدا پسا! هەتا بەستیانەوە بەیەکەوە بۆیو ئەویش سەرکەوت.

ئەبوبەکری صەدیقیش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، بەخودا دەبێ وازم لێ بهێنی من ئەم خەوە لێك دەدەمەوە. فەرمووی: (باشە خەوپەرژێنی بکە) ئەبوبەکریش فەرمووی: پەڵە هەورەکە کەپرو ساباتی ئیسلامە، ئەو ڕۆنو هەنگوینەیش کە دەچۆڕایەوەو لێی دەتکا، ئەوە شیرینیو نەرمو ناسکیو نازداری قورئانە، ئەوەیش کە ئەو خەڵکە بەهەردوو بەری دەستیان لێیان دەگرتنەوە، ئەوەیە کە هەندێ کەس زۆر لە قورئانا وەردەگرنو هەندێ کەس کەم. ئەو کەمەندەیش کە لەئاسمانەوە گەیشتبووە سەر زەوی، ئەو ئایینە هەقو ڕاستو دروستەیە کەتۆی لەسەریت،

ڕێگەی هەقو راستی ئیسلامە، هەر لەسەری دەڕۆیتو هەر خودا پلەو پایەت جار لەگەڵ جاردا بڵندتر دەکا، لەپاش تۆیش پیاوێ ڕێگەی راستی تۆ دەگریو پێی بڵند دەبێتەوە، پیاوێکی تریش دوای ئەو هەروەها، لەپاشدا پیاوێکی تریش دەیگریو لەسەری دەڕوا، بەلام لەدەستیدا دەپچڕێو بۆی دەبەستنەوە بەیەکەوە، جا ئەویش پێی بەرز دەبێتەوە!

جا ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، پێم بفەرموو کە ئایا پێکاومە یا بەهەڵەدا چووم؟

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەندێکیت پێکاوەو هەندێکیت هەڵە کردووە).

ئەبوبەکر فەرمووی: دەسا بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ پێم بفەرمووی کە کامەیم بەهەڵە خەو پەرژێن کردووە، فەرمووی: (سوێند مەخۆ پێت نالێم). {تاج/٤، لاپەڕە: ٦٢٠، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٤٢٦٤ ج/٤}.

## (٤) باب رُؤيَا النَّبِيِ ﴿ﷺ﴾

## بینینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە خەونا

١٤٦٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَرَانِي أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ فَجَاءَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ الْآخَرِ فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الْأَصْغَرَ مِنْهُمَا فَقِيلَ لِي كَبِّرْ فَدَفَعْتُهُ إِلَى الْأَكْبَرِ مِنْهُمَا). (الحديث ٢٤٦): [١٤٦٣]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخەوما دیتم کەوا بەدارسیواکێ سیواك دەکەم، دوو

[١٤٦٣] تجرید/١، ژمارە: ١٧٧ - ٢٤٦ بخاری. مسلم: ٢٢٧١ - ٥٨٩٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤ رقم الباب/٧٤).

پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەویتریان گەورەتر بوو، منیش ویستم دارسیواکەکە بدەم بەبچکۆلەکەیان کەچی پێم گوترا: گەورەکەیان وەپێشخە، منیش دام بەگەورەکەیان). (ت/٦/١٨/٨ تاج٤ ز٥ ژ٤٢٥٩).

**شیکردنەوە:**

یەکێ لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە عەففانی کوڕی موسلیمە، لەسەردەمی مەینەتەکەدا، کەبەفیتی موعتەزیلەکان گەڕیان دەکرد بەزانا گەورەکان، لەبارەی قوئانەوە کەدروست کراوە یا دێرین و قەدیمە لەویش پرسیارکرا، رازی نەبوو کەبڵێ: (قورئان مەخلووقەو دروستکراوی خودایە). یەکێ بوو لەحوککامی جەرح و تەعدیل، دەهەزار لیرەی زێڕیان پێ دا، لەباتی ی ئەوەکە لەبارەی پیاوێکەوە راماوی و بێ ئاگایی لەحاڵی دەربڕی، واتە: نەبڵێ عادڵە، نەبڵێ ناعادڵە، بەڵام قاییل نەبوو، فەرمووی: (قەت قەت حەق ناکەم بەناحەق)، یەکێ تر لەپیاوانی ئەم رشتەیە نوعەیمی کوڕی حمادە، پیاوێکی فەرائیز زان بوو، لەسەردەمی مەینەتەکەدا، لەبارەی خەلقی قورئانەوە، ئەویشیان پێچا، لەسەرئەوە لەسامەڕا بەند کرا هەتا لەساڵی (٢٢٠) ی کۆچیدا لەزیندانا مرد! ڕەزای خودای لێ بێ.

لەفیقهی ئاسانا (٢٤/١) دەفەرموێ: (سیواك سوودی زۆرە: پووك توند دەکاتەوەو، ددان ساخڵەم دەکاو، دەسگای هەرس و هەزم بەهێزدەکاو گمیزکردن خێرا دەکاو، دەم و ددان پاك و خاوێن دەکاتەوەو، دەبێ بەمایەی ڕەزای خوداو، پیریی دوا دەخاو، چارەی مرۆڤ گەش و نوورانی دەکاو، گەشەو پەرە بەهۆشیاری دەداو، پاداشی باش دووچەندان دەکاو، لەکاتی گیانەلادا گیانکێشان ئاسان دەکاو، لەکاتی سەرەمەرگا شایەتمان یادی موسوڵمان دەخاتەوە!).

١٤٦٤- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا الْيَمَامَةُ أَوْ هَجَرُ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هَذِهِ أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ أُخْرَى فَعَادَ أَحْسَنَ مَا كَانَ فَإِذَا هُوَ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا أَيْضًا بَقَرًا، وَاللَّهُ خَيْرٌ، فَإِذَا هُمُ النَّفَرُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ بَعْدُ، وَثَوَابُ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا اللَّهُ بَعْدُ يَوْمَ بَدْرٍ». {الحديث: ٥٨٩٣ = ٥٨٨٨ فم. بخاري. مناقب: ٣٦٢٢، ٣٩٨٧، ٤٠٨١، ٧٠٣٥، ٧٠٤١} : [١٤٦٤]

ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لەخـەوما دیـم وا لەمەککـەوە کـۆچو باردەکەم بۆ وڵاتێ کە باخو دارە خورمای زۆری واڵێ، زەینم بۆئەوە چوو کە ئـەو شوێنە یا یەمامە بێ، یا هەجەر بێ، کەچی خۆی نـەبوو، نـە یەمامـە بـوو، نـە شاری هەجـەر، بـەڵکوو ئـەو شـوێنە مەدینـە دەرچـوو، کـە لـەپێش کۆچـدا نـاوی یەثریب بوو، خودای گەورە لە قورئانا، ناوی نا (المدینە).

هەر لەم خەونەمدا، روانیم کەوا شمشێرێ وابەدەستمەوە، کـە رام وەشـاند نووکەکەی پەڕی، دیاربوو کـە ئـەو شکـستە بـوو، کـە لەغـەزای ئوحـوددا تووشـی موسوڵمانان بوو، جا لەپاشا کەجارێ تر رام وەشاندەوە، گەڵێ لـەجاران باشـتری لێ هاتەوە، دیاربوو کـە ئـەو سـەرکەوتنو یـەکگرتنی موسـوڵمانانە بـوو، کـە لـەپاش تێکشکانی ئوحود، لەساڵی ئاییندەدا، لەغـەزای بـەدری دووەمـدا، کـە نـاودارە بـە بەدری مەوعیـد، خـودا رەخـساندی بـۆ موسـوڵمانان، هـەر لـەو خەونەمـدا چـەن

---

[١٤٦٤] بخـاری. مناقـب: ٣٦٢٢. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥١٣ = ٥٨٩٣ شـیحا (بخـاری رقـم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٥).

سەرێ گام بینی سەر دەبڕان، هەر لەو خەونەمدا ئەم رستەیە درا بەگوێما: (وَاللّٰهُ خَيْرٌ: خێر لای خوایە) دیاربوو ئەو گا سەربڕینە، ئەو حەفتا شەهیدە بوون، کە لەغەزای ئوحوددا شەهید بوون، دیاربوو ئەو خێرەیش کە لەلای خودا بوو، ئەو خێرو بێرە بوو کە خودای گەورە لەپاش بەدری دووەم رەخساندی، وە پاداشی باشی ئەو سەر راستییە بوو، کە موسوڵمانان لەبەدری دووەمدا، پیادەیان کردو ئامادەی بەدری مەوعید بوون، بەڵام بێباوەڕەکان، بەڵێنی خۆیان نەبردە سەرو نەهاتن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٣١٥٩} + {تاج/٤، زنجیرە: ٥، لاپەڕە: ٦١٧، ژمارە: ٤٢٥٧}.

١٤٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْمَدِينَةَ، فَجَعَلَ يَقُولُ: إِنْ جَعَلَ لِى مُحَمَّدٌ الأَمْرَ مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ! فَقَدِمَهَا فِى بَشَرٍ كَثِيرٍ مِنْ قَوْمِهِ، فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَمَعَهُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَفِى يَدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قِطْعَةُ جَرِيدَةٍ حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِى أَصْحَابِهِ، قَالَ: «لَوْ سَأَلْتَنِى هَذِهِ الْقِطْعَةَ مَا أَعْطَيْتُكَهَا، وَلَنْ أَتَعَدَّى أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ، وَإِنِّى لأُرَاكَ الَّذِى أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ، وَهَذَا ثَابِتٌ يُجِيبُكَ عَنِّى»، ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَأَلْتُ عَنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّكَ أَرَى الَّذِى أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ»، فَأَخْبَرَنِى أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِى يَدَىَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِى شَأْنُهُمَا، فَأُوحِىَ إِلَىَّ فِى الْمَنَامِ أَنِ انْفُخْهُمَا فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِى، فَكَانَ أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيَّ صَاحِبَ صَنْعَاءَ وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةَ صَاحِبَ الْيَمَامَةِ». {الحديث: ٥٨٩٤ = ٥٨٨٩ فم. تجريد البخاری/٤، لاپەڕە: ٣٦٢، رقم: ١٦٠٨/ = ٥٣٧٣، ٣٦٢٠، ٤٣٧٨، ٧٠٣٣، ٧٤٦١، ٤٣٧٤،

٣٦٢١، ٤٣٧٥، ٤٣٧٩، ٧٠٣٤، ٧٠٣٧. ترمــذى. رؤيــا: ٢٢٩٢. تحفــة الأشــراف: ٦٥١٨، ١٣٥٧٤}: [١٤٦٥]

ئيبنو عەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: بەسـەرینی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) موسـەیلەمەی درۆزن کەناسـراوە بـە موسـەیلەمەی کـەذذاب، هـات بـۆ مەدینـە، عەشـاماتێکی زۆری لەهۆزەکـەی خـۆی لەگەڵدا بـوو، دەیگوت:

ئەگـەر موحەممـەد لـەدوای خـۆی، کاروبـارو جێنـشینی خـۆی بـسپێرێ بەمن‌و بمکات بەجێنشینی خۆی، دێمـە سـەر دینەکـەی‌و پـەیڕەوی ئـەو دەکـەم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سابیتی کوڕی قەیـسی لەگەڵدا بـوو، کـە خـەتیب‌و وتـار خـوێنێکی زانـاو دانـابوو، چـوو بـۆلای موسـەیلەمە، هـەتا لەبەرچاوی هەمووان، ئیقامە حوججەی لەسەر بکات، وە لـەم کاتـەدا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پارچە چیلکەیەکی پەلکە خورمای بەدەستەوە بوو، کە گەیشتە لای موسەیلەمە لـەناو هۆزەکەیـدا بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەدیاری راوەسـتا، لـەپاش گوفتوگۆیـەك، کـەبرێتی بـوو لـەوە کـە موسـەیلەمە داوای جێنـشینی پێغەمبـەری کـرد، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) پێی فەرمووی: (ئەگەر داوای ئەم پارچە چیلکەیەشم لێ بکەی نایـدەم پێـت! چ جـای ئـەوەی کەبتکـەم بـە جێنـشینی خـۆم لـەدوای خـۆم، تـۆ نـاتوانی فـەرمانی خـودا سـەبارەت بـەخۆت بـشکێنی‌و رادەی ئـەوەت ناکـەوێ کـە ئـەو فەرمانەی خودا لەبارەی تۆوە بڕیـاری داوە بـەتۆ رەت نابێتـەوە، خـۆ ئەگـەر تـۆ لـەمن هەڵبگەڕێیتـەوە، خـودا لـە گلوگـۆت دەخـات، وات دەبیـنم کـەتۆ ئـەو

---

[١٤٦٥] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٦٠٨ - ٥٣٧٣ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥١٤ - ٥٨٩٤ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٧٠).

کابرایەیت کە بەخەو حاڵی بەدی ئەوم پێ نیشان دراوە، ئەوا من دەڕۆم ئەمە سابیتە چی قسەیەکت هەیە ئەو لەجیاتی من وەڵامت دەداتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجێی هێشتو ڕۆیشت. ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی ئەم خەونەی پێغەمبەرەوە، کە فەرمووی: (... وات دەبینم کەتۆ ئەو کابرایەیت کە بەخەو...) لەبارەی ئەم خەونەوە لە ئەبو هورەیرەم پرسی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نوستبووم لەخەوما دیم کە لەهەردوو دەستمدا دوو بازنی زێڕم دی، ئەوە خەمگینی کردم، لە خەوەکەمدا سرووشم بۆکرا: ئادەی فوویان لێ بکە، منیش فووم لێکردن، جا هەردووکیان بابردنیو فڕین، ئەو دوو بازنەم بەدوو درۆزن لێك دایەوە، کە لەدوای من شۆڕەتیان بڵاو دەبێتەوەو ناویان دەزڕێ، ئەو دوو فرە درۆزنە یەکێکیان ئەسوەدی عەنسی بوو، ئەویتریان: موسەیلەمەی کەززاب بوو، کە ئەسوەد لە صەنعاء بوو، موسەیلەمەیش لە یەمامە بوو). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ٥٥٣٢ ج/٤} + {تاج/٤، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٤٢٥٦ ج/٤}.

١٤٦٦- فَأَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا ، فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ أَنِ انْفُخْهُمَا ، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ بَعْدِي ، أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيُّ ، وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةُ»[١٤٦٦]

ئەم ژمارەیە بەشێکە لە ژمارە: (١٤٦٥).

١٤٦٧-وعن سَمُرَةَ بنِ جُنْدُبٍ رضي اللّه عَنْهُ قالَ: كَانَ رسُولُ اللّه صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم مِما يُكْثِرُ أنْ يقولَ لأصحابهِ: (هَلْ رَأَى أحدٌ مِنكُمْ مِن رؤيا؟» فيقُصُّ عليهِ منْ شَاءَ اللّه أنْ يقُصَّ. وَإِنَّهُ قال لنا ذات غَدَاةٍ: (إِنَّهُ أَتَاني اللَّيْلَةَ آتيانِ، وإنَّهُما قالا لي:

---

[١٤٦٦] بڕوانە ژمارە: (١٤٦٥) (بخارى رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٧٠).

انطَلقْ، وإنِّي انْطلَقْتُ معهُما، وإنَّا أتيْنا عَلى رجُلٍ مُضطَجِعٍ، وإذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِصَخْرَةٍ، وإذَا هُوَ يَهْوِي بالصَّخْرَةِ لِرَأْسِهِ، فَيَثْلَغُ رَأْسهُ، فَيَتَدَهْدهُ الحَجَرُ هَاهُنَا. فيتبعُ الحَجَرَ فيأخُذُهُ، فلا يَرجِعُ إلَيْه حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كما كان، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ، فَيفعلُ بهِ مِثْلَ ما فَعَل المَرَّةَ الأولى،» قال: قلتُ لهما: سُبْحانَ اللّهِ، ما هذان ؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فانْطَلَقْنا. فأَتيْنا عَلى رَجُل مُسْتَلْقٍ لقَفاه وَإذا آخرُ قائمٌ عليهِ بكَلُّوبٍ مِنْ حَديدٍ، وإذا هُوَ يَأْتي أحَد شِقَّيْ وَجْهِهِ فيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إلى قَفاهُ، ومنْخِرهُ إلى قَفاهُ، وَعينَهُ إلى قَفاهُ، ثُمَّ يتَحوَّل إلى الجانبِ الآخرِ فَيَفْعَل بهِ مثْلَ ما فعلَ بالجانب الأول، فَما يَفْرُغُ مِنْ ذلكَ الجانب حتَّى يصِحَّ ذلكَ الجانِبُ كما كانَ، ثُمَّ يَعُودُ عليْهِ، فَيَفْعَل مِثْلَ ما فَعلَ في المَرَّةِ الأولى. قال: قلتُ: سُبْحَانَ اللّه، ما هذان ؟ قالا لي: انْطلِقْ انْطلِقْ، فَانْطَلَقْنا. فَأتَيْنا عَلى مِثْل التَّنُّورِ فَأَحْسِبُ أنهُ قال: فإذا فيهِ لَغَطٌ، وأصْواتٌ، فَاطَّلَعْنا فيهِ فَإذَا فِيهِ رجالٌ ونِساء عُرَاةٌ، وإذا هُمْ يأتِيهمْ لَهَبٌ مِنْ أَسْفلِ مِنْهُمْ، فإذا أتَاهُمْ ذلكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوُا، قلتُ ما هؤلاءِ ؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ،فانْطَلَقْنا. فَأَتيْنا على نهرٍ حسبْتُ أنهُ كانَ يقُولُ: (أَحْمرُ مِثْلُ الدَّمِ، وإذا في النَّهْرِ رَجُلٌ سابِحٌ يَسْبحُ، وَإذا على شَطِّ النَّهْرِ رجُلٌ قَد جَمَعَ عِندَهُ حِجارةً كَثِيرَة، وإذا ذلكَ السَّابِحُ يسبح ما يَسْبَحُ، ثُمَّ يَأتِيْ ذلكَ الذي قَدْ جَمَعَ عِنْدهُ الحِجارةَ، فَيفْغَرُ لهَ فاهُ، فَيُلْقِمُهُ حجراً، فَيَنْطَلِقُ فَيَسْبَحُ، ثُمَّ يَرْجِعُ إليهِ، كُلَّمَا رجع إليْهِ، فغَر فاهُ لهُ، فَأَلْقمهُ حَجَراً، قلت لهما: ما هذان ؟ قالا لي: انْطلِقْ انطلِق، فانْطَلَقنا. فَأَتَيْنا على رَجُلٍ كريهِ المَرْآةِ، أوْ كأَكرَهِ ما أنت رَاءٍ رجُلاً مَرْأى، فإذا هو عِندَه نارٌ يحشُّها وَيسْعى حَوْلَهَا، قلتُ لهما: ما هذا ؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطلِقْ، فَانْطَلقنا. فَأَتَينا على روْضةٍ مُعْتَمَّةٍ فِيها مِنْ كلِّ نَوْرِ الرَّبيعِ، وإذا بيْنَ ظهْري الرَّوضَةِ رَجلٌ طويلٌ لا أكادُ أرى رأسَهُ طُولاً في السَّماءِ، وإذا حوْلَ الرجلِ منْ أكثر ولدان ما رَأَيْتُهُمْ قطٌّ، قُلتُ: ما هذا ؟ وما هؤلاءِ ؟ قالا لي: انطَلقْ انْطَلِقْ فَانْطَلقنا. فَأتيْنَا إلى دَوْحةٍ عظِيمَة لَمْ أر دَوْحةً قطٌّ أعظمَ مِنها، ولا أحْسنَ، قالا لي: ارْقَ فيها، فَارتَقينا

فيها، إلى مدينةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذهبٍ ولبنِ فضَّةٍ، فأتَينا باب المَدينة فَاسْتفتَحْنَا، فَفُتحَ لَنا، فَدَخَلناهَا، فَتَلَقَّانَا رجالٌ شَطْرٌ مِن خَلْقِهم كأحْسنِ ما أنت راءٍ، وشَطرٌ مِنهم كأقْبحِ ما أنتَ راءٍ، قالا لهم: اذهبوا فقَعُوا في ذلك النَّهْر، وإذا هُوَ نَهرٌ معتَرِضٌ يجْري كان ماءَهُ المحضُ في البياض، فذهبُوا فوقعُوا فيه، ثُمَّ رجعُوا إلينا قد ذَهَب ذلكَ السُّوءُ عَنهمْ، فَصارُوا في أحسن صُورةٍ.قال: قالا لي: هذه جَنَّةُ عدْن، وهذاك منزلُكَ، فسمَا بصَري صُعداً، فإذا قصر مِثلُ الرَّبابة البيضاءِ. قالا لي: هذاك منزِلُكَ. قلتُ لهما: بارك اللّه فيكُما، فَذراني فأدخُلْه. قالا: أما الآن فلا، وأنتَ داخلُهُ. قلت لهُما: فَإنِّي رأيتُ مُنْذُ اللّيلة عجباً ؟ فما هذا الذي رأيت ؟ قالا لي: إنَا سَنخبرُك. أمَّا الرجُلُ الأوَّلُ الذي أتَيتَ عَليه يُثلَغُ رأسُهُ بالحَجَرِ، فإنَّهُ الرَّجُلُ يأخُذُ القُرْآنَ فيرفُضُه، وينامُ عن الصَّلاةِ الكتُوبةِ. وأمَّا الذي أتَيتَ عَليْهِ يُشرْشرُ شِدْقُه إلى قَفاهُ، ومَنْخِرُه إلى قَفاهُ، وعَيْنهُ إلى قفاهُ، فإنه الرَّجُلُ يَغْدو مِنْ بَيْتِه فَيكذبُ الكذبةَ تبلُغُ الآفاقَ. وأمَّا الرِّجالُ والنِّساءُ العُراةُ الذين هُمْ في مِثل بناءِ التَّنُّور، فإنَّهم الزُّناةُ والزَّواني. وأما الرجُلُ الّذي أتَيْت عليْهِ يسْبَحُ في النَهْرِ، ويلْقمُ الحِجارة، فإنَّهُ آكِلُ الرِّبا. وأمَّا الرَّجُلُ الكَريهُ المَرآةِ الذي عندَ النَّارِ يَحُشُّها ويسْعى حَوْلَها فإنَّهُ مالِكُ خازنُ جهَنَّمَ. وأما الرَّجُلُ الطَّويلُ الّذي في الرَّوْضةِ، فإنه إبراهيم، وأما الوِلدانُ الذينَ حوْله، فكلُّ مُوْلود ماتَ على الفِطْرَةِ) وفي رواية البَرْقَانِي: (وُلِد على الفِطْرَةِ). فقال بعض المسلمينَ: يا رسول اللّه، وأولادُ المشركينَ ؟ فقال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «وأولادُ المشركينَ). وأما القوم الذين كانوا شطر منهم حسن وشطر منهم قبيح فإنهم قوم خلطوا عملاً صالحاً وآخر سيئاً تجاوز الله عنهم. رواه البخاري. وفي رواية له: (رأيتُ اللّيلَةَ رجُلَين أتَياني فأخْرجاني إلى أرْضٍ مُقدَّسةٍ) ثم ذكَره. وقال: (فانطَلَقْنا إلى نَقبٍ مثل التنُّورِ، أعْلاهُ ضَيِّقٌ وأسْفَلُهُ وَاسعٌ، يَتَوَقَّدُ تَحتهُ ناراً، فإذا ارتَفعت ارْتَفعُوا حَتى كادُوا أنْ يَخْرُجوا، وإذا خَمَدت، رَجَعوا فيها، وفيها رجالٌ ونساء عراةٌ. وفيها: حتى أتَينَا على نَهرٍ من

دَم، ولم يشك فيه رجُلٌ قائمٌ على وسط النَّهرِ، وعلى شطِّ النَّهر رجُلٌ، وبيْنَ يديهِ حجارةٌ، فأقبل الرَّجُلُ الذي في النَّهرِ، فإذا أراد أنْ يخْرُجَ، رمَى الرَّجُلُ بحجرٍ في فِيه، فردَّهُ حيْثُ كانَ، فجعلَ كُلَّمَا جاءَ ليخرج جَعَلَ يَرْمِي في فيه بحجرٍ، فيرْجِعُ كما كانَ.وفيهَا: (فصعدا بي الشَّجَرةَ، فَأدْخلاني داراً لَمْ أر قَطٌّ أحْسنَ منْهَا، فيها رجالٌ شُيُوخٌ وَشَباب). وفِيهَا: (الَّذي رأيْتهُ يُشَقُّ شِدْقُهُ فكَذَّابٌ، يُحدِّثُ بالْكذبةِ فَتُحْملُ عنْهَ حتَّى تَبْلُغَ الآفاق، فيصْنَعُ بهِ ما رأيْتَ إلى يوْم الْقِيامةِ). وفيها: (الَّذي رأيْتهُ يُشْدَخُ رأسُهُ فرجُلٌ علَّمهُ اللَّه الْقُرآنَ، فنام عنهُ بِاللَّيْلِ، ولَمْ يعْملْ فيه بِالنَّهَارِ، فيُفْعلُ بِه إلى يوم الْقِيامةِ). والدَّارُ الأولى التي دخَلْتَ دارُ عامَّةِ الْمُؤمنينَ، وأمَّا هذه الدَّارُ فدَارُ الشُّهَداءِ، وأنا جِبْريلُ، وهذا مِيكائيلُ، فارْفع رأسَك، فرفعتُ رأْسي، فإذا فوقي مِثلُ السَّحابِ، قالا: ذاكَ منزلُكَ، قلتُ: دَعاني أدْخُلْ منزلي، قالا: إنَّهُ بَقي لَكَ عُمُرٌ لَم تَستكمِلْهُ، فلَوْ اسْتَكْملته، أتيت منْزِلَكَ) رواه البخاري: [١٤٦٧]

سەموورەی کوڕی حوندوب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گەلێ جاران بەیارانی خۆی دەفەرموو: کەستان خەونێکی بینیوە تا بیگێڕێتەوە بۆمان؟ جا ئەوکەسەی کەمەیلی خودای لەسەربوایە خەوی خۆی بۆحەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگێڕایەوە. هەتا بەیانییەك خۆی بە ئێمەی فەرموو: ئەدی من ئەمشەو دوو فریشتە هاتن بۆلام پێیان گوتم: وەرە منیش لەگەڵیان دا ڕۆیشتم هەتا گەیشتینە لای کابرایێ لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشابوو، پیاوێکی تریش خرکێکی (خرك: بەردێکە پڕ بەمشت – فەرهەنگی خاڵ) پێ بوو، لەسەر سەری وەستا بوو، تلە بەردەکەی دەماڵی بەتەپڵی سەری دا، ئیتر کەللەی شەق و پەق دەبوو، گشت جارێ کە پەڵە

---

[١٤٦٧] تجريد/٢، ژمارە: ٥٦٦١ – ١٣٨٦، ٧٠٤٧ بخاری. مسلم: ٥٨٩٦، ترقيم شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٩١ رقم الباب/٤٨).

بەردەکەی دەکێشا بەسەری کابرادا بەردەکە خلۆر دەبۆوەو گل دەبوەوە بەملاو بەولادا، ئەویش دوای دەکەوت‌و ئەچوو ئەیهێنایەوە، تا دەهاتەوە سەری کابرا وەك خۆی سارێژ دەبوەوەو وەك جاران چاك دەبوەوە جا ئەویش دیسان دەیکێشایەوە پیاداو وەك جاری جارانی لێ دەکردەوە! فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ) پێیانم گوت: نامەخوا لەکاری خوا چەند سەیرە! ئەمە چییە؟ فەرموویان پێم: جارێ بابرۆین، جا رۆیشتین تا چوینە لای کابرایەکی تر، لەسەر گازەرەی پشت پاڵ کەوتبوو زەلامێکی تریش بەقولاپێکی ئاسنەوە بەسەر سەریەوە ڕاوەستا بوو خۆش خۆش پەلاماری لایێ لەڕووی کابرای ژێردەستی دەداو بەقولاپەکە لالغاوەی هەتا پشتە ملی‌و کونە چاوی هەتا پشتملی هەڵ دەتلێشان، ئینجا دەیگواستەوە بۆئەولاکەی تری ئەویشی والێ دەکرد ئیتر تا ئەم لای وا لێ دەکردەوە ئەولاکەی تری چاك دەبوەوەو وەك خۆی لێ دەکردەوە! ئیتر هەروەها. فەرمووی: گوتم: نامە خوا سەیرە! ئەم دووانە چین؟ پێیان فەرمووەوە جارێ برۆ، جا ڕۆیشتین هەتا چوینە دیار شتێ وەك تەندوور وابوو، وابزانم فەرمووی: زڵە زڵ‌و دەنگە دەنگی لێوەدەهات‌و پڕی لەقاوقیژ بوو کەسەیری ناوەکەیمان کرد پڕبوو لەپیاوو ژنی ڕووت‌و قوت لە ژێریانەوە بڵێسەی ئاگر زمانەی دەکێشاو بۆیان دەچوو جا کە ئاگرە سوورەکە پەلاماری دەدان هاواریان لێهەڵدەساو دەیان کرد بەهەراو زەنا! گوتم: ئەمانە چین؟ پێیان گوتمەوە: جارێ بابڕۆین، ئەوسا کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە سەر قەراغ ڕووبارێ، وا دەزانم فەرمووی: چۆمەکە سورێکی تلیقی بوو وەکوو خوێن. کابرایەکی مەلەوان لەناوی دا مەلەی دەکرد، پیاوێکیش لەسەر لێواری چۆمەکە پەڵە بەردێکی زۆری لەبەر دەستا بوو گشت جارێ کە کابرای مەلەوان بەمەلە دەهات دەچوو بۆلای ئەوەی کە کۆمەڵە بەردەکەی لەلابوو، دەمی بۆی

دادەچەقاند ئەویش بەردێکی دەکێشا بەناو دەمیا، دەیخنیە ناو دەمی‌و تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشووی، ئیتر هەموو جارێ لەسەر ئەم شێوەیە تلێکی دەماڵی بەدەم‌و قەپۆزیا، کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، پێیانم گوت: ئەم دوانە چین؟ پێیان فەرمووم: بابڕۆین، دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە لای زەلامێکی ئێسك قورس یا فەرموی: کە زەلامێکی ڕمزا قورسی وا لەوە ڕمزا قورستر بەچاوی خۆت نەبینیبێ! ئاگرێکی لەبەردەم دا بوو خۆش خۆش هەر ئاگرەکەی خۆش دەکردو بەدەوری دا دەهات پێم گوتن ئەمە چییە؟ فەرموویان پێم: جارێ بابڕۆین، دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە ناو مێرگ‌و مێرغوزارو باخێکی چڕ، پڕ بوو لەهەموو جۆرە گوڵ‌و گوولێکی بەهارە، تەماشامان کرد وا لەناوەراستی باخەکەدا پیرە مێردێکی بالآبەرز لەبن شێخەڵێکی گەورەدا دانیشتبوو، ئەم ئیختیارە ئەوەندە قوچ‌و درێژ بوو، سەریم بەئاستەم لەئاسمانا دەبینی، مناڵێکی زۆرو بێشوماری لەدەور بوو، قەت کۆمەڵە مناڵی وا زۆرم نەدیوە، گوتم: ئەم پیاوە چییەو ئەم مناڵانە چین؟ پێیان فەرمووم: جارێ بابڕۆین، ڕۆیشتین تا چوینە لای شا درەختێکی گەلێ گەورە کە لەژیانم دا شا درەختی وا گەورەو جوانم قەت نەدیوە، پێیان فەرمووم: ئادەی پیادا سەرکەوە! جا بەو شێخەڵەدا سەرکەوتین، گەیشتینە لای شارێ، دیوارەکانی لە خشتێکی زێرو لە خشتێکی زیو دروست کرابوو، جا چووینە بەر دەروازەی دەرەوەی شارەکەو لەدەرگای شارەکەمان داو، داوای کردنەوەمان کردو دەرگاکەیان بۆمان کردەوەو چووینە ناوی، توشمان بوو بە توش پیاوگەلێکی گەلێ سەیرەوە، نیوەی لەشیان تا بڵێی جوان بوو، ئەو نیوەکەی تریشیان تا بڵێی ناشیرین بوو، دوو فریشتەکە پێیان گوتن: ئادەی بڕۆن خۆتان بخەنە ناو ئەو چەمەوە، چەمەکە رووبارێکی پان‌و پۆڕ بوو، ئاوەکەی پڕ بە پانایی چەمەکە دەکشاو

دەرۆی، ئاوەکەی ئەوەندە سپی بوو دەتگوت چڕی خوری شیرە! ئەوانیش چوون خۆیان هەڵکێشا لەو ئاوە لەپاشا هاتنەوە بۆلای ئێمە، یەك دەنك چییە ناشیرینیان پێوە نەمابوو ئەوەندە جوان بوو بوون نەبێتەوە! چووبوونە جوانترین شێوە. فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوجا فەرموویان پێم: ئەم شارە بەهەشتی مانەوەی یەکجارییە، هۆ ئا ئەوەش لەوسەرەوە هەوارگەی تۆیە، کە چاوم سەرەو زوور هەڵبڕی، وا کۆشکێکی بالا بە ئاسمانەوە دیارە، دەڵێی پەڵە هەوری سپییە، گوتیان پێم: ئەو تەلارە شوێنی تۆیە،

گوتم پێیان: پیرۆزیی خوداتان لێ بێ، دەی وازم لێبێنن با بۆخۆم بچمە ناوی، فەرموویان: هەر دەچیتە ناوی وەلێ ئێستاکە نا. پێیانم گوت: بەڕاستی ئەم شەو من شتی سەیرو عەنتیکەم بینی، ئەرێ پێم ناڵێن ئەمە چی بوو کەمن دیم؟ پێیان فەرمووم: بەڵێ، وا هەواڵت دەدەینێ پیاوی یەکەم کەدیت بەبەرد سەریان دەشکاند ئەوە ئەو پیاوەیە کە لەپێشا قورئان لەبەر دەکاو لەپاشا لەبیری خۆی دەباتەوەو دەوری ناکاتەوە تا لەبیری نامێنێ‌و لەهەمان کات دا نوێژی فەرزیش بۆ خەو دەچێنێ! ئیتر ئەمە هەتا رۆژی قیامەت هەروای لێدەکرێ.

ئەو کابرایەش کە چووین بەسەری دا، لا لغاوو لووتو چاویان هەتا پشتەملی دەدڕی، ئەوە ئەو پیاوەیە کە لەماڵ دەردەچێ‌و درۆیێ هەلاتێ هەڵدەبەستێ‌و لەدەمی ئەوەوە بەهەرچوار لادا بڵاو دەبێتەوە! ئەویش هەتا رۆژی قیامەت ئەوە حاڵیەتی.

ئەو پیاوگەڵو ژنگەلە ڕووتو قوتانەش کەلەناو نیمچە تەنوورخانەکەدا بوون ئەوانیش پیاوی شەرواڵ پیس‌و ژنی داوێن پیس بوون.

ئـەو کابرایـەش کـەدیت لـەناو چـۆمەکەدا مەلـەدەکاو بـەردی دەرخـوارد دەدەن ئەوە سوو خۆر بوو.

زەلامە ڕەزا تاڵەکەش کەخۆش خـۆش ئاگرەکـەی خـۆش دەکـردو لـەدەوری ئەهاتو ئەچوو ئەویش مالیکی ئاگردانی دۆزەخ بوو.

پیاوە کەڵەگەتەکەش کەلەناو باخەکەدا بوو ئەویش ئیبراهیم بـوو دروودو سلاوی خوای لەسەر بێ ئەو منداڵانەشی کە لەدەوری بوون، ئـەوە ئـەو منداڵانـە بوون کەلەسەر ئایینی سروشتی خواکرد مردبوون کە ئایینی پاکی ئیسلامە.

لـە گێڕانەوەیـەکی تـری بـەرقانی دا: ئـەوە ئـەو منداڵانـەبوون کەلەسـەر ئیسلامەتی لەدایك بوون، جا بـازێ لەموسـوڵمانان گوتیـان: ئـەدی باشـە قوربـان ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەی منـاڵی هاوبەشـپەیدا کـەرەکان و منـداڵانی ناموسـوڵمانەکان چـی؟ فـەرمووی: منـداڵانی ئـەوانیش حاڵیـان حـاڵی منداڵـە موسوڵمانەکانە.

ئەو کۆمەڵە پیاوەش کە لایەکی لەشیان جوانو لایـەکی لەشـیان ناشـیرین بـوو ئەوانـەن کەلـە چاكو خـراپ تێیـان گوشـیوەو کـردەوەی بـاشو کـردەوەی خراپیان هەیە، ئەوەبوو خودا چاوپۆشی لێکردنو لێیان خۆش بوو. (بوخـاری — ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

لـە گێڕانەوەیـەکی تـری بوخـاری دا (کـە ئەمـە دەقەکەیـەتی لـە تـاجول ئوصول دا): سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خوای لـێ بێ) گوتی: گەلـێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی بۆمان دەکرد، ڕووی تـێ دەکـردینو دەیفـەرموو: کەسـتان ئەمـشەو خـەونی نـەدیوە؟ جـا ئەگـەر کەسـێ خەونێکی بدیبایە ئەوا ئەیگێڕایەوە، پێغەمبەریش (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئەوەندەی خوا مەیلی لەسەر بوایە لێکـی دەدایـەوەو خـەو پـەرژینی دەکـرد. جا

ڕۆژێ لێمانی پرسی، فەرمووی: ئەرێ کەستان خەونی دیوە؟ عەرزیمان کرد: نەخێر، فەرمووی: بەڵام من ئەم شەو لە خەونم دا دوو پیاوم دی هاتن‌و دەستیان گرتم‌و بردمیان بۆ خاکی پاکی پیرۆز، بۆ وڵاتی شام، لەوێ تەماشام کرد وا کابرایێ دانیشتووەو پیاوێکیش قولاپێکی ئاسنینی بەدەستەوەیە... تا دەگاتە ئەوەی: کە دەفەرموێ: جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای کونێ لەسەرەوە تەسك‌و لەبنەوە پان‌و دەڵب بوو، تەماشام کرد پڕبوو لەپیاوو ژنی زۆر، ئاگر لەژێری دا دەسووتاو بڵێسەی ئاگرەکە نێڵە نێڵی دەهات، جا کەتاوی دەسەند ئاوەکەی ناوی دەکوڵاو قوڵپە قوڵپی دەکردو زەلامەکانی ناوی وەك دەنکی دانوولەی سەر ئاگر چۆن لەکاتی قوڵتە قوڵت دا هەڵبەزو دابەز دەکا ئەوانیش ئاوا بەرز دەبوون‌و خەریك بوو هەڵبچن! بەڵام کە گڕپەو کڵپەی ئاگرەکە کپ دەبوو دەکەوتنە بنەکەی، گوتم: ئەمە چییە؟ گوتیان جارێ بڕۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر ڕووبارێکی خوێن، کابرایێ لەناوی دا بەپێوە وەستا بوو، پیاوێکیش لەسەر قەراغی چۆمەکە بوو، خڕە بەردێکی زۆری لەبەردەست دا بوو، گشت جارێ کە کابرای ناو چۆمەکە دەهات دەربچێ لێی کە دەگەیشتە لای ئەو بەردێکی چاکی دەماڵی بەناو دەمیاو تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشوی، ئیتر هەموو جارێ هەروا، گوتم: ئەی ئەمە چییە؟ گوتیان: جارێ بڕۆ، جا کەوتینە ڕێ هەتا گەیشتینە لای باخێکی سەرتاپا سەوز، درەختێکی گەورەی تێدابوو (ناوی سیدرەتولونتەها) بوو، واتە: دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ، پیرە مێردێکی نورانی لەبن دا بوو، منداڵێکی زۆر زۆری لەدەور بوو، پیاوێکی تریش لەنزیك درەختەکەوە ئاگرێکی لەبەردەم دا بوو، هەر ئاگرەکەی خۆش دەکرد، ئینجا دوو فریشتەکە منیان بەو شێخەڵەدا سەرخست‌و بردمیانە ناو خانوویەکەوە، قەت خانووی وا جوانم نەدیووە، پڕبوو لە پیاوی پیرو لە لاوو

لەژن و لە منداڵ، ئەنجا لەوێ هێنامیانە دەرەوەو دیسان بە شێخەڵەکەدا زیاتر سەریان خستم و بردمیان تا بردمیانە ناو خانوویەکی ترەوە، کە گەلێ لەخانووی پێشوو جوانترو باشتر بوو، پڕی لە پیرو لاو بوو، ئەوجا گوتم: ئەرێ ئەم شەو منتان سوڕانەوە، دەپێمبڵێن ئەمەی من دیم چی بوو؟ فەرموویان: بەڵێ، باشە ئەوەی کە دیت لا شەویلگەیان هەڵ دەدڕی ئەوە ئەو درۆزنەیە کە درۆیێ هەڵدەبەستێ و لەدەمی ئەوەوە دەماو دەم دەکەوێ بەگشت لادا بڵاو دەبێتەوە. ئیتر ئەوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەرواى لێ دەکرێ، ئەومیشی کەدیت سەریان دەشکاند ئەوە ئەو پیاومیە کە خودای گەورە فێری قورئانی کردووە کەچی بەشەو دەخەوێ و دەوری ناکاتەوەو بەڕۆژیش ڕەفتاری پێ ناکا، تا ڕۆژی قیامەت هەرواى لێ دەکرێ، ئەوانەشی کەلەناو جوڕنەکەدا[1] بوون ئەوانە شەڕواڵپیسەکان بوون، ئەومیشی کەلەناو چۆمەکەدا دیت بەردەکەیان دەماڵی بەدەم و فلچیا، ئەوە سوو خۆر بوو، پیرەمێردەکەی ژێر درەختەکەش ئیبراهیم بوو دروودو سڵاوی لێ بێ، منداڵەکانی دەوریشی منداڵانی ئەو خەڵکە بوون، واتە: ئەو منداڵانەن کە لەپێش ڕەسیدەبوون دا دەمرن ئەو پیاومیش کە لەنزیکی درەختەکەوە ئاگرکەی خۆش دەکرد ئەوە مالیکی وەردیانی دۆزەخ بوو، خانووی یەکەمیش کە چویتە ناوی خانوی سەرتاپای تێکڕای موسوڵمانان بوو، ئەم خانووە هەرە بەرزو چاك و نایابەش ماڵی شەهیدانە! منیش جوبرائیلم و ئەمەیش کەوا لەگەڵم دا میکائیلە، ئادەی سەرت هەڵبڕە، کە سەرمم هەڵبڕی لەژوور سەرمەوە شتێکم دی وەك پارچە هەور وابوو بەحەواوە، فەرموویان: ئەومیش بەو بەرزەوە هەوارو بارەگای تۆیە، گوتم: دەلێمگەڕێن با بچمەوە ناو

---

[1] جوڕنە: جوڕنی حەمام عەماری ئاوە گەرمەکەیەتی.

ماڵەکەی خۆم، فەرموویان هێشتا تەمەنت بەبەریەوە ماوە، کەی تەمەنت تەواو بوو دێیتە ناو ماڵی خۆت. (بوخاری ڕەحمەت لە گۆڕی نازداری).

ئەگەر کەسێ بەچاوی ئینساف بە لێزانانە بە وردی سەرنجێکی دڵسۆزانەی تەرجەمەو وەرگێڕاوی ئەم حەدیثە درێژانە بدا، یاخود بەوردی وردبێتەوە لەو حەمکە عیبارەتە ڕەقەو لەو گشت وشەگەلە سەختەولەو حەمکە قسە نەستەقانەی کەوان لەناو زۆربەی مەتن‌و بڕبڕەو مۆرەغەی ئەم فەرمایشتانەدا، کەوان لەناو ریاض‌والصالحین‌و تاجول ئوصوڵ‌و تەجریدی بوخاری‌و پوختەی موسلیم‌و بلوغ المرام‌و (اللؤلؤ والمرجان)دا، ڕەزای خوا لەدانەرەکانیان بێ کە لەسایەی خوداوە بەندە وەك موسوڵمانێکی دڵسۆزی دڵپاك‌و کوردێکی دڵسۆزی ئاوو خاك وەرم گێڕاونەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، وە بە کوردییەکی پەتی ڕەوانی ڕەسەن دامرشتوون، کە بەدیمەن خۆش‌و ئاسانە، بەڵام وەکی تر هەتا بڵێی سەخت‌و گرانە، دەڵێم: ئەگەر کەسێ سەرنجێکی وردی ئاوا بگرێ، ئەگەر تۆزێ هەستی موسوڵمانێتی‌و مەردایەتی‌و نەتەوایەتی تێدابێ، بەزمانی قاڵ‌و بەزمانی حاڵ دەڵێ:

ئـــایین ڕەحمەتـــە، ئیـــسلام گەوهـــەرە
زمـــان هونـــەرە، کـــوردی شـــەکەرە!

هەروەك هەست دەکا کە ئەم تەرجەمەیە پرۆژەیەکی ئایینی‌و ئەدەبی زۆر فراوان‌و گەورەیە، توانیویەتی تا ڕادەیێ سەرکەوتوانە کەلەپوری ئایینی‌و کۆمەڵایەتی‌و وێژەیی سەدەی یەکەم‌و دووەمی ئیسلام، زۆر بەباشی رابگوێزێتەوە بۆسەر زمانی شیرینی کوردی‌و پێشکەشی بکا بەنامەخانەی ئاوەدانی کوردی، خودا بەمیهری خۆی ئاوەدانتری بکا... ئامیین.

دڵنیام هەندێ لەنوسەرە نۆکارە بێکارەکانمان بەندە بە نۆکەر دادەنێن، چونکە هەندێ نوسەری ئاخر زەمان پەیدا بوون، دەڵێی جندۆکەی چیای قافن! هەرچی (بسم الله)ی پێوە بێ ئەوان سڵی لێ دەکەنو دەڵێن: هەتاکەی ئەم کۆنە پەرستییە؟ هەتا کەی ئەم بێگانە پەرستییە؟ هەتا کەی ئەم ئەفسانەو ئوسطورانە؟ هەتاکەی ئەم قەوانە کۆنانە؟ هەیانە دەڵێ: من بەپارەش ئەم کتێبانە ناخوێنمەوە! داخەکەم ئەم نووسەرە چەواشانە گەورەترین کۆسپی سەختو ناخۆشترین بەرهەڵستن کە ناهێڵن ئەم جۆرە کتێبە مەزنانە جێگەی خۆیان بگرن لەناو نامەخانەی کوردی دا! خوا یاربێ، نەبۆ ریاییو نەبۆ خۆپەسەندی دەڵێم، بەڵکوو بۆ بەیانی حاڵو رووی ڕاستی دەڵێم، مەگەر هەرخۆم بزانم بە چ چنگە کرێو کوێرەوەرییەك ئەم تەرجەمانەم بەئەنجام گەیاندووە، وەچەندە ئەرکو زەحمەتم پێوە کێشاون، لەناو چەند چەکمەچەو سندوقو دۆلابو پێچو پەنادا شاردومنەتەوە تا نەسوتێنو نەفەوتێن، لەو شوێنانەی کەمن خەریکی ئەم ئەرکە پیرۆزە دەبووم ئەگەر قاچاخچیشم بەچەکەوە بکردایە هەرئەوەندە مەترسی بۆم دەبوو! هەیش بوو بەزمانەکەی خۆیان دەیفەرموو: ئەوە چۆن کفرێکە ئەم حەدیثە پیرۆزانە تەرجەمە دەکەی بەم زمانە هیچو پووچەی خۆتان؟!

وەلێ من بڕوام بەخودای خۆم هەبوو، کەمن نە قاچاغچیمو نەکافرم، وەنە کۆنەپەرستو نە بێگانە پەرستم، بەڵکوو بە خزمەتی ئیسلام خوا یاربێ خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان لەخۆم ڕازی دەکەم، لەهەمان کات دا خزمەتی وێژەو زمانو ئایینی گەلی خۆشم دەکەم! بەئومێدی ئەوەی کە چاوپۆشی لەهەڵەو کەمو کورتیم بکەن!

**لەکۆتایی ئەم قسەیەدا، من ئەم پرسیارە ئاراستەی ئەو پرۆفیسۆرە کوردانە دەکەم:**

ئەم حەدیثانە کەمن تەرجەمەیان دەکەم بۆسەر زمانی شیرینی کوردی، بەگشت زمانە زیندووەکانی جیهان تەرجەمە کراون، وەك: ئینگلیزی، ڕووسی، فەڕەنسی، هیندی، صینی، فارسی، تورکیو ئیسپانیو...تاد. جا گوایە ئەم حەمکە گەلو میللەتو نوسەرو وەرگێڕانە گشتیان هەر کۆنە پەرستو تێنەگەیشتوو بوون؟!

برا! کورد گوتەنی: من بۆتۆمە، ئەی تۆ بۆ کێتە؟ کوڕە! مەردو گوردو کورد بن، بزانن نوسینو خوێندنو خوێندنەوە نانو ئاوی میللەتن هەتا زۆربن کەمن!

نامەخانەی کوردی وەکوو باخو بیلاخو مێرگو مێرغوزاری تەڕی بەهاری کوردستان وایە، دەبێ لەهەموو جۆرە گوڵێکی ڕەنگو بۆنداری تێدا بێ، گوڵی موتوربە کراوی لەگوڵی سادەی نازدارتر بێ!

من لەم ڕازو گلەییەدا ڕووی دەمم لە مرۆڤی موسوڵمان نییە، چونکە لەخودا بەزیاد بێ، ئەم کارەی من لەناو کۆمەڵگای ئیمان داران دا وەك چراو پەروانە وایە!.[1]

---

[1] ئەمرۆ لەمزگەوتی گەورە ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، بەڕاستی کە ئەو هەمکە لاوە خوێن گەرمو ئازاو بەجەرگو لەخودا ترسم بینی، کەئاوا بۆ ئیسلام تێدەکۆشن، لەحاڵی خۆم تەریق بوومەوە، کەوا لەم پاییزی تەمەنەدا ئەوەندە خۆپەرستو گوێ لەمشتی نەفسو ئارەزوو بازیم. (وەرگێڕ)

لەخوا داوادەکەم کە بەکەرەمی خۆی لەهەڵەی هەموو لایەکمان خۆش بێو لەخۆبایی‌و چەواشەمان نەکا، وە ئەم وەرگەڕاوە پیرۆزانەیش بکا بەسەر مەشق‌و ڕچە شکێن بۆ ئایندەمان‌و بیانکا بە توێشووی هەردوو جیهانمان!.

دڵنیام لەوە کە نامەخانەی ئاوەدانی کوردی رۆژ بەرۆژ لەگەشەکردنایە، لەبەرئەوە گومانی تێدانییە کەلە ئایندەیەکی پڕ لە خۆشی‌و ئاسودەیی دا کەڵە نوسەری کوردی مەردی موسوڵمانی پاکی وا پەیدا دەبێ، بەخامەی شەکەر رێژی خۆی ئەم جۆرە کتێبەکەم مانەندانە دەکاتە کوردی، کە ئەم کارە نیوەچڵو کەم‌و کوڕەی مـن لەچاو هی ئەودا وەك گڕوگاڵی منداڵ وادەبێ، وەلێ ئەم گوتەیە ڕەوایە:

پاشینان گەرچی شاکاریان جوانە

وەلێ بەهرەی گەورە هی پێشینانە !

وەرگێڕ – ١٩٩١/٩/٢٢

## ٤٣- كِتَابُ الفَضَائِل
## نامەی گەورەیی‌و پایەبەرزی‌و بەهرەمەندی

{بڕوانە: تاجول ئوصول بە كوردی، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ١، لاپەڕە: ٥٣٠، لە ژمارە: ٣٢٢١وە هەتا تەجریدی بوخاری بە كوردی، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ١٣٧، زنجیرە: ٦٦وە هەتا زنجیرە: ٦٧، لە ژمارە: ١٤٤٩وە هەتا ژمارە: ١٥٢٢ + مختصر صحیح مسلم، بە كوردی بەرگی چوارەم لاپەڕە/١٨٧ چاپی یەكەم لە ژمارە: (١٥٢٣)وە هەتا ژمارە: ١٦٠٤}.

### (٣) باب في معجزات النَّبي (ﷺ)
### باسی موعجیزەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

١٤٦٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضي اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ قَالَ: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَانَتْ صَلَاةُ الْعَصْرِ فَالْتَمَسَ النَّاسُ الْوَضوءَ فَلَمْ يَجِدُوهُ فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضوءٍ فَوَضعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ الْإِنَاءِ يَدَهُ وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضئُوا مِنْهُ قَالَ فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ حَتَّى تَوَضئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ) (الحديث ١٦٩ــ أطرافه في: ١٩٥، ٢٠٠، ٣٥٧٢، ٣٥٧٣، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥).[١٤٦٨]

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: نزیكی نوێژی عەصر بوو، روانیم یاران دەگەڕان بۆ ئاو بۆ دەستنوێژ، ئاو نەبوو، تالەجامێكا هەنێ ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ دەسنوێژ، پێغەمبەر (دروودی

---

(١٤٦٨) تجرید/١، ژمارە: ١٣٠ = ١٦٩ بخاری. مسلم: ٢٢٧٩ = ٥٩٠١ شیحا + پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٢٩ = ٥٩٠٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤ رقم الباب/٣٢).

خـوداى لەسـەر بـێ) دەسـتى خـستەناو دەفرەكـەوەو دەسـتوورى دا بەخەڵكەكـە دەسـتنوێژى لێ بگـرن، بەچـاوى خـۆم دەمـدى كەئاوەكـە لـەنێوانى پەنجـەكانى پێغەمبــەرەوە (دروودى خــوداى لەســەر بــێ) وەك كــانى هەڵدەقوڵايــە نــاو جامەكەوە، ئيتر عەشامەتەكە هەتا دوا كەسيان لـەو ئـاوە دەسـتنوێژيان گـرت!).
(ش/ ت ـ تاج/ ٤/ ٣٣٤/ ٢+ ١+ ٣+ ٤ تاج-٣ ز-١٠٤ ژ-٣١٧١، ٣١٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٤).

ئەمــەيش دەقێكـى تــرى ئــەم فەرموودەيــە، لـەژمارە (١٥٢٩)ى پوختــەى موسليمدا:

عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابَهُ بِالزَّوْرَاءِ (قَالَ: وَالزَّوْرَاءُ بِالْمَدِينَةِ عِنْدَ السُّوقِ وَالْمَسْجِدِ فِيمَا ثَمَّهْ) دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَوَضَعَ كَفَّهُ فِيهِ، فَجَعَلَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ جَمِيعُ أَصْحَابِهِ قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانُوا يَا أَبَا حَمْزَةَ! قَالَ: كَانُوا زُهَاءَ الثَّلاَثِمِائَةِ. {الحديث: ٥٩٠٢ = ٥٨٩٨ فـم. تجريـد/١، رقـم: ١٣٠ = ١٦٩، ١٩٥، ٢٠٠، ٣٥٧٢، ٣٥٧٣، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥. ترمذى. مناقب: ٣٦٣١. نسائى. موضوع: ٧٦} :

ئەنەسـى كـوڕى ماليـك (رەزاى خـوداى لێ بـێ) فــەرمووى: پێغەمبــەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لە زەوراء بوو، كە جێگەيەكى زانراو بـوو، لـەبازاڕى مەدينە، خۆىو كۆمەڵێ لـە هاوڕێكانى بـوون، لـەنزيك زەورائـەوە، كـاتى نوێـژى عەصر بـوو، ئـاو نـەبوو بـۆ دەسنوێژ، پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) داواى ئاوى كـرد، جـامێكى دەم پـەليان بـۆ هێنـا كـەمێ ئـاوى تيـابوو، پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەپى تيادانا، ئەنەس فەرمووى: كە سەيرى ئاوەكەم كرد، لەنێوانى پەنجەكانى پێغەمبەرەوە هەڵ دەقولا، ئيتر هاوەڵەكانى پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەســەر پێغەمبــەرو رەزاى خـودا لەهــەموو هــاوەڵانى بــێ) هەموويان دەسنوێژيان لەو ئاوە گرت. قەتادە فـەرمووى: عـەرزى ئەنەسـم كـرد:

ئەی باوکی حەمزە! ئەو هاوەڵانەی کە لەو جامە دەسنوێژیان گرت چەند کەس دەبوون؟ فەرمووی: ئەندازەی سێ سەد کەس دەبوون). {تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٠، ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٣١٧٠}.

١٤٦٩- عَنْ أبي حُمَيدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: غزَوْنَا مَعَ النَبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَلَمَّا جَاءَ وادِيَ القُرى، إذا امْرأةٌ في حَدِيقَةٍ لَهَا، فَقَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأصْحَابِهِ: (أخْرُصُوا) وَخَرَصَ رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةَ أوْسُقٍ، فقَالَ لَهَا: (أَحْصي مَايَخْرُجُ مِنْهَا). فَلَمَّا أتَيْنَا تَبُوكَ قَالَ: (أَمَا، إنَّهَا سَتَهُبُّ اللَيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَلايَقُومَنَّ أحَدٌ وَمَنْ كَانَ مَعَهُ بَعيرٌ فَلْيَعْقِلْهُ). فَعَقَلْنَاهَا، وَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَقَامَ رَجُلٌ فَأَلْقَتْهُ بِجَبَلِ طَيِئٍ. وَأَهْدَى مَلِكُ أيْلَةَ للنَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بغاةً بَيْضاءَ، وَكَساهُ بُرْداً وَكَتَبَ لَهُ بَبَحْرِهِمْ، فَلَمَّا أتى وَاديَ القُرى قَالَ لِلْمَرْأةِ: (كَمْ جاءَتْ حَدِقَتُكِ) قَالَتْ: عَشَرَةٌ أوْسُقٍ: خَرْصَ رَسولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقالَ النَبيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إني مُتَعَجِلٌ إلى المدِينَةِ فَمَنْ أرادَ مِنْكُمْ أَنْ يَتعَجَلَ مَعي فَلْيَتَعَجَّلْ)، فَلَمَّا – قَالَ الرَّاوي كَلَمةً مَعْناها أَشْرَفَ عَلى المدينَةِ قالَ: (هذهِ طابَةٌ) فَلَمَّا رَأي أُحُداً قالَ: (هذا جَبَلُ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، ألاَ أُخْبِرُكُمْ بَخَيرِ دُورِ الانصارِ). قَالُوا: بَلى، قالَ: (دُورُ بَنِيَ النَّحارِ، ثُمَّ دُورُبَنِي عَبْدِ الأشْهَلِ ثُمَّ دُورُ بَنِى سَاعِدَةَ، أَوْ دُورُ بَنِي الحارِثِ بْنِ الخَزْرِجِ، وَفي كُلِّ دُورِ الأنْصارِ – يَعْنس – خَيْراً). (الحديث ١٤٨١ – أطرافه في: ٣٧٩١، ٣١٦١، ١٨٧٢، ٤٤٢٢): [١٤٦٩]

ئەبو حومەیدی ئەل – ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا (رەزای خوای لێ بێ) چووین بۆ غەزای تەبووک،

---

[١٤٦٩] تجرید/٢، ژمارە: ٧١٣ = ١٤٨١ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٤٣ل – ٢٢٩ = ٥٩٠٧ تخریج وترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٤ رقم الباب/٥٤) + (بخاری رقم الکتاب/٦٣ رقم الباب/٧).

کەگەیشتینە وادیلقورا، ژنێ لەناو باخێکی خۆیدا بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەهاورێیانی خۆی فەرموو: (ئادەی بەری ئەم باخە بخەملێنن) ئێمەش هەرکەسەمان بەجۆرێ خەملاندمان، وەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی خەملاندی بەدە وەسق، وە بەژنەکەشی فەرموو: (تۆ سەرژمێری بکە، بەری باخەکە چەندەبوو ژمارەکەیمان بۆ لەبەربکە). ئەوجا ڕۆیشتین هەتا چووینە تەبووك، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئاگاداربن! کە ئەمشەو بایەکی سەخت هەڵدەکا لێتان، کەستان لەوکاتەدا هەڵمەسن، هەرکەسەش وشتری هەیە باتوند پێوەندی بکا) جائێمەیش وشترەکانمان ئەشکێل کرد، جابایەکی سەختی وا هەڵیکرد، پیاوێ لەوکاتەدا هەڵسا بایەکە هەڵیگرت‌و لەلای دووکێوەکەی طەیدا، لەوێ تووڕیدا، فروستادەی ئیبنو عەلمای شای ئەیلە نامەیەکی لە ئیبنوعەلماوە هێنا بۆ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەگەڵ هێسترە ماچەیەکی سپیدا، بەدیاریی، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- نامەیەکی بۆی ناردو عەبایەکی نایابیشی بەدیاری بۆ ناردو بەپێی پەیماننامەیەکی نووسراو، بەرامبەر سەرانەیەکی دیاریکراو، لەسەر قەڵەمڕەوەکەی خۆی هێشتیەوە، جاکاتێ هاتینەوە بۆ وادیلقورا، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ مەسەلەی بەری باخەکە لەژنەکەی پرسی: (بەرەکەی چەند وەسق دەرچوو ؟).گوتی: دە وەسق: دەق بەقەد ئەوە کە پێغەمبەر خەملاندی. ئەوجا پێغەمیبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرموی: (من بەزوویی دەڕۆمەوە بۆ مەدینە، جا ئەوەی حەز دەکا لەگەڵ من دابێ ئەوە کەیفی خۆیەتی‌و ئەوەشی حەزدەکا لێرە بمێنێتەوە ئەوە بابمێنێتەوە). ئەوسا کەوتینە ڕێ، کاتێ لەدوورەوە مەدینەمان لێ دەرکەوت، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەمە طابەیە) کاتێکیش چاوی بەچیای ئوحود

کەوت فەرمووی: (ئەوەیش چیای ئوحودە، ئەم کێوە ئێمەی خۆش دەوێ‌و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ !). لەپاشدا فەرمووی: (ئەدی باپێتان بڵێم کە باشترین تیرەکانی یاریدەدەران (انصار) کامانەن). یاران فەرموویان بفەرموو، فەرمووی: (باشترین بنەماڵەی یاریدەدەران، کە هەموویان هەرباشن، بنەماڵەی بەنی نەجارن، ئەوجا بنەماڵەی بەنی عەبدول ئەشهەل، ئەوجا بنەماڵەی بەنی ساعیدە، ئەوجا بنەماڵەی بەنی حاریسی کوڕی خەزرەج، وەکی تریش بەشێوەیەکی گشتی تیرەو بنەماڵەو گەرەکەکانی یاریدەدەران هەموویان هەرخێردارو خاسن). (تاج/١/٣٣١/٤ ز/١٠٢– م/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەینی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە موسلیم اخراجی کردووە. مەدینە لەپێشا ناوی یەثریب بوو، تائەندازەیێ ئاوو هەوای بۆ لاوەکی ناسازبوو، یەثریب واتە: لۆمەو سەرزەنشت. جالەبەر ئەم واتایە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوەکەی گۆڕی‌و فەرمووی: (خودای گەورە خۆی مەدینەی ناوناوە طابە) طابە وشەیەکی عەرەبییە، واتە: شارێکی خۆش‌و باش‌و سازگارو خاوەنی دانیشتوانی خاس‌و باش.عەسقەلانی‌و عەینی -ڕەحمەتی خودایان لێ بێ- دەفەرموون: (إحصاء) بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونکە عەرەبەکان بێ سەواد بوون، وە نووسینیان باش نەدەزانی، لەبەرئەوە ژمارەیان بە وردە بەردو چەو کۆنترۆڵ دەکرد، کەپێیان دەڵێن (حصی) بۆ شارەزابوونی تەواو لەپیرۆزیی مەدینە بڕوانە: (تاج/٢ ز/١٣٨) تا دوایی.

ئەمە دەقی ژمارە (٧١٣)ی تەجریدی بوخاری بوو، ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لەژمارە (١٥٤٣)ی پوختەی موسلیما:

عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَأَتَيْنَا وَادِيَ الْقُرَى عَلَى حَدِيقَةٍ لامْرَأَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اخْرُصُوهَا»، فَخَرَصْنَاهَا، وَخَرَصَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَشْرَةَ أَوْسُقٍ، وَقَالَ: «أَحْصِيهَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَيْكِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». فَانْطَلَقْنَا حَتَّى قَدِمْنَا تَبُوكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَتَهُبُّ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَلاَ يَقُمْ فِيهَا أَحَدٌ مِنْكُمْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ بَعِيرٌ فَلْيَشُدَّ عِقَالَهُ، فَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَحَمَلَتْهُ الرِّيحُ حَتَّى أَلْقَتْهُ بِجَبَلَيْ طَيِّئٍ، وَجَاءَ رَسُولُ ابْنِ الْعَلْمَاءِ صَاحِبِ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِكِتَابٍ وَأَهْدَى لَهُ بَغْلَةً بَيْضَاءَ فَكَتَبَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَأَهْدَى لَهُ بُرْدًا، ثُمَّ أَقْبَلْنَا حَتَّى قَدِمْنَا وَادِيَ الْقُرَى، فَسَأَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَرْأَةَ عَنْ حَدِيقَتِهَا كَمْ بَلَغَ ثَمَرُهَا؟ فَقَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنِّي مُسْرِعٌ، فَمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ فَلْيُسْرِعْ مَعِيَ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيَمْكُثْ»، فَخَرَجْنَا حَتَّى أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: «هَذِهِ طَابَةُ، وَهَذَا أُحُدٌ وَهُوَ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ»، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ خَيْرَ دُورِ الأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ»، فَلَحِقَنَا سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيَّرَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلَنَا آخِرًا؟ فَأَدْرَكَ سَعْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خَيَّرْتَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلْتَنَا آخِرًا؟ فَقَالَ: «أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الْخِيَارِ». {الحديث: ٥٩٠٧ = ٥٩٠٣ فم. تجريد/٢/١٢٥، رقم: ٧١٣ = ١٤٨١، ١٨٧٢، ٣١٦١، ٣٧٩١، ٤٤٢٢. أبو داود. خراج: ٣٠٧٩ + تجريد/٤، رقم: ١٤٨٧}:

ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ غەزای تەبووك، كە

گەیشتینە وادیلقورا، ژنێ لەناو باخێکی خۆیدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم باخە بخەمڵێنن). ئێمەیش هەرکەسە بەجۆرێ خەملاندمان، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی خەملاندی بە دە وەسق و بە ژنەکەشی فەرموو: (تۆ هەڵی ژمێرە تا بەپشتی خوا دەگەڕێینەوە بۆلات). ئەنجا رۆیشتین هەتا چووینە تەبووك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم شەو بایەکی سەخت هەڵ دەکا لێتان، کەستان لەوکاتەدا هەڵمەسن، هەر کەسەش وشتری هەیە، با توند توند پێومندی بکا). جا بایەکی سەختی وا هەڵی کرد، پیاوێ لەوکاتەدا هەڵسا، بایەکە هەڵی گرت و لەلای دوو کێوەکەی طەییا لەوێ تووڕی دا، فروستادەی ئیبنو عەلمای شای ئەیلە نامەیەکی لە ئیبنو عەلماوە هێنا بۆ پێغەمبەر، لەگەڵ هێسترە ماچەیەکی سپیدا بەدیاریی.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) نامەیەکی بۆی ناردو عابەیەکیشی بەدیاری بۆ نارد، جا کەهاتینەوە بۆ وادیلقورا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ باخەکە لە ژنەکەی پرسی: (باخەکەت بەرەکەی چەند وەسق دەرچوو؟). گوتی: دە وەسق. ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من بەزوویی دەڕۆمەوە بۆ مەدینە، جا ئەوەی حەزدەکا لەگەڵ مندا بێ، ئەوە کەیفی خۆیەتی و ئەوەیشی حەزدەکا کە لێرە بمێنێتەوە، ئەوە با بمێنێتەوە).

ئەوجا کەوتینە رێ، کاتێ لەدوورەوە مەدینەمان لێ دەرکەوت فەرمووی: (ئەمە طابەیە، واتە: خۆش و خاوێن و سازگارە، وە ئەوەش چیای ئوحودە، ئەم کێوە ئێمەی خۆش دەوێ و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ!).

لەپاشا فەرمووی: (باشترین گەڕەك‌و خانەی یاریدەدەران (ئەنصار) گەڕەك‌و خانەكانی بەنی نەجارن، لەپاش ئەوان گەڕەك‌و خانەكانی بەنی عەبدول ئەشهەلن، لەپاش ئەوان گەڕەك‌و خانەكانی بەنی ساعیدەن، وە گەڕەگ‌و خانووەكانی یاریدەدەران (ئەنصار) هەموویان خێردارو باش‌و خاسن!).

لەپاشا كە سەعدی كوڕی عوبادەمان پێ گەیشت، ئەبو ئوسەید پێی گوت: ئاگات لێیە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باشێتیی گەڕەك‌و خانەكانی یاریدەدەرانی دیاری كردو پلەی باشی‌و بەرێزیی بۆ دانان، كەچی ئێمەی خستە دواوە، كە بنەماڵەی بەنی ساعیدەین!

سەعدیش چوو بۆلای پێغەمبەرو عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باشێتیی گەڕەك‌و خانەكانی یاریدەدەرانت دیاری كردووەكەچی ئێمەت لەپلەی دواوە داناوە كە بنەماڵەی بەنی ساعیدەین؟! فەرمووی: (بەس نییە كە ئێوەیش بەردەستەی چاكان كەوتوون!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٨ ج/٤}. بۆ ژیاننامەی ئەبو حومەید بڕوانە: ژمارە: ١٥٤٧ پوختەی موسلیم.

### (٤) باب تَوَكُّلُهُ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى: وَعِصْمَةُ اللَّهِ لَهُ مِنَ النَّاسِ
### پشت بەستنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە خودای گەورەو چاودێری خودا بۆی‌و پاراستنی لە شەڕی مەردومو بەدكاران

١٤٧٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فَأَدْرَكَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ سَيْفَهُ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، قَالَ: وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الْوَادِي يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ رَجُلاً أَتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ فَأَخَذَ السَّيْفَ، فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي، فَلَمْ أَشْعُرْ إِلاَّ وَالسَّيْفُ صَلْتًا فِي يَدِهِ فَقَالَ لِي: مَنْ

يَمْنَعُكَ مِنِّى؟ قُلْتُ: اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ فِى الثَّانِيَةِ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّى؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ، قَالَ: فَشَامَ السَّيْفَ، فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ»، ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٥٩٠٩ = ٥٩٠٥ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٥٥٧ = ٤١٣٥، ٢٩١٣، ٤١٣٤، ٤١٣٦}: [١٤٧٠]

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە غەزایەكا لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەو نەجد ڕۆیشتین بۆ غەزایێ، لە قرچەی نیوەڕۆدا، لە شیوێكی دڕكەزیاویدا، بۆ سەرخەو شكاندنی نیوەڕۆ لاماندا، خەڵكەكە بەناو شێوەكەدا بڵاو بوونەوەو چوونە سێبەری دارەكانەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبن سێبەری دار سەمۆرەیەكا دابەزیو شمشێرەكەی پیادا هەڵواسیو خەوت، كاتێ خەبەری دەبێتەوە دەڕوانێ وا پیاوێ لەلای دایە، كە هاتووە حەزرەت هەستی پێی نەكردووە، فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەی بانگ كردو فەرمووی: (ئەم پیاوە شمشێرەكەی منی هەڵكێشابوو، بە ڕووتی گرتبووی بەدەستیەوە بەدیار سەرمەوە ڕاوەستابوو، دەیگوت پێم: كێ ڕزگارت دەكات لەدەستم؟ منیش گوتم: خودا، دیسانەوە بۆ جاری دووەم گوتی: كێ ڕزگارت دەكات لەدەستم؟ منیش گوتم: خودا، جا شمشێرەكەی نایەوە ناو كێلانەكەی، وا ئەوەتانێ بۆ خۆی دانیشتووە) ئیتر پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) تۆڵەی لە پیاوەكە نەسەندو هیچی لێی نەكرد). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٤٤٤٣}.

---

[١٤٧٠] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٥٧ = ٤١٣٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٤١ = ٥٩٠٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٣٢).

## (٥) باب بيان ما بُعِثَ بِهِ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ مِنَ الهُدَى وَالعِلْمِ

## ئەو پەيامەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆی رەوانە کراوە، تا پیادەی بکات، پڕە لە ڕێنمایی جوانو زانینی بە سوودو باش

١٤٧١- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ مَثَلَ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ، كَمَثَلِ غَيْثٍ أَصَابَ أَرْضًا، فَكَانَتْ مِنْهَا طَائِفَةٌ طَيِّبَةٌ، قَبِلَتِ الْمَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ، فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا مِنْهَا وَسَقَوْا، وَرَعَوْا، وَأَصَابَ طَائِفَةً مِنْهَا أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللَّهِ وَنَفَعَهُ بِمَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ». {الحديث: ٥٩١٢ = ٥٩٠٨ فم. تجريد/١، رقم: ٦٩ = ٧٩ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠٤٤}: [١٤٧١]

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نموونەی ئەو ڕێنماییو زانستە جوانەی، کە خودای گەورە بەمنا ناردوویەتی، بۆ ئەو خەڵکە، وەك بارانێکی زۆری بەپیتو فەڕوایە، کە بباریٚ لە خاکێ، بەشێکی خاکێکی پاكو بەپێز بێو باراناوەکە بگرێتە خۆیو لەوەڕو گیایەکی زۆری پێ سەوز ببێ، وە بەشێکی تری زەوییەکی ڕەقەنو رووتەن بێ، شینایيو سەوزایی نەڕوێنێ، بەڵام ناوەکە قووت نەداتەوە، بەڵکوو گلی بداتەوەو ببێ بە ئەستێڵو بە گۆماوو بەکانیاو، وە خودا بیکات بە مایەی خێرو خۆشیو سوودو کەڵك بۆ مەردوم، چی بۆ خۆیانو چی بۆ ماڵاتیان: بەم ڕەنگە: هەم خۆیان لێی بخۆنەوەو هەم ئاژەڵو ماڵاتیانی پێ ئاو

[١٤٧١] تجرید/١، ژمارە: ٦٩ = ٧٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٢٥ = ٥٩١٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٣ رقم الباب/٢٠).

بدەن‌و هەم کشتووکاڵی لەبەردا بکەن، وە بەشێکی تریشی دەشتاییی‌و شۆرەکات بێ، نە ئاو گل بداتەوەو نە لەوەڕیش بلەوەڕێنێ، جا ئەم خاك‌و بارانە نموونەو وێنەن بۆ ئەو کەسە خودا پێداوانە، کە لەئایینی خودا شارەزا دەبن‌و بە فەرمانی خودا لەم ئایینی منە سوودو بەهرە وەردەگرن‌و، هەم خۆیان فێری زانین دەبن‌و هەم خەڵکی تریش فێردەکەن، بەهۆی ئەوەوە لەهەردوو جیهانا سەریان پێی بەرزدەبێتەوە، هەروەك نموونەو وێنەیشن بۆ ئەو کەسانەیش کە سەریان پێی بەرز نابێ‌و، ئەو هیدایەت‌و دینە راستەی کە خودا بەمنا ناردوویەتی ئەوان نایانەوێ‌و وەری ناگرن!). {ریاض/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٦٢ + تاج/١، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١١٢ ج/٤}.

### (٦) باب شَفَقَتِهِ (ﷺ) عَلَى أُمَّتِهِ وَمُبَالَغَتِهِ فِي تَحْذِيرِهِم مِمَّا يَضُرُّهُمْ
### دڵسۆزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ نەتەوەکەی‌و ئەوپەڕی وریاکردنەوەیان لە بارەی هەرشتێ زیانی هەبێ بۆیان

١٤٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَثَلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا، فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهَا، جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ الَّتِي فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا، وَجَعَلَ يَحْجُزُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَتَقَحَّمْنَ فِيهَا، قَالَ: فَذَلِكُمْ مَثَلِي وَمَثَلُكُمْ، أَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، فَتَغْلِبُونِي تَقَحَّمُونَ فِيهَا». {الحديث: ٥٩١٦ = ٥٩١٢ فـم. تجريد البخاری/٤، رقم: ١٣٦٤ = ٣٤٢٦، ٦٤٨٣. تحفة الأشراف: ١٤٧٧١}: [١٤٧٢]

---

[١٤٧٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٦٤ = ٣٤٢٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٤٤ = ٥٩١٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٢٦).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (وێنـەی مـنو وێنـەی ئێوەی ئومـەتی مـن، ئـەی نەتەوەی ئیسلام! وەك وێنـەی پیـاوێ وایـە كـە ئـاگرێكی كردبێتـەوە، جانـەوەرو پەپوولەیــەكی زۆری تــێ ورووكـابنو پــەیتا پــەیتا بكەونــە نـاویو بــسووتێن، پیاوەكـە هەردەیــەوێ بــەریان لێ بگـرێو نــەهێڵێ بكەونــە نـاو ئاگرەكـە، بـەلام جانــەوەرو پەپوولـەكان كوێرانــە بــەرەو ئاگرەكـە هــەر ئەزنــەك دەدەنو لەبـەر زۆری خۆیــان پیاوەكــە دەرەقــەتیان نایــەتو ســەرەنجام دەســەپێنە نــاو ئــاگرە سوورەكەوە، دەی ئەمە رێك وێنەی منو وێنەی ئێومیـە: ئـەوەتانێ مـن كەمـەرم گرتـوونو بـەزۆر دوورتـان دەخەمـەوە لـە ئـاگری دۆزەخو بـەدەم پێتـان دەڵێم: وەرن بۆلای بەرنامەی جوانی ئیسلامو دووربكەونـەوە لـە ئـاگری دۆزەخ، كەچـی ئێوە بەزۆر خۆتان لەدەستم رادەپسكێننو دەرەقەتتان نایەمو سەرەنجام خۆتانی تـێ فـڕێ دەدەن!). {تـاج/٤٧/١، زنجیرە: ٩، ژمـارە: ٦٦ + ریـاض/١٥١/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٦٣/٨ چاپی دووەم}.

## (٧) باب ذِكْرِ كَوْنِهِ ﴿ﷺ﴾ خَاتم النبيين

## پێغەمبەری ئیسلام (درودی خودای لەسەر بێ) دواترین پێغەمبەرەو دوای ئەو پێغەمبەری تر نیە

١٤٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: «مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِـي، كَمَثَـلِ رَجُلٍ بَنَـى بُنْيَانًـا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَـهُ، إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ مِنْ زَوَايَاهُ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلاَّ

وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ». {الحديث: ٥٩٢٠ = ٥٩١٦ فم. تجريد/٤/٩٨، رقم: ١٤٠٩ = ٣٥٣٦ فتح الباري. ترمذي. أمثال: ٢٨٦٤} : [١٤٧٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (داستانی منو داستانی پێغەمبەرەکانی پێش من، وەك داستانی پیاوێ وایە، خانووبەرەیێ هەڵبخاو تەلارێ دروست بکاو، لەهەموو لایەنێکەوە زۆر بەجوانی دروستی بکاو بەباشی بیڕازێنێتەوە، تەنیا شوێنی تاقە یەك خشت نەبێ کە لە گۆشەیەکا، لە گۆشەکانی تەلارەکە چۆڵ بێ، دەستە دەستە خەڵك بەناویا بسووڕێنەوەو بڵێن: ئەم کۆشکە چەندە خۆشە! خۆزگە ئەم خشتەیش دادەنراو شوێنەکەی ئاوا چۆڵ نەدەبوو!).

فەرمووی: (دەی من ئەو خشتەیەمو ئەو چۆڵییەم پڕ کردۆتەوەو، بووم بەدواترین پێغەمبەر، کۆتا پێغەمبەرمو ئیتر لەپاش من پێغەمبەری تر نابێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٣٠٧١}.

١٤٧٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَثَلِي وَمَثَلُ الانْبِيَاءِ كَرَجُلٍ بَنَى دَارًا فَاكْمَلَهَا وَاحْسَنَهَا الا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَدْخُلُونَهَا وَيَتَعَجَّبُونَ وَيَقُولُونَ لَوْلا مَوْضِعُ اللَّبِنَةِ (الحديث: ٣٥٣٤): [١٤٧٤]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (داستانی من و داستانی پێغەمبەرەکانی پێش من، وەك داستانی پیاوێ وایە، خانووبەرەیێ هەڵبخاو، لە هەموو

---

[١٤٧٣] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٠٩ - ٣٥٣٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٢٧ = ٥٩٢٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/١٨).

[١٤٧٤] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٠٨ = ٣٥٣٤ بخاری. مسلم: ٢٣٨٧ - ٥٩٢٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/١٨).

لایەنێکەوە زۆر بە جوانی دروستی بکاو، بەباشی بیڕازێنێتەوە، تەنیا شوێنی تاقە یەك خشت نەبێ، کە لە گۆشەیەکا چۆڵ بی، دەستە دەستە خەڵك بە ناوی دا بسووڕێنەوەو بڵێن: چەندە جوانە! خۆزگە ئەم خشتەیش دادەنراو شوێنەکەی ئاوا چۆڵ نەدەبوو). فەرمووی (دەی من ئەو خشتەیەم و ئەو چۆڵی یەم پڕ کردۆتەوەو، بووم بە دواترین پێغەمبەر، ئیتر لە پاش من پێغەمبەری ترنابێ!). (تاج/٤ ل/٢٤٧ ز/٨١ ف/٥) بڕوانە: ژمارە ١٤٠٩ی تەجرید.

**(٩) باب إثبات حَوْضِ نبيِّنَا ﴿ﷺ﴾ وَصِفَاتِهِ**

**حەوزی کەوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەیەو چۆن چۆنینە؟**

١٤٧٥- عَنْ جُنْدَبْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ». {الحديث: ٥٩٢٤ = ٥٩٢١ فم. بخاری. رقاق: ٦٥٨٩. تحفة الأشراف: ٣٢٦٥} : [١٤٧٥]

جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (من پێشڕەوی ئێوەم بۆسەر حەوزی کەوسەر، هەتا بەرلەوەی کەئێوە بێن بۆ ئەوێ من ڕێکی بخەم بۆتان). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٥٦٧٥، ٥٦٧٦} .

١٤٧٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– « أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ مَنْ وَرَدَ عَلَىَّ شَرِبَ وَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَظْمَأْ أَبَداً أَبْصَرْتُ أَنْ لاَ يَرِدَ عَلَىَّ الْحَوْضَ أَقْوَامٌ أَعْرِفُهُمْ وَيَعْرِفُونِى ثُمَّ يُحَالُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ، فَأَقُولُ إِنَّهُمْ مِنِّى . فَيُقَالُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِى مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ . فَأَقُولُ سُحْقًا سُحْقًا لِمَنْ غَيَّرَ بَعْدِى».

---

[١٤٧٥] بخاری. رقاق: ٦٥٨٩ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٤٨ = ٥٩٢٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

سەهلی کوڕی سەعد (خۆشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆم پێشڕەوی ئێوەم لەسەر حەوزەکە، لە پێش ئێوەوە دەچم لە گوێ حەوزەکە جێو ڕێتان بۆ ئامادە دەکەم، ئەوانەی کە دێن بۆ ئەوێ لە ئاوەکەی دەخۆنەوە، هەرکەسێکیش لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێ، گەلێ کەس دێن بۆ لام بۆ ئاو خواردنەوە، من باش باش ئەوان دەناسمو ئەوانیش باش باش من دەناسن، کەچی ڕێگەیان پێ نادرێ کە بگەنە لای من، دەڵێم ئەوە بۆ؟ خۆ ئەمانە لە کن خۆی لە ئۆمەتی من بوون؟ پێم دەگوترێ: تۆ نازانی کە لە پاش تۆ چی خراپەیەکیان بەرپا کردبوو، منیش دەڵێم: دەی قڕ لەوانە کەوێ کە لە پاش مەرگی من دینەکەیان دەستکاری کردووە! (ش).

١٤٧٧- حديث أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ لَسَمِعْتُهُ وَهْوَ يَزِيدُ فِيهَا « فَأَقُولُ إِنَّهُمْ مِنِّى. فَيُقَالُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِى مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ . فَأَقُولُ سُحْقًا سُحْقًا لِمَنْ غَيَّرَ بَعْدِى» [١٤٧٧]

لە ژمارە: (١٤٧٦)دا بە تەواوی رابورد.

١٤٧٨- عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو رَضِي اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: قال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الْوَرِقِ وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَا يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا. (الحديث ٦٥٧٩): [١٤٧٨]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (ئەندازەی گەورەیی حەوزی کەوسەری

---

[١٤٧٧] بڕوانە ژمارە: (١٤٧٦).

[١٤٧٨] تجريد/٥، ژمارە: ٢٠٣٨ - ٦٥٧٩ بخاری. مسلم: ٢٢٩٢، ترقيم محمد فؤاد لصحيح مسلم = ٥٩٢٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

من ڕێی مانگه ڕێ یەکە، ئاوەکەی لەچڕی شیر سپی تره، بۆنی لەبۆنی میسك خۆشتره. گۆزەڵەو شەربەکانی دەوری،کە ئاویان لێ دەخۆنەوە،لە ئەستێرەی ئاسمان زۆرترن،ئەوەی ئاوی کەوسەریان پێ بخواتەوە،هەرگیز تینووی نابێ). (تاجی کوردی/١٠ ز/١٢٧ ل/٣٨٣ ژ/١+٤+٢+٣+٥+٦+٧).

١٤٧٩- حديث أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ – رضى الله عنهما – قَالَتْ قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – « إِنِّي عَلَى الْحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرُ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ ، وَسَيُؤْخَذُ نَاسٌ دُونِي فَأَقُولُ يَا رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي . فَيُقَالُ هَلْ شَعَرْتَ مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ وَاللَّهِ مَا بَرِحُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ » . فَكَانَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ (راوي الحديث عن أسماء) يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا أَوْ نُفْتَنَ عَنْ دِينِنَا [١٤٧٩]

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (ڕەزای خودا لە خۆیو لە ئەبو بەکری باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە ڕۆژی قیامەتدا، وا خۆم لەسەر حەوزی کەوسەر ئامادەم، هەتا پێشوازی لەوانە بکەم لە ئێوەی گەلی ئیسلام، کە دێن بۆ لام، کەچی دەبینم لە نزیکمەوە کەسانێ دەگرنو دەیانبەن بەرەو دۆزەخ، جا منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! ئەمانە سەر بە خۆمنو لە نەتەوەی موسوڵمانی منن، کەواتە بۆ دەبرێنو ڕێگەیان پێ نادرێ کە بێن بۆ لام؟ جا دەگوترێ پێم: ئاخر تۆ دەزانی کە لە پاش خۆت ئەمانە چی فەرتەنەیەکیان بەرپاکردووە؟ سوێند بە خودا لە پاش تۆ پاشگەز بوونەتەوە).

ئیبنو ئەبی مولەیکە کە ئەم فەرموودەیە لە ئەسمائەوە دەگێڕێتەوە، دەیفەرموو: (ئەی خودای میهرەبان! ئێمە پەنا دەگرین بە پەنای تۆ لەوە کە لە

[١٤٧٩] بخاری. رقاق: ٦٥٩٣ پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٤٩ = ٥٩٢٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

ڕێ دەرچینو لە ئیسلام پاشگەز ببینەوەو لە ئایینمانا تووشی ئاژاوەو ئاشووب بین).

ئەمەیش دەقی ژمارە: (١٥٤٩)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «حَوْضِى مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الْوَرِقِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلاَ يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا»، قَالَ: وَقَالَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِى بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنِّى عَلَى الْحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وَسَيُؤْخَذُ أُنَاسٌ دُونِى فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مِنِّى وَمِنْ أُمَّتِى، فَيُقَالَ: أَمَا شَعَرْتَ مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، وَاللَّهِ مَا بَرِحُوا بَعْدَكَ يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، قَالَ: فَكَانَ ابْنُ أَبِى مُلَيْكَةَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا أَوْ أَنْ نُفْتَنَ عَنْ دِينِنَا). {الحديث: ٥٩٢٨ = ٥٩٢٧ فم. بخاري. رقاق: ٦٥٩٣، ٧٠٤٨. تحفة الأشراف: ١٥٧١٩}:

داوود فەرمووی: نافیعی کوڕی عومەر فەرمووی: ئیبنو ئەبی مولەیکە فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لە خۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەوزی کەوثەرم پانییەکەی یەك مانگە ڕێیە، هەروا درێژییەکەی چونکە نێوانی گۆشەکانی یەکسانە بەیەکتری، ئاوەکەی لەزیو سپیترە، بۆنی لەبۆنی میسك خۆشترە، ژمارەی سوراحییەکانی سەری کە موسوڵمانان ئاویان پێ نۆش دەکەن وەك ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان وان، هەرکەسێ لێی نۆش بکا، هەتا هەتایە توونی نابێ).

ئیبنو ئەبی مولەیکە، ئەم فەرموودەیەی تریشی لەبارەی حەوزی کەوثەرەوە، لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە گێڕاوەتەوەو فەرمووی: ئەسماء

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆ خۆم لەسەر حەوزی کەوثەر چاوەڕوانتان دەکەم، هەتا بزانم کامانەتان دێن بۆلامو دەبن بەمیوانم لەسەر ئەو حەوزە، بۆ نۆشکردنی ئاوەکەی، کەسانێ لەمن دائەبڕێنو جیایان دەکەنەوە لە میوانەکانمو ناهێڵن لە ئاوەکەی نۆش بکەن، منیش عەرزی خودای گەورە دەکەمو دەڵێم: ئەی پەروەردگاری گەورەم! خۆ ئەمانە لەمنو لە ئۆمەتی منن، ئیتر بۆچی فریشتەکان ڕێگەیان پێ نادەن کەبێن بۆسەر حەوزەکەمو لە ئاوەکەی بخۆنەوە؟ لە وەڵاما پێم دەگوترێ: ئەدیی تۆ نازانی ئەمانە لەپاش تۆ چی کارێکی ناشیرینیان کردووە: بەخودا ئەمانەی کەوا ڕێگەیان پێ نادرێ کەبێن بۆ خزمەتت، بۆسەر حەوزی کەوثەر، بۆ نۆشکردن لە ئاوەکەی کەدەبێ بە کلیلی ڕزگاری هەتا هەتایی، ئەمانە لەپاش مەرگی تۆ یەکسەر پاشگەز بوونەتەوەو لە ئایین هەڵگەڕاونەتەوە).

راوی دەفەرموێ: جاران لەکاتی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا لەدوایەوە ئیبنو ئەبی مولەیکە دەیفەرموو: خودایە! ئێمە پەنا دەگرین بە پەنای تۆ، کە خوا نەخواست لە ئایینی پیرۆزیی ئیسلام پاشگەز ببینەوە، یا تووشی ئاژاوەو سەر لێشێوانی ئایینی ببین). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٩ + تاج/٤، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٤٢٢٨ هەتا ٤٢٣١} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦٠، ژمارە: ٥٦٧٥ هەتا ٥٦٨٩} + {تجرید/٢٩٥/٥، رقم: ٢٠٤١ = ٦٥٨٧ فتح الباری}.

ئەمەیش دەقی ژمارە (٢٠٤١)ی تەجریدی بوخارییە، کە دەبێ بە ڕاڤەو ڕوونکردنەوەیەکی باش، سەبارەت بەم جۆرە کەسانە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَيْنَا أَنَا قَائِمٌ إِذَا زُمْرَةٌ حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ هَلُمَّ فَقُلْتُ أَيْنَ قَالَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ قُلْتُ وَمَا شَأْنُهُمْ قَالَ إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى ثُمَّ إِذَا زُمْرَةٌ حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ

خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ هَلُمَّ قُلْتُ أَيْنَ قَالَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ قُلْتُ مَا شَأْنُهُمْ قَالَ إِنَّهُمْ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى فَلَا أُرَاهُ يَخْلُصُ مِنْهُمْ إِلَّا مِثْلُ هَمَلِ النَّعَمِ. (الحديث ٦٥٨٧):

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (جارێ لەخەوما، لەسەر حەوزی کەوسەرم ڕاوەستا بووم، بۆ پێشوازی لەهاتوانی ئۆمەتم، کە دێن بۆ دێنی منو نۆشین لەئاوی حەوزی کەوسەرم، ئەوەندەم زانی کۆمەڵێ خەڵك هاتن، کەهاتنە پێشەوە ناسیمنەوە، کەچی فریشتەیێ لەشێوەی پیاوێکا، کەوتە نیوانی منو نێوانی ئەوانەوەو، نەیهێشت پتر بێنە بەرەوە، ئەوجا فەرمووی بەو کۆمەڵە: دەی وەرن، منیش بەفریشتەکەم گوت: دەیاننێری بۆ کوێ؟ فەرمووی: بەخودا دەیانێرم بۆ دۆزەخ. گوتم: بۆ چییان کردووە، کەوا دەیاننێری بۆ ئەو شوێنە؟ فەرمووی: ئەمانە لەپاش تۆ پاشەو پاش لەدین وەرگەڕا بوونو پاشگەز بوو بوونەوەو لەتۆ هەڵ گەڕابوونەوە، هەروا لەدوا ئەمانە کۆمەڵێ تریش دێن، ئەوانیش هەروا، خۆشەویست فەرمووی: (جا وابزانم زۆر کەم لەم کۆمەڵانە قوتاریان دەبێ، وەك چۆن وشترێ بەرەڵا کرابێ و پشت گوێ خرابێ، کەم وا دەبێ ئەو وشترە ڕزگاری ببێو سەری تیا نەچێو لەناو نەچێ). (تاج/١٠ ل/٣٨١ ز/١٣٦ ژ/٤).

١٤٨٠- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: «إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِيَ الآنَ، وَإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ، أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَتَنَافَسُوا فِيهَا». {الحديث: ٥٩٣٢ = ٥٩٣١ فم.

تجريد البخاري = الترجمة الكردية/٢، رقم: ٦٤١ = ١٣٤٤، ٣٥٩٩، ٤٠٤٢، ٤٠٨٥، ٦٤٢٦، ٦٥٩٠} : [١٤٨٠]

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپاش هەشت ساڵ، لەشەهیدبوونی شەهیدانی جەنگی ئوحود، لەماڵ دەرچوو، ڕۆیشت نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی غەزای ئوحود کرد، لەپاشا گەڕایەوە بۆ مەدینە، ڕۆیشتە سەر دوانگەکەو، وەك خواحافیزی لە زیندوان‌و مردوودان بکا، فەرمووی: (خۆم بەراییو پێشڕەوتانم، لەپێش گەلی ئیسلامی خۆمەوە دەڕۆم، تا ئەوان دێن خۆم حەوزی کەوثەریان بۆ ئامادە دەکەم خۆم چاودێرم بەسەرتانەوە، لەهەردوو جیهاندا کردەوەکانی ئێوەم پێ نیشان دەدرێ‌و لە قیامەتیشا شایەتیتان بۆ دەدەم، سوێندم بەخودا من ئێستاکە لەم چرکە ساتەدا، حەوزی کەوثەر، کە حەوزی تایبەتی خۆمەو ژوانگەی خۆم‌و ئۆمەتمەو پێشوازیی ئوممەتمی لەبەهەشتا لەسەر دەکەم، ئائێستا ئەو حەوزەم وا لەبەرچاوم‌و، بەچاوی سەر تەماشای دەکەم، بێگومان کلیلەکانی گەنجینەکانی زەوی هەمووی خەڵات کراون بەمن) یا فەرمووی: (کلیلەکانی زەوی دراون بەمن، کەواتە: زوو یا درەنگ گەلی ئیسلام دەست دەگرن بەسەر ئەو وڵاتانەدا، بەخودا تازە من مەترسیم لەوە نەماوە کە ئێوە، خوا نەخواست، لەپاش مەرگی من بچنەوە سەر بتپەرستی‌و فرە خودایی‌و شتی تری واو دەست بکەنەوە بە بتپەرستی، بەپشتی خودا شتی وا تازە لە تێکڕای ئۆمەتم روونادات، تاك‌و تەرایش ئەو بایەخەی نییە، بەڵام مەترسی ئەوەم لێتان هەیە کە ئێوەیش وەك نەتەوەکانی تری پێشین، کە لەسەر پڕو پیتی جیهان، لەناو

---

[١٤٨٠] تجريد البخاري/٢، ژمارە: ٦٤١ = ١٣٤٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٥٥ = ٥٩٣٢ بخاری (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/١٧).

خۆتانا خۆتان بخۆنەوەو بچن بەگژی یەکتریداو تێك بەربن‌و لەناوبچن، وەك چۆن ئەوان لەسەر شتی وا فەوتان‌و لەناوچوون!).

عوقبە فەرمووی: ئەمە لەئاخر سالّی ژیانیدا بوو، وە ئەو جارە دواجار بوو کە پێغەمبەر لەسەر مینبەر ببینم). {تاج/٥، زنجیرە: ١٣٦، ژمارە: ٥٦٧٦ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٣١٨٧}.

١٤٨١- حديث عبدالله بن مسعود – رضى الله عنه – عَنِ النَّبِىِّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ ، وَلَيُرْفَعَنَّ رِجَالٌ مِنْكُمْ ثُمَّ لَيُخْتَلَجُنَّ دُونِى فَأَقُولُ يَا رَبِّ أَصْحَابِى . فَيُقَالُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِى مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ»[١٤٨١]

مەبەست‌و واتاکەی لە پێشەوە نووسراوە.

١٤٨٢- عَنْ حَارِثَةَ بْنُ وَهب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «حَوْضُهُ مَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَالْمَدِينَةِ»، فَقَالَ لَهُ الْمُسْتَوْرِدُ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ قَالَ: «الأَوَانِي»؟ قَالَ: لاَ ، فَقَالَ الْمُسْتَوْرِدُ: تُرَى فِيهِ الآنِيَةُ مِثْلَ الْكَوَاكِبِ. {الحديث: ٥٩٣٨ = ٥٩٣٧ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٢ = ٦٥٩١ فتح البارى. تحفة الأشراف: ٣٢٨٧} : [١٤٨٢]

حاریسەی کوڕی وەهب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (حەوزی کەوسەری من لە صەنعای یەمەنەوە هەتا مەدینە دەبێ).

---

[١٤٨١] تجريد البخارى/٢، ژمارە: ٦٤١ = ١٣٤٤ بخارى. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٥٥ = ٥٩٣٢ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

[١٤٨٢] تجريد البخارى/٥، ژمارە: ٢٠٤٢ = ٦٥٩١ بخارى. مسلم: ٢٢٩٨ = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٥٠ = ٥٩٣٨ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

**موستەوریدی کوڕی شەددادی کوڕی عەمر، کەخۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەر بوون فەرمووی پێی: ئەی لێت نەبیستووە کەباسی پەرداخو پیاڵەو سوراحییەکانی سەری بکات؟ حاریثە فەرمووی: نەء. موستەورید فەرمووی: (دەی بەقەد ئەستێرەی ئاسمان قاپو دەفری وا لەسەر). {تاج/٥، زنجیرە: ١٣٧، ژمارە: ٥٦٨١ ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

**ئەمە دەقی ئەم فەرموودەی ئێرەیە لە ژمارە (٢٠٤٢)ی تەجریدی بوخاریدا:**

عن حارثة بن وهب رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ قال: سمعت النبي صَلّى اللّهم عَلَيْهِ وَسَلّمَ و ذكر الحوض فقال: كما بين المدينة و صنعاء. (الحديث ٦٥٩١):

**حاریثەی کوڕی وەهب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- باسی حەوزی کەوسەری بۆمان دەکرد، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (حەوزەکەم لەمەدینەوە هەتا صەنعای یەمەن دەبێ!). (تاج/١٠ ل/٣٨٣ ز/١٢٧ ژ/٢ —ش).**

## ڕوونکردنەوە:

**باسی حەوزی کەوثەر، لەتاج داوا لەبەرگی/٥ ل/٣٨٧ هەتا ل/٣٨٣، ئەصڵە عەرەبی یەکە، کەبریتی یە لەتەواوی زنجیرەی/٢٢٥،٢٢٦،٢٢٧، کەئەم سێ زنجیرەیە لەبارەی ئەم حەوزەوە، بەرێز: ٥+ ٧+ ٣= ١٥ پازدە فەرموودەیان لەخۆ گرتووە، ئەم پازدە فەرموودەیە، ئەگەر بەریز لەیەکەوە هەتا پازدە ژمارەیان بۆ دابنرێ، ژمارە/٢+٣+٦+٧+٨ ئەم پێنجەیان موتتە فەقوعەلە یهین، واتە شێخی بوخاری و شێخی موسلیم ریوایەتیان کردوون، بوخاری لەصەحیحی بوخاریداو موسلیم لەصەحیحی موسلیم دا، کە ئەم دوو کتێبە پیرۆزە لەپاش قورئان**

دروستترین پەڕاوی سوننەتن. ژمارە/٤+٩+١٤ ئەم سێ یەشیان بوخاری گێڕاونیەتەوە. ژمارە/١٠+١١ ئەم دووەشیان موسلیم ریوایەتی کردوون. مامۆستای عەسقەلانی -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: (قورطوبی و قازی عەیاض دەفەرموون، بەپێی فەرموودەی ساخ ، حەوزەکەی پێغەمەر، کەمەشهوورە بەحەوزی کەوسەر چەسپاوە، پێویستە لەسەر هەموو موکەللەفێ بیزانێو باوەڕی پێی هەبێ، پتر لەسیی سەحابە باسی ئەم حەوزەیان لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە).

١٤٨٣- فَقَالَ لَهُ الْمُسْتَوْرِدُ أَلَمْ تَسْمَعْهُ قَالَ «الأَوَانِى». قَالَ لاَ. فَقَالَ الْمُسْتَوْرِدُ « تُرَى فِيهِ الآنِيَةُ مِثْلَ الْكَوَاكِبِ»(١٤٨٣)

له فەرموودەکانی پێشەوە واتاکەی ڕابورد.

١٤٨٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ أَمَامَكُمْ حَوْضًا مَا بَيْنَ نَاحِيَتَيْهِ كَمَا بَيْنَ جَرْبَا وَأَذْرُحَ». وَفِي رِوَايَة: قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَسَأَلْتُهُ – يَعْنِي نَافِعاً – فَقَالَ: قَرْيَتَيْنِ بِالشَّامِ، بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ ثَلاَثِ لَيَالٍ، وَفِى رِوَايَة: ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. {الحديث: ٥٩٤١ ، ٥٩٤٢ = ٥٩٤٠، ٥٩٤١ فتح الملهم = فم = ف.م، تجريد البخاري/ الترجمة الكردية المجلد/٥، رقم: ٢٠٣٩ = ٦٥٧٧ فتح الباري} : (١٤٨٤)

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەوزێ لەدەرگای بەهەشتا وا لەپێشتانەوە، لە جەربائەوە هەتا ئەزروح دەبێ) لە گێڕانەوەیەکا: (حەوزەکەی من لەدەرگای بەهەشتا وا لەپێشتانەوە لە جەربائەوە هەتا ئەزووح دەبێ). لە گێڕانەوەیەکا:

---

(١٤٨٣) بڕوانە ژمارەکانی پێش خۆی.

(١٤٨٤) تجريد/٥، ژمارە: ٢٠٣٩ = ٦٥٧٧ بخاری. (بخاری رقم الكتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

عوبەیدوڵڵا فەرمووی: لە نافیعم پرسی: ئەم دوو شارە لەکوێن؟ فەرمووی: (دوو ئاواین وان لەشام، نێوانیان سێ شەو ڕێگایە، لە گێڕانەوەیەکدا: سێ ڕۆژە ڕێیە).
{تاج/٥، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٥٦٨٠}.

١٤٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَذُودَنَّ رِجَالاً عَنْ حَوْضِي كَمَا تُذَادُ الْغَرِيبَةُ مِنْ الإِبِلِ عَنْ الْحَوْضِ (الحديث ٢٣٦٧): [١٤٨٥]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، لەڕۆژی قیامەتدا، کەدادەنیشم بۆ پێشوازی لەدێنیکەرانی نەتەوەی ئیسلامم، کە دێن بۆ سەر حەوزی کەوثەرم، بەدەستی خۆم، لەهەندێ پیاو گورێ گورێ دەکەمو لەحەوزی کەوثەرم دووریان دەخەمەوە، هەروەك چۆن وشتری نامۆو ئاوەکی گورێ گورێی لێ دەکرێو ڕێگەی ئاو خواردنەوەیان پێ نادرێ).

(باسی حەوزی کەوثەر لەتاجا وا لەبەرگی دەدا، لەلاپەڕە (٣٧٩) ەوە، دەست پێ دەکا، هەتا لاپەڕە (٣٨٨) کەبریتییە لەزنجیرە(١٢٦) هەتا زنجیرە(١٢٨) ) بڕوانە (ریاض/٤ل-١٣٥٦ف-٥٣).

١٤٨٦- عَن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ قَدْرُ حَوْضِي كَمَا بَيْنَ أَيْلَةَ وَصَنْعَاءَ مِنَ الْيَمَنِ وَإِنَّ فِيهِ مِنَ الْأَبَارِيقِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ. (الحديث ٦٥٨٠): [١٤٨٦]

---

[١٤٨٥] تجرید البخاری/٣، ژمارە: ١٠٣٩ = ٢٣٦٧ بخاری. مسلم: ٢٣٠٢ محمد فؤاد = ٥٩٤٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٢ رقم الباب/١٠).

[١٤٨٦] تجرید البخاری - مختصر صحیح البخاری/٥، ژمارە: ٢٠٤٠ = ٦٥٧٧ بخاری. مسلم: ٢٢٩٩ محمد فؤاد = ٥٩٥٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨١ رقم الباب/٥٣).

ئەنەس کوری مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: خۆشەویست - درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ( ئەندازەی حەوزەکەی من لەهەندێ شوێنیا، لەئەیلەوە کەوا لەشام، هەتا صەنعاء دەبێ کەوا لەیەمەن (ئێستە پێتەختی کۆماری یەمەنە) وەك ژمارەی ئەستێرەی ئاسمانیش پیاڵەو جامو مەسینەو سوراحی وا لەسەر). (تاج/١٠ ل/٣٨٣ ژ/١٢٧ ژ/٣).

١٤٨٧- حديث أنس بن مالك، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «لَيَرِدَنَّ عَلَيَّ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِي الْحَوْضَ ، حَتَّى عَرَفْتُهُمُ اخْتُلِجُوا دُونِي ، فَأَقُولُ أَصْحَابِي . فَيَقُولُ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ»[١٤٨٧]

واتاو مەبەست لێی لە ژمارە: (١٤٨١)دا ڕابورد.

## (١٠) بابُ في قِتَالِ جِبْرِيلَ وَمِيكَالَ عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ يَوْمَ أُحُدٍ
## لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا جوبرائیلو میکائیل لە هەردوو شانی پێغەمبەرەوە دەجەنگان

١٤٨٨- عَنْ سَعْدِ بن أبي وقّاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): رَأَيْتُ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَنْ شِمَالِهِ يَوْمَ أُحُدٍ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا ثِيَابُ بَيَاضٍ، مَا رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. يَعْنِى جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ). وفي روايةٍ: يقاتلان عنه كأشد القتال. {الحديث: ٥٩٥٩ = ٥٥٦٠ فم. تجريد/٤/٢٨١، رقم: ١٥٤٣ = ٤٠٥٤ فتح الباري} : [١٤٨٨]

سەعدی کوری ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی شەڕی ئوحوددا لەلای ڕاستی پێغەمبەرو لەلای چەپیەوە، دوو پیاوی جل سپیم

---

[١٤٨٧] بڕوانە ژمارە: (١٤٨١).

[١٤٨٨] تجريد/٤، ژمارە: ١٥٤٣ = ٤٠٥٤ بخاری (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/١٨).

دی، شەڕێکی زۆر گەرمیان بەدەوری حەزرەتدا دەکردو ئاگادارییان دەکرد، نە لەوەپێش ئەوانەم دیبوو، نە لەوەپاش دیمنەوە، ئەو دوو پیاوە حەزرەتی جوبرائیلو میکائیل بوون). {تاج/٤، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٤٥٩١}.

## (١١) باب في شَجاعَةِ النَّبِيِ (ﷺ) وَتَقَدُمِه لِلحَرْبِ

## باسی ئازایىو دلێریی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە گەرمەی شەڕدا لە ڕیزی پێشەوە دەجەنگا

١٤٨٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْطَلَقَ نَاسٌ قِبَلَ الصَّوْتِ، فَتَلَقَّاهُمْ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَاجِعًا، وَقَدْ سَبَقَهُمْ إِلَى الصَّوْتِ وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ فِي عُنُقِهِ السَّيْفُ، وَهُوَ يَقُولُ: «لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا». قَالَ: «وَجَدْنَاهُ بَحْرًا، أَوْ إِنَّهُ لَبَحْرٌ»، قَالَ: وَكَانَ فَرَسًا يُبَطَّأُ). {الحديث: ٥٩٦١ = ٥٩٦١ فم. تجريد البخاری/٣/٣٠٩، رقم: ١١٨٠ = ٢٨٥٧، ٢٨٢٠، ٢٨٧٢، ٢٨٦٦، ٢٨٦٧، ٢٩٠٨، ٢٩٦٨، ٢٩٦٩، ٣٠٤٠، ٦٠٣٣، ٣٢١٢. ترمذی. جهاد: ١٩٨٧} : [١٤٨٩]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهەموو کەسێ چاکتر بوو، وە لەهەموو کەسێ سەخیترو بەخشندەتر بوو، وە لەهەموو کەسێ ئازاترو دلێرتر بوو، شەوێ شاری مەدینە شەڵەژاو مەردوم هەموو تۆقین، قاوەو شەڵەژانێو ترسو تۆقینێ روویدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ سۆراخی ئەم هەواڵە،

---

[١٤٨٩] تجريد البخاری/٣، ژمارە: ١١٨٠ = ٢٨٥٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٨١ = ٥٩٦١ ترقيم شيحا - تخريج وترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٨٢).

ئەسپێکی پشت رووتی بێ جلو زینی لە ئەبو طەلحەی زرِبابم خواست ناوی مەندووب بوو، بەسواری ئەو ئەسپە چوو بۆ سۆراخی رووداوەکە، چەند کەسێکی تریش بەرەو ئەو دەنگە چوون کە بوو بوو بەهۆی شپرزە بوونی خەڵکی شارەکە لەولاوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەنگاریان بوو شمشێرەکەی لە ملیدا بوو، بەسواری ئەسپەکە دەگەڕایەوە لە سۆراخی هەواڵەکەو دەیفەرموو: (مەشەڵەژێن، مەشەڵەژێن، هیچی وامان نەدی کەببێ بەهۆی ترسو بیمو نا ئارامی) وە فەرمووی: (بەڵام بەڕاستی ئەم ئەسپە وەك شەپۆلی دەریا وایە، ئەوەندە گورجو گۆڵو خێرایە!).

ئەنەس فەرمووی: خێراییو گورجو گۆڵی ئەسپەکە لەو هەڵمەتەدا بە موعجیزەی پێغەمبەر بوو، دەنا ئەسپەکە خۆی ناسراو بوو بە تەمەڵیو سستیو تەوەزەلی!!). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٢}.

## (١٢) باب كَانَ النَّبيُّ ﴿ﷺ﴾ أجْوَدَ النَّاسِ بالخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ المُرسَلَةِ
## پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ خێرخوازیو بەخشندەیی دەتگوت سۆزەبای رەحمەتە، سۆزەی بە هەموو لایەکا دەگەیشت

١٤٩٠- وَعَنهُ (رَضي اللهُ عَنهُما) قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَجْوَدَ النَّاسِ وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلَام) وكَانَ يَلْقَاهُ فِي كل ليلة من رمضان فيدارسه القرآن، فلرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنْ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ). (الحديث ٦ - أطرافه في: ١٩٠٢، ٣٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧)[١٤٩٠]:

---

[١٤٩٠] تجريد/١، ژمارە: ٦ - ٦ بخاری. مسلم: ٣٠٨ محمد فؤاد - ٥٩٦٧ ترقيم شيحا (بخاری رقم الكتاب/١ رقم الباب/٥).

دیسان ئیبنوعەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەیی‌و پیاوەتی لەوێنەی خۆی نەبوو، لەڕەمەزانانیشا جوبرائیل (سلاوی خوای لێ بێ) دەهات بۆلای، دەوری قورئانی بۆ دەکردەوە، جالەم کاتەدا لەهەموو کاتێکی تر زیاتر خێری دەکردو شتی دەبەخشی، جوبرائیلیش (سلاوی خوای لێ بێ) دەستووری وابوو لەمانگی ڕەمەزانا هەتا مانگ تەواو دەبوو، هەموو شەوێ دەهات بۆ خزمەتی دەوری قورئانی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکردەوە، هەتا بەباشی ڕەوانی بکاو لەبیری نەچێتەوە، لەماوەی تەشریف هێنانی جوبرائیل دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەیی‌و چاکەخوازی سەری پێوەنەبوو، وە بۆئەمە ئەوەندە خێرابوو، وەئەوەندە بەهەر چوارلادا شتی دەبەخشی دەتگوت شەماڵی هەلگراوە، سۆزەی بەهەمو لایەکا دەگات! (تاج ـ ٢ ل ـ ٩٣ ز ـ ٣٦).

## (١٣) باب كان رسولُ اللهِ ﴿ﷺ﴾ أحسن الناسِ خُلُقاً
## پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەوپەڕی ڕەوشت جوانیدا بوو

١٤٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللّٰه عَنْه قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ، وَلاَ لِمَ صَنَعْتَ؟ وَلاَ: أَلاَ صَنَعْتَ؟ .(الحديث ٦٠٣٨ طرفه في ٢٧٦٨)؛ [1491]

---

[1491] تجريد البخاری/٥، ژمارە: ١٩٣٦ = ٦٠٣٨ بخاری. مسلم: ٣٠٩ = محمد فؤاد = ٥٩٦٦ ترقيم شيحا = خليل مأمون شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٣٩).

**ئیمامی ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەساڵی ڕێك بەردەستیو خزمەتی پێغەمەرم کرد، نەبووە کەپێم بڵێ: ئۆف لەدەست تۆ، یا بۆئەوەت واکرد؟ یانەدەبوو کەئاوا بیکەیت.**

**١٤٩٢- حديث أَنَسٍ قَالَ لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – الْمَدِينَةَ أَخَذَ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِي فَانْطَلَقَ بِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَنَسًا غُلاَمٌ كَيِّسٌ فَلْيَخْدُمْكَ . قَالَ فَخَدَمْتُهُ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ ، فَوَاللَّهِ مَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ ، لِمَ صَنَعْتَ هَذَا هَكَذَا وَلاَ لِشَيْءٍ لَمْ أَصْنَعْهُ لِمَ لَمْ تَصْنَعْ هَذَا هَكَذَا(١٤٩٢)**

**ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کردو هات بۆ مەدینە، ئەبو طەلحەی زڕبابم دەستی گرتمو بردمی بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەنەس کوڕێکی زرنگە، با خزمەتت بکاو بەردەستیت بکا، پێغەمبەریش ڕازی بوو، جا هەم لەماڵەوەو هەم لە سەفەردا دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کرد، سوێندم بە خودا، هەرچیم کردبێ، نەیفەرمووە پێم: بۆچی ئەمەت ئاوا کردووە، بۆ وایت نەکردووە؟ وە هەروەها ئەگەر شتێکم نەکردبێ، پێی نەگوتووم بۆ ئەمەت ئاوەها نەکردووە؟.**

---

**(١٤٩٢) بخاری. وصایا، ٢٧٦٨، مسلم: ٥٩٦٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٧ رقم الباب/٢٧).**

**(١٤) بابُ مَا سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) شَيْئاً قَطُّ فَقَالَ: لا، وَكَثْرَةُ عطائه**
**نەبووە کە شتێ لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) داوا بکرێ بڵێ: نا،**
**وە باسی بەخشندەیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)**

١٤٩٣- عَنِ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّـهِ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا) قَـالَ: مَـا سُـئِلَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) شَـيْئًا قَـطُّ فَقَـالَ: لاَ. {الحـديث: ٥٩٧٢ = ٥٩٧٣ فـم. تجريـد البخاري بالكوردى/٥، لاپەڕە: ٢١٢، رقم: ١٩٣٥ = ٦٠٣٤ فتح البارى} : [١٤٩٣]

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: هـەرگیز نەبووە کەشتێ لە پێغەمبەر (درەوودی خودای لەسەر بێ) داوا بکرێو بڵێ: نا!!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١١٩ ج/٤} .

**روونکرنەوە:**

لەچەند دەقێکا لە قورئانو لە سوننەتدا چەسپاوە کە پێغەمبەر (درەوودی خودای لەسـەر بـێ) وشـەی (لا = نـا)ی بـەکارهێناوە، وەك ئایـەتی: {لاَ أَجِـدُ مَـا أَحْمِلُكُـمْ عَلَيْـهِ} . وەك ئـەوەی پێغەمبـەر (درەوودی خـودای لەسـەر بـێ) بـە ئەشـعەرییەکانی فـەرموو: {وَاللهِ لاَ أَحْمِلُكُـمْ } . {بڕوانـە: ژمـارە: ١٢٠٥ = ٤٦٥٩ لەپوختەی موسلیم} .

وەڵامـی لـەبار بـۆ ئـەم پرسـیە: مەبەسـت ئەمەیـە، بەشـێوەی گـشتی پێغەمبـەر کـە داوای شـتێکی لێ دەکـرا، جێبـەجێی دەکـرد، مەگـەر کاتـێ کـە مەهانەیەکی رەوای ببوایە، وەك ئەم نموونانەی سەرەوەو کۆمەڵێ نموونـەی تـر، کە شارەوانین لەلای کەسی خۆی.

---

[١٤٩٣] تجریـد/٥، ژمـارە: ١٩٣٥ = ٦٠٣٤ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٨٦ = ٥٩٧٣ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٣٩).

١٤٩٤- عَـــنْ جَـــابِرِ بْـــنِ عَبْــدِ اللّـــهِ (رَضِـــيَ اللّـــهُ عَنْهمـــا) قَـــالَ: قَـــالَ النَّبِـــيُّ (صَـــلَّى اللّـــهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ) : (لَـــوْ قَـــدْ جَـــاءَ مَـــالُ الْبَحْـــرَيْنِ قَـــدْ أَعْطَيْتُـــكَ هَكَذَا وَهَكَذَا) وَهَكَذَا فَلَمْ يَجِئْ مَالُ الْبَحْرَيْنِ حَتَّى قُبِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا جَاءَ مَالُ الْبَحْرَيْنِ أَمَرَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى مَنْ كَانَ لَـهُ عِنْـدَ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنَا فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِي كَـذَا وَكَذَا فَحَثَى لِي حَثْيَةً فَعَدَدْتُهَا فَإِذَا هِـيَ خَمْـسُ مِائَـةٍ وَقَـالَ: (خُـذْ مِثْلَيْهَـا) (الحـديث ٢٢٩٦، أطرافُهُ في: ٢٥٩٨، ٢٦٨٣، ٣١٢٧، ٣١٦٤، ٤٣٨٣): [١٤٩٤]

جـــابيری كـــوڕی عەبـــدوڵلا -ڕەزای خوايـــان لـــێ بـــێ - فـــەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی پـێم: (ئەگـەر مـاڵ (سـەرانەی) بەحرەين هات، ئەوەندەو ئەوەنـدەو ئەوەنـدەت ئـەدەمێ) ئـيتر واڕێـكەوت مـاڵی سەرانەی بەحرەين هەر نەهات هەتا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گيانی پاكی سپارد. بەڵام كاتێ ماڵەكە گەيشت، ئەبوبەكر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) بـوو بـوو بـە جێنـشين، فـەرمانی فـەرمووو جاڕچـی جـاڕی دا: هەركەسـێ بـەڵێن ياقەرزێكی هەيە لەسەر پێغەمبەر- دروودی لەسەر – با بێ بۆ لای ئێمە، منيش چـووم‌و عـەرزيم كـرد: پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) واو وای بـەمن فەرموو، ئەويش لاگوێلێكی لەماڵەكە داپێم، كەژماردم پێنجسەدبوو، فەرمووی: دوو ئەوەندەی تريش هەڵبگرە بۆ خۆت). (رياض/٢/ل/٢١٤ف-٦٩١).

ئەمـە دەقـی ژمـارە (١٠١١)ی تەجريـدی بوخاريـە، ئەمـەيش دەقـی ئـەم فەرموودەيە، لە ژمارە (١٥٨٩)ی پوختەی موسليمدا:

[١٤٩٤] تجريد/٣، ژمارە: ١٠١١ = ٢٢٩٦ بخاری. مـسلم: ٢٣١٤ - پوختـەی موسـليم/٤، ژمـارە: ١٥٨٩ = ٥٩٧٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٣٩ رقم الباب/٣).

عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لَوْ قَدْ جَاءَنَا مَالُ الْبَحْرَيْنِ، لَقَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا»، وَقَالَ بِيَدَيْهِ جَمِيعًا، فَقُبِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَبْلَ أَنْ يَجِيءَ مَالُ الْبَحْرَيْنِ، فَقَدِمَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بَعْدَهُ فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى: مَنْ كَانَتْ لَهُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِ، فَقُمْتُ فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «لَوْ قَدْ جَاءَنَا مَالُ الْبَحْرَيْنِ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا». فَحَثَى أَبُو بَكْرٍ مَرَّةً، ثُمَّ قَالَ لِي: عُدَّهَا، فَعَدَدْتُهَا فَإِذَا هِيَ خَمْسُمِائَةٍ، فَقَالَ: خُذْ مِثْلَيْهَا). {الحديث: ٥٩٧٧ = ٥٩٧٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٠١١ = ٢٢٩٦، ٢٥٩٨، ٢٦٨٣، ٣١٢٧، ٣١٦٤، ٤٣٨٣. تحفة الأشراف: ٢٦٤٠}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەگەر ماڵ (سەرانە: جزیە)ی بەحرەین هات، ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت پێ دەدەم). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی كرد بەمستو ئاماژەی پێیان كرد، كە سێ مستی ئاوا لەوپارەی سەرانەی بەحرەینەت پێ دەبەخشم.

ئیتر چارەنووسی خودایی وابوو، سەرانەی بەحرەین هەر نەهات هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیانی پاكی سپارد، بەڵام كاتێ ئەو سامانە گەیشت، ئەبوبەكر (ڕەزای خودای لێ بێ) بوو بوو بەجێنشین، فەرمانی فەرموو جارچی جاڕیدا: هەركەسێ بەڵێنێ، یا قەرزێكی هەیە لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بابێ بۆلای ئێمە. منیش چووم بۆلایو عەرزیم كرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: (ئەگەر سامانەكەی بەحرەین گەیشت سێ مشتی ئاوا وات پێ دەدەم).

ئەویش مشتێ لە سامانەکەی پێمدا، بەمشتی خۆیو فەرمووی: ئادەی بیژمێرە، کە ژماردم پێنج سەد پارە بوون فەرمووی: دوو ئەوەندەی تریش هەڵبگرە بۆ خۆت کە هەمووی کردیە هەزارو پێنج سەد پارە). {ریاض/٢، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٦٩١ ج/٢ = چاپی دووەم}.

## (١٥) باب رَحْمَتِه ﴿ﷺ﴾ الصِبْيَانَ وَالعِيَالَ وَتَوَاضُعُهُ وَفَضْلُ ذالكَ
## پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە رەحمەترین کەسە بۆ منالانو خاو خێزانو بەهرەی رەوشتی وا

١٤٩٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَبِي سَيْفٍ الْقَيْنِ، وَكَانَ ظِئْرًا لِإِبْرَاهِيمَ عليه السلام فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَذْرِفَانِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ فَقَالَ: (يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ) ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى، فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَايَرْضَى رَبُّنَا وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَاإِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ). (الحديث ١٣٠٣)؛ [١٤٩٥]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمەمبەردا -درورودی خوای لەسەر بێ- چووین بۆ ماڵی ئەبوسەیفی ئاسنگەر، کە مێردی دایەنەکەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەربوو -درورودی خوای لەسەر بێ- باوکی شیری ئیبراهیم بوو، پێغەمبەر -درورودی خوای لەسەر بێ- ئیبراهیمی هەڵگرت و گرتیە باوەش و تێرتێر ماچی کردو بۆنی کرد، لەپاشان رۆژێ تر چوینەوە بۆ ماڵیان، ئەم جارەیان کەچووین ئیبراهیم گیانی دەدا، جاچاوەکانی

---

[١٤٩٥] تجرید/٢، ژمارە: ٦٢٦ = ١٣٠٣ بخاری. (بخاری رقم الکتاب/٢٣ رقم الباب/٤٤).

پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- هۆن هۆن فرمێسکیان پێدا دەهاتە خوارەوە، لەبەر پەرۆشی بۆ حاڵی ئیبراهیم، جا عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف پێی ووت: ئەوە تۆیش دەگریت ؟ ئەی پێغەمبەری خودا ! فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ- : ئەی کوڕی عەوف ! رێگەی رەحم ناگیرێ، ئەمە نیشانەی رەحم و میهرەبانییە ئینجا فرمێسکێکی تری بەشوێنا رێژاو فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ-: (چاو پڕدەبێ لەئەسرین و دڵ کەیل دەبێ لەخەم و پەژارە بەلام بەزمان ئەوەی رەزای خودای پەروەردگارمانی لەسەر نەبێ نایلێین). (لەڕاستیدا ئەی ئیبراهیم ! ئێمە لەدووریی تۆ خەمگین و خەمبارین و بە کۆچی بێوەختت پەرۆشین). (بڕ: تاج /١/١/٥٢٨)+(ریاض/١ ز ٣ تا دوایی).

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لە ژمارە (١٥٧٨)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمدا، بەهرەی زیاتری واتیادا:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ النَّاسْ بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ إِبْرَاهِيمُ مُسْتَرْضِعًا لَهُ فِي عَوَالِي الْمَدِينَةِ، فَكَانَ يَنْطَلِقُ وَنَحْنُ مَعَهُ فَيَدْخُلُ الْبَيْتَ وَإِنَّهُ لَيُدَّخَنُ وَكَانَ ظِئْرُهُ قَيْنًا فَيَأْخُذُهُ فَيُقَبِّلُهُ، ثُمَّ يَرْجِعُ. قَالَ عَمْرٌو: فَلَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ إِبْرَاهِيمَ ابْنِي وَإِنَّهُ مَاتَ فِي الثَّدْيِ، وَإِنَّ لَهُ لَظِئْرَيْنِ تُكَمِّلَانِ رَضَاعَهُ فِي الْجَنَّةِ». {الحديث: ٥٩٨٠ = ٥٩٨١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەسم نەدیوە کەئاوا وەك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەزەیی بێتەوە بەخێزانا، گوتی: لەگوندێ لە گوندەکانی دەوروبەری مەدینە، ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) درابوو بەدایەن، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆلای، ئێمەیش لەخزمەتیا دەچووین، مێردی دایەنەکەی

ئیبراهیم (واته: باوکە شیرییەکەی) ئاسنگەربوو، ئاسنگەریی دەکرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەدەچووە ژوورەوە ماڵەکە پڕبوو لەدووکەڵو بۆچڕووك‌و، خانووەکە قانگ درابوو، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) ئیبراهیمی کوڕی هەڵ دەگرت‌و تێر تێر ماچی دەکردو بۆنی دەکردو ئینجا دەگەڕایەوە، کاتێ کە ئیبراهیم مرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبراهیم کوڕی منە، مەمکە خۆرە بوو کەمرد، لەبەرئەوە لەبەهەشتا دوو دایەنی هەیە، مەمکی پێ دەدەن، هەتا لەمەمك دەبڕێتەوە!).
{تاج/١، زنجیرە: ١٩٧، ژمارە: ١٠٣٥ ج/٤ = چاپی چوارەم} + {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٢٥، ٣١٢٦ + تجرید/٢، لاپەڕە: ٥١، رقم: ٦٢٦}.

١٤٩٦- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْها قَالَتْ: جَاءَ أَعْرابِيٌّ إِلَى النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: تُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ؟ فَمَا نُقَبِلُهُمْ، فقالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَوَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ اللهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ. (الحديث٥٩٩٨) [١٤٩٦]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: ئایا ئێوە منالانی خۆتان ماچ دەکەن؟ ئێمە شتی واناکەین‌و منالی خۆمان ماچ ناکەین!! پێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرموو: جامن دەسەلاتی چیم هەیە بۆت؟ تۆیە کەخودا خۆی رەحمەتی لەدلت سڕیوەتەوە، من دەسەلاتی چیم هەیە بۆت.

١٤٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ أَبْصَرَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُقَبِّلُ الْحَسَنَ فَقَالَ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ، مَا قَبَّلْتُ وَاحِدًا مِنْهُمْ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّهُ مَنْ لاَ يَرْحَمْ لاَ يُرْحَمْ». {الحديث:

[١٤٩٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٢٠ - ٥٩٩٨ بخاری. مسلم: ٢٣١٧ = ٥٩٨١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/١٨).

٥٩٨٢ = ٥٩٨٣ فـم. تجريـد البخـاري بـالكوردي/٥، رقـم: ١٩٢٠ = ٥٩٩٨ فـتح الباري} : [١٤٩٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: ئـەقرەعی کـوڕی حـابیس چاوی لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەسەنی کوڕی عـەلی مـاچ دەکرد، کە کچەزای بوو، کوڕی فاطیمـەی کچی بـوو، ئـەقرەع وتـی: مـن دەمنـاڵم هەیە، تا ئێستا کەسیانم ماچ نـەکردووە! پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (کەسێ رەحمی نەبێ رەحمی پێ نـاکرێ!). {تـاج/٣، زنجـیرە: ١٩٧، ژمارە: ١٠٣٥ + تاج/١، زنجیرە: ١٩٧، ژمارە: ١٠٣٥، ١٠٣٦ + تـاج/٣، زنجـیرە: ٩٠، ژمـارە: ٣١٢٦ چ/٤} .

١٤٩٨- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِي اللّٰهُ عَنْه عَنِ النَّبِيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: مَنْ لاَيَرْحَمُ لاَ يُرحَمُ. (الحديث ٦٠١٣ طرفه في: ٧٣٧٦): [١٤٩٨]

جـەریری کـوڕی عەبـدوڵڵا (رەزای خـوای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمـەر - دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەوەی رەحم بەکەس نەکا، ئەوە کەسـیش رەحم بەوناکا.

---

[١٤٩٧] بخاری: ٦٠١٣، پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٧٩ - ٥٩٨٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/١٨).

[١٤٩٨] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٢٧ - ٦٠١٣ بخاری. مسلم: ٥٩٨٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٢٧).

## (١٦) باب كَثْرَةِ حَيَائِهِ ﴿ﷺ﴾

## زۆری شەرمو شكۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

١٤٩٩- عَنْ ابِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اشَدَّ حَيَاء مِنْ الْعَذرَاء فِي خِدْرِهَا (الحديث: ٣٥٦٢، طرفاه في: ٦١٠٢، ٦١١٩)؛ [١٤٩٩]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) بۆ شەرم و شكۆ لەگەورە كچی ناوپەردە بەشەرمو شكۆتربوو، ئەگەر حەزی لە شتێ نەبوایە بە ڕویا دەمانزانی كە حەزی لەو شتە نییە).

١٥٠٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاحِشًا وَلا مُتَفَحِّشًا وَكَانَ يَقُولُ انَّ مِنْ خِيَارِكُمْ احْسَنَكُمْ اخْلاقًا. (الحديث: ٣٥٥٩، اطرافه في: ٣٧٥٩، ٦٠٢٩، ٦٠٣٥)؛ [١٥٠٠]

عەبدوڵلای كوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) هەرزەو هەرزە گۆنەبوو، دەشی فەرموو: (لە هەرە باشەكانی ئێوەن ئەو كەسانەتان كە ڕەفتاریان بەرزەو ڕەوشیتان زۆر جوانو شیرینە). (تاج/٤ ل/٢٧٦ ف/١ ز/٩٠ - باسی: ڕەفتارە شیرینەكانی پێغەمبەر) + (ریاض/٢ ل/١٦٦ ژ/٦٢٥ - باسی: ڕەوشت جوانی..).

---

[١٤٩٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٢٥ = ٣٥٦٢ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٥٦٨ = ٥٩٨٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

[١٥٠٠] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٢٢ = ٣٥٥٩ بخاری. (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

## (١٨) باب في رحمة النَّبي ﴿ﷺ﴾ لِلنِساءِ، وَأمر السُّوَّاقِ مَطَايَاهُنَّ بِالرِّفْقِ بِهِنَّ سۆزو میهرەبانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەرابەر بە ئافرەتانو فەرمانکردن بە لێخورانی ولاخەکانی ژێریان، کە بە نەرمی لێیان بخوڕن

١٥٠١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَغُلَامٌ أَسْوَدُ يُقَالَ لَهُ أَنْجَشَةُ يَحْدُو، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا أَنْجَشَةُ رُوَيْدَكَ سَوْقًا بِالْقَوَارِيرِ». {الحديث: ٥٩٩٠ = ٥٩٩١. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى = الترجمة الكردية/٥/٢٢٥، رقم: ١٩٠٦ = ٦٢٠٢، ٦١٤٩، ٦١٦١، ٦٢٠٩، ٦٢١٠، ٦٢١١. تحفة الأشراف: ٣٠٠ ء ٩٤٩}: [١٥٠١]

١- لە تاجول ئوصولدا دەفەرموێ:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشترەوانێکی دەنگخۆشی هەبوو، ناوی ئەنجەشە بوو، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تووشی بوو، بەهۆرە بەدەنگە خۆشەکەی وشترەکانی ژێر هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەری لێ دەخوڕیو وشترەکان بەتەکان دەڕۆیشتن، جا پێی فەرموو: (ئەی ئەنجەشە! تۆزێ هێواش، باریان شووشەیە مەیشکێنە!). واتە: ئافرەت وەك مینا ناسکە، بەرگەی ئەم هەڵبەز هەڵبەزو خێراییە ناگرێ).

٢- لە تەجریدا دەفەرموێ:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ ژن، کە یەکێکیان ئوم سولەیمی دایکم بوو، بەسواری وشتر لەسەفەرێکا، لەناو بارو بنەکەدا بوون، ئەنجەشە کە نۆکەری پێغەمبەر بوو، بەدەنگە خۆشەکەی خۆی،

---

[١٥٠١] تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى = الترجمة الكردية - تجريد/٥، ژمارە: ١٩٦٠ - ٦٢٠٢ بخارى. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٥٨٠ - ٥٩٩٠ شیحا (بخارى رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٩٥).

بـەهۆرە، وشـترەكانی ژێـر ئافرەتـەكانی لێ دەخـوڕی، وەك زانـراوە وشـتر ئەگـەر بەدەنگی خۆش هۆرەی بۆ بكرێ تەواو خێرا دەبێ، هەروەك چۆن ران بـەدەنگی شمشاڵی خۆش باش دەلەوەڕێ ئاوا! جا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بۆئەوەی كە ئەنجەشە پێی لێ هەڵنـەبڕێو بەئاسایی وشـترەكان لێ بخـوڕێ، پێـی فەرموو: ئەی ئەنجەشـە! هێـواش لەسـەرەخۆبە، ولاخـەكان بەهێواشـی لێ بخـوڕە، چونكە باریـان ئافرەتـە، كـە وەك شووشـەو مینـا ناسكنو بەرگـەی ئـەم هەڵبـەز هەڵبـەزە نـاگرن!). {تجریـدی بوخـاری/٥/٢٢٥، ژمـارە: ١٩٦٠ = ٦٢٠٢ + تـاج/٣، لاپەڕە: ٤١٨، زنجیرە: ٩٠، ژمـارە: ٣١٢٧ + تـاج/٥، لاپـەڕە: ٥٠٦ چاپی/٤، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٥٤٦٠}.

**(٢٠) باب مُبَاعَدَتُهُ ﴿ﷺ﴾ لِلآثَامِ وَإِخْتِيَارُهُ مِنَ المُبَاحِ أَسْهَلَهُ وَانْتِقَامَهُ لِلّهِ عِنْدَ إِنْتِهَاكِ حُرُمَاتِهِ**

**دووركرتنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە تاوانو تۆڵە سەندنیشی هەر لەبەر ڕەزای خودای گەورە بووەو بەس، كارە ڕەواكانیش كامەیان ئاسانتر بوایە ئەوەیانی هەڵدەبژارد**

١٥٠٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) أَنَّهَـا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَـا لَـمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لِنَفْسِهِ إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. {الحديث: ٥٩٩٩ = ٦٠٠٠ فم. تجريـد البخاري/٤/١٠٨، رقم: ١٤٢٣ = ٣٥٦٠، ٦١٢٦، ٦٧٨٦، ٦٨٥٣ فتح البـاري. أبـو داوود. أدب: ٤٧٨٥. تحفة مالأشراف: ١٦٥٩٥}: [١٥٠٢]

---

[١٥٠٢] تجرید البخاری/٤، ژمارە: ١٤٢٣ = ٣٥٦٠ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٤٦ = ٥٩٩٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرکاتێ پێغەمبەر خۆی بکرایە بەسەرپشك لەنێوانی دوو کاردا، کە یەکێکیان لەوی تریان ئاسانتر بووایە، هەمیشە ئاسانەکەیانی هەڵ دەبژاردو ئەوەیانی دەکرد، بەمەرجێ ئەو کارە گوناه نەبوایە، ئەگینا لەهەموو کەسێ زیاتر لێی دوور دەکەوتەوە، هەرگیزیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەقو تۆڵە سەندنێ، کە پەیوەندی تایبەتی بەخودی خۆیەوە هەبوایە، نەیدەسەند بەڵکوو کابرای دەبەخشی، مەگەر کەسێ قەدرو ڕێزی شەریعەتی خودای گەورەو مەزنی بشکاندبایە، ئەوە تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەند). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٣١٣١ + ریاض/٢/١٧٦، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٦٤٤ ج/٢ = چاپی دووەم}.

## (٢١) باب طيب رَائِحَةِ النَّبِي ﴿ﷺ﴾ وَلِينُ مَسه وَالتَّبَرُّك بِمَسّه
## بۆنی خۆشی پێغەمبەرو نەرمو نۆڵی جەستەی پیرۆزیو خۆ پیرۆزکردن بە دەستپیاهێنانی

١٥٠٣- عَنْ انَس (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ مَا مَسِسْتُ حَرِيرًا وَلا دِيباجًا الْيَنَ مِنْ كَفِّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلا شَمِمْتُ رِيحًا قَط اوْ عَرْفًا قَط اطيَبَ مِنْ رِيحِ اوْ عَرْفِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث: ٣٣٥٦١، طرفه في: ٥٦٩ت=١١٤١ف): [١٥٠٣]

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیزاو هەرگیز دەستم لە هیچ شتێ نەداوە نە ئاوریشم و نەدیباج، نەشتی تر، کەوەك دەستو جەستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئاوا نەرم و شلو ناسكو نازدار بێ،

[١٥٠٣] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٢٤ = ٣٣٥٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٦٩ - ٦٠٠٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

هەرگیزیش بۆنی خۆشی هیچ شتێکی تـرم نـەکردووە کـەوەك بـۆنی پێغەمبـەر ئـاوا خـۆش بـێ، تەنانـەت بـۆنی پێغەمبـەر لـە بـۆنی عەنبـەرو میـسکیش خۆشتربوو). (تاج/٤ ل/٢٥٩ ز/٨٥ ف/١).

## (٢٢) باب طيب عَرَقِ النَّبِي ﴿ﷺ﴾ وَالتَّبَرُّك بِهِ

## بۆنی خۆشی ئارەقی لەشی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وە خۆ موفەڕك كردن بە ئارەقی جەستەی پیرۆزی

١٥٠٤- حديث أَنَسٍ أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ كَانَتْ تَبْسُطُ لِلنَّبِيِّ – صلى الله عليـه وسـلم – نِطَعًا فَيَقِيلُ عِنْدَهَا عَلَى ذَلِكَ النِّطَعِ – قَالَ – فَإِذَا نَامَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسـلم – أَخَذَتْ مِنْ عَرَقِهِ وَشَعَرِهِ ، فَجَمَعَتْهُ فِي قَارُورَةٍ ، ثُمَّ جَمَعَتْهُ فِي سُكٍّ[١٥٠٤]

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار دایكم ئوم سـولەیم، كـەوڵێكی خۆشـەكراوی ڕادەخـست بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ)، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەو كەوڵە لەلای ئـوم سولەیم، سەرخەوی نیوەڕۆی دەشـكاندو دەنووسـت، جـا كـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خـەوی لێ دەكـەوت، ئـوم سـولەیم ئـارەقی پێغەمبـەری كـۆ دەكـردەوە لـە شووشـەیەكا، لەگـەڵ هـەنێ مـووی سـەری پێغەمبـەردا، كـە ئـەبو طەلحەی مێردی هێنابووی بۆی، كـە لـەو مـووەی سـەری پێغەمبـەر بـوو، كـە لـە مینا تاشیبووی، ئارەق‌و مووەكەو گوڵاوی لەو شووشەیەدا تێكەڵ دەكرد.

ئەمـەیش دوو گێڕانـەوەی تـری ئـەم فەرموودەیـە، لـە ژمـارە: (١٥٧٣)و (١٥٧٤)ی پوختەی موسلیمدا.

---

[١٥٠٤] بخـاری. إسـتئذان: ٦٢٨١. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٧٣ = ٦٠٠٩ شـیحا (بخـاری رقـم الكتاب/٧٩ رقم الباب/٤١).

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: عِنْدَنَا، فَعَرِقَ، وَجَاءَتْ أُمِّي بِقَارُورَةٍ فَجَعَلَتْ تَسْلُتُ الْعَرَقَ فِيهَا، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: «يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ»؟ قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ، نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا وَهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ. {الحديث: ٦٠٠٩ = ٦٠١٠ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ماڵمان، لەوێ سەرخەوی نیوەڕۆی شکان، کە خەوی لێ کەوت ئارەقی دەردا، جا دایکم شووشەیەکی هێناو بەدەستی ئارەقەکەی دائەلێسایە ناوی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەبەری بۆوە، فەرمووی: (ئەی دایکی سولەیم! ئەوەچی دەکەی؟) فەرمووی: ئەمە ئارەقی تۆیە، دەیکەینە ناو گوڵاوی خۆمانەوە، ئەم لە گوڵاو گەلێ بۆنی خۆشترە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٣١٠٠ چ/٤}.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْخُلُ بَيْتَ أُمِّ سُلَيْمٍ فَيَنَامُ عَلَى فِرَاشِهَا، وَلَيْسَتْ فِيهِ. قَالَ: فَجَاءَ ذَاتَ يَوْمٍ فَنَامَ عَلَى فِرَاشِهَا فَأُتِيَتْ، فَقِيلَ لَهَا: هَذَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَامَ فِي بَيْتِكِ عَلَى فِرَاشِكِ، قَالَ: فَجَاءَتْ وَقَدْ عَرِقَ وَاسْتَنْقَعَ عَرَقُهُ عَلَى قِطْعَةِ أَدِيمٍ عَلَى الْفِرَاشِ، فَفَتَحَتْ عَتِيدَتَهَا فَجَعَلَتْ تُنَشِّفُ ذَلِكَ الْعَرَقَ فَتَعْصِرُهُ فِي قَوَارِيرِهَا، فَفَزِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: «مَا تَصْنَعِينَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ»؟ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَرْجُو بَرَكَتَهُ لِصِبْيَانِنَا. قَالَ: «أَصَبْتِ». {الحديث: ٦٠١٠ = ٦٠١١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران گەلێ جار، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەهات بۆ ماڵی ئوممو سولەیمی دایکم، کە هاوسەری ئەبو طەلحەی زڕبابم بوو، گەلێ جار کە دایکم لەسەر نوێنەکەی خۆی نەبوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر نوێنەکەی دایکم

دەخەوت، رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ماڵمان، دایکم لەماڵ نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر نوێنەکەی دایکم خەوت، چوون بەدایکمیان گوت: ئەی ئوممو سولەیم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هاتووە، بۆ ماڵتان، لەماڵی ئێوە لەسەر نوێنەکەی تۆ نووستووە، فەرمووی: جا ئوممو سولەیم هاتەوە، تەماشای کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئارەقێکی زۆری دەرداوە، چۆڕاوەتە سەر پارچەیێ چەرم لەسەر نوێنەکە، جا دایکم هەبگەکەیی کردەوەو شووشەیەکی لێ دەرهێناو ئەو ئارەقەی بەشتێ هەڵ دەمژیو دەیگوشییە ناو شووشەکانییەوە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوەکەی راچەنیو فەرمووی: (ئەوە خەریکی چیت ئەی دایکی سولەیم!) دایکم فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بە ئومێدی پیرۆزیو مووفەڕکی بۆ منداڵەکانمان ئەم ئارەقەی تۆ کۆدەکەینەوە! فەرمووی: (پێکاوتە ئافەریم بۆ خۆت!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٣١٠٠}.

**روونکردنەوە:**

**یەکەم:-** بۆ وەڵامی چەند پرسیارێكو تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە بڕوانە ئەم جێگەیانە:

أ- تاجی کوردی بەرگی سێیەم، زنجیرە: (٤٣)، لاپەڕە: ٦٨٥، چاپی چوارەم، ژمارە: ٣٤٤٧، ٣٤٤٨ + لاپەڕە: ٧٠٤، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٣٤٨٥، ٣٤٨٦، ٣٤٨٧، ٣٤٨٨، ٣٤٨٩، ٣٤٩٠، ٣٤٩١ + لاپەڕە: ٧٠٠، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٤٧٧، ٣٤٧٨.

ب- تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٣٢٤، ژمارە: ١٢٠٠ = ٢٩٢٤ ژیاننامەی ئوم حەرام پووری ئەنەسی کوڕی مالیك + بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٤،

ژماره: ١٣ ژياننامـەی ئەنەسی کوڕی مالیك + بـەرگی/٢، لاپـەڕە: ٤٤، ژمـارە: ٦١٧ ژياننامەی ئەبو طەلحە.

ج- موختەصەری صەحیحی بوخاری، ژمارە: ٢٢، ژياننامەی ئەنەسی کوڕی مالیك.

**دووەم:-** کۆمـەڵێ فـەرموودەو شـوێنەوارو بیـسراوی زانایـان هەیـە کـە دەگەنــە رادەی تــەواتور، ئــەوە دەچەســپێنن کــە خــۆ پیرۆزکــردن‌و خــۆ مووفەڕککردن بە پاشماوەو شوێنەوارو ئاساری پێغەمبەران‌و پیاوچماکان، کاری رەواو پەسەندە، بەمەرجێ کە ئەوە سەرنەکێشێ بۆ هاوەڵ داناو شیرك بۆ خودا.

## (٢٣) بابُ عَرَقُ النَّبِي ﴿ﷺ﴾ في البَرْدِ وَحِينَ يأتِيهِ الوَحْيُ

## تەنانەت لە کاتی سەرماو سۆڵەشدا، کە سروش (وەحی) دەهات بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چۆڕاوگەی ئارەق بەناو چاوانیدا خوڕ خوڕ دەڕژایە خوارەوە

١٥٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهـا) قَالَـتْ: إِنْ كَـانَ لَيُنْـزَلُ عَلَـى رَسُـولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ ثُمَّ تَفِيضُ جَبْهَتُهُ عَرَقًا. {الحديث: ٦٠١٢ = ٦٠١٣ فم. تجريد/١، رقم: ٢ = ٢، ٣٢١٥. ترمذي. مناقب: ٣٦٣٤. نسائي. إفتِتَاح: ٩٣٣، ٩٣٤. تحفة الأشراف: ١٦٨٤٩} : [١٥٠٥]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەخودا خۆم پێغەمبـەرم دیـوە، لەرۆژی سەرماو سۆڵەدا، کە سرووش (وەحی) دەهاتە خوارەوە بـۆی، وا شـەکەتی دەکرد، لەوکاتـەدا کـە حاڵـەتی سرووشـەکە بـەری دەدا، چۆڕاوگەی ئـارەق بـەناو

---

[١٥٠٥] تجرید/١، ژمـارە: ٢ = ٢ بخاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٧١ = ٦٠١٢ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/١ رقم الباب/٢).

چاوانیدا خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٣١٤٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە (٢) لە بەرگی یەکەم:

عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ الْحَارِث بْنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِي الْمَلَكُ رَجُلًا فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ، قَالَتْ: عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ، وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا). (الحديث -٢ - طرفه في:٣٢١٥).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حاریثی کوڕی هیشام لە پێغەمبەری پرسی، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! سروشت چۆن بۆدێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گەڵێ جار بەوێنەی زرینگەی زەنگ بۆم دێ، ئەم جۆرەیان سەختترین شێوەیەتی لەلام، جا کەفریشتەی سرووش (یا سرووشەکە خۆی) بەرم دەداو باری لەشم سووک دەبێ، ئیتر فریشتەکە هەرچی فەرمووە پێم گشتی وەك خۆی دێتە بەرمو باش دەیزانمو لێی تێ دەگەم، زۆرجارانیش فریشتەکە (کەجوبرائیلە) لەشێوەی پیاوێکا، وەك دەحیەی کەلبی خۆی دەردەخا بۆمو قسەم لەگەڵ دەکاو هەرچی دەفەرموێ وەری دەگرمو دێتەبەرم، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا خۆم پێغەمبەرم دیوە، وەها سەخڵەت دەبوو، کەسروشی بۆ دەهات، لەڕۆژی سەرماو

سوڵەدا کەسروش دەهاتە خوارەوە بۆی، لەوکاتەدا کەبەری دەدا چۆڕاوگەی ئارەق بەناوچاوانی دا خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوە!).

## راڤەو شیکردنەوە:

سرووش (وەحی) فەرمانێکە، یا فەرمایشتێکە بەهۆی فریشتەوە لەخواوە بێ بۆ پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر بێ) سرووش جۆرێکی تری بەخەونەو جۆرێکی تریش بەخستنە ناو دڵە کەپێی دەکوترێ ئیلهام، دیمەن‌و رواڵەتی فەرموودەکە وادەگەیەنێ کە (متصل) بێ، نەك (مرسلی صحابی)، ئەویش بەڵگەی ئەومیە کەژن بۆی هەیە ئامادەی کۆڕی پیاوان بێ‌و گوێ لەقسەو گفتوگۆیان ڕابگرێ‌و هاوبەشی کۆڕی زانستی زانایان بکا، چوونکە ئەوەتا شتی وا لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا رووی داوە، بەڵێ ئەمە وایە بەمەرجێ مەترسی ئاژاوە نەبێ، وەك بەشداریکردنی ئافرەتی کوردەواریی خۆمان، لەلادێ، لەزۆربەی کارو فرمانەکانا، هەتا لەدەرو دەشتیش وەك مەڵۆ کردن‌و شارا کردن‌و کۆڵکێشان‌و بژارکردن‌و شتی وا، وەمەترسی ئاژاوەیش زۆر زۆر کەمە. موسلیم‌و تیرمیژیش ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) (بڕوانە: تاج/٤ ل/٢٩١ ز/٩٨ ژ/٣١٤٧ بەرگی/٣ چاپی چوارەم) موسلیم لە فضائیل دا، لەباسی طیب عرق النبي (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) وحين يأتيه الوحي)، دا گێڕاویەتەوە. ژمارە: ٢٣٣٣ = ٢٣٣٣شیحا.

## (٢٥) بابُ في صِفةِ النَّبيِ ﴿ﷺ﴾ وَ إنَّهُ كَانَ أحسَنَ النَّاسِ وَجهاً
## باسی شێوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە ڕوخسارو شێوەیەکی فرە جوانی هەبوو

١٥٠٦- عَنْ الْبَرَاء بْنِ عَازِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) مَرْبُوعًا بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ لَهُ شَعَرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ اذنِهِ رَايْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاء لَـمْ ارَ شَيْئًا قَط احْسَنَ مِنْهُ (الحديث: ٣٥٥١، طرفاه في: ٥٨٤٨، ٥٩٠١)؛ [١٥٠٦]

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پیاوێکی دەستە بوو، نەقووچێکی ناقۆلاو نەکورتە بنەیەکی بێ تام بوو، ناو شانی پان بوو، جاری وا دەبوو قژە سەری دەیدا لە نەرمەی هەر دوو گوێی، جارێ دیم دەستێ جلی سووری لە بەردا بوو، کەسم نە دیوە کە ئاوا جوان بێ !). (تاج/٤ ل/١١٣ ف/٦ ز/٣٣ - باسی: ڕەنگی جلو بەرگ) + (تاج/٤ ل/٢٥٥ ف/٢ ز/٨٣).

لە ژمارە (١٥٥٧)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلاً مَرْبُوعًا بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ، عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ). {الحديث: ٦٠٨١ = ٦٠١٩ فم. تجريد/٤/١٠٤، رقم: ١٤١٨ = ٣٥٥١، ٥٨٤٨، ٥٩١٠. أبو داود. لباس: ٤٠٧٢. ترمذي. أدب: ٢٨١١م. نسائي. الزينة: ٥٢٤٧. تحفة الأشراف: ١٨٦٩} :

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بالا مامناوەندی بوو، نە قووچێکی ناقۆلاو نە کورتە بنەیەکی بێ تام بوو،

---

[١٥٠٦] تجريد/٤، ژمارە: ١٤١٨ = ٣٥٥١ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٥٧ = ٦٠٨١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

سینگو ناوشانی پان بوو، قژه سەری زۆرو پڕبوو جاری وادەبوو قژی دەیدا لەنەرمەی هەردوو گوێچکەی! جاریٚ دیم دەستیٚ جلی سووری لەبەردا بوو، هەرگیز لەژیانی خۆما شتێکم نەدیوە، یا کەسێکم نەبینیوە کە ئاوا وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جوانو نازدار بیٚ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٣٠٨٥ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- قسەی ڕاست ئەوەیە، کە کاتیٚ پێغەمبەر وەفاتی کردووە تەمەنی شەستو سیٚ ساڵ بووە، نەك شەست ساڵ.

٢- ماوەی ڕیسالەکەیو پێغەمبەرایەتییەکەی بیستو سیٚ ساڵ بووە، نەك بیست ساڵ.

١٥٠٧- عنْ الْبَرَاء (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْسَنَ النَّاسِ وَجْهًا وَاحْسَنَهُ خَلْقًا لَيْسَ بالطويلِ الْبائِنِ وَلا بالْقَصِيرِ (الحديث: ٣٥٤٩):[١٥٠٧]

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: ڕوخساری پێغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بیٚ) لەهەموو کەسیٚ جوانتربوو، ڕەوشت و ڕەفتاریشی بۆجوانی و شیرنی وێنەی نەبوو، بالای کەڵەگەت بوو، بەڵام قووچێکی بیٚ تام نەبوو، هەروەها کورتە بالاش نەبوو).(تاج/٤ ل/٢٥٥ ز/٨٣).

---

[١٥٠٧] تجرید/٤، ژمارە: ١٤١٦ = ٣٥٤٩ بخاری. مسلم: ٢٣٣٧، ترقیم محمد فؤاد = ٦٠١٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/١٧).

## (٢٦) بابُ صِفَةِ شَعْرِ النَّبِي (ﷺ)
## چۆنیتی‌و شێوەی مووی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

١٥٠٨- حديث أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ – رضي الله عنه – فَقَالَ كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – رَجِلاً ، لَيْسَ بِالسَّبِطِ ، وَلاَ الْجَعْدِ ، بَيْنَ أُذُنَيْهِ وَعَاتِقِهِ. (١٥٠٨)

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قژەسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەمێ لوول بوو، نە زۆر کرژو نە زۆر خاو بوو، هەتا لای کوێچەو ناوشانی دەهات. {تاج/٤، لاپەڕە/٢٥٨، زنجیرە/٨٤، ژمارە: ١ + بڕوانە: بەرگی/٤، لاپەڕە/٢٤١ تەجریدی صەریح بە کوردی، بەرگی سێیەم}.

١٥٠٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ. {الحديث: ٦٠٢٢ = ٦٠٢٣ فم. بخاري. لباس: ٥٩٠٣، ٥٩٠٤، نسائي. زينة: ٥٢٥٠}: (١٥٠٩)

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار قژی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیدا لەهەردوو سەر شانەکانی). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢٨٦٣ ج/٤}.

---

(١٥٠٨) بخاری. مناقب: ٣٥٤٩. مسلم: ٦٠٢١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٧٢).

(١٥٠٩) بخاری. لباس: ٥٩٠٣، پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٦٥ = ٦٠٢٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/١٨).

## (٢٩) بابُ شَيْبِه ﴿ﷺ﴾

## مووی سپی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

١٥١٠- حديث أنس بن ملك، عن مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ سَأَلْتُ أَنَسًا أَخَضَبَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ إِلاَّ قَلِيلاً. (١٥١٠)

موحەممەدی کوڕی سیرین، کە ناسراوە بە ئیبنو سیرین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیکم کرد: ئایا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) مووی ڕیشی بۆیە دەکرد؟ فەرمووی: نەء، چونکە زۆر کەم مووی سپی لە سەرو ڕیشیدا پەیدا بووبوو.

ژمارە: (١٥٦٣)ی پوختەی موسلیم دەکەین بە ڕوونکردنەوە بۆ ئەم بابەتە:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: يُكْرَهُ أَنْ يَنْتِفَ الرَّجُلُ الشَّعْرَةَ الْبَيْضَاءَ مِنْ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، قَالَ: وَلَمْ يَخْتَضِبْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِنَّمَا كَانَ الْبَيَاضُ فِي عَنْفَقَتِهِ، وَفِي الصُّدْغَيْنِ، وَفِي الرَّأْسِ نَبْذٌ. {الحديث: ٦٠٣١ = ٦٠٣٢ فم}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ناباشە (واتە: مەکرووهە) کە پیاو مووی سپی لەسەرو ڕیشی بژار بکا. ئەنەس دەیفەرموو: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) مووی خۆی بۆیە نەدەکرد، واتە: بەهیچ ڕەنگێ ڕەنگی نەدەکرد، هەندێ مووی سپی بەچاڵی چەناگەیەوە بوو، وە هەروەها چەند موویێ پرژو بڵاو لەهەردوو لاجانگیو لەسەریدا هەبوو!).

---

(١٥١٠) بخاري. لباس: ٥٨٩٤. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٦٣ = ٦٠٣١ ترقيم شيحا (بخاري رقم الكتاب/٧٧ رقم الباب/٦٦).

**ڕوونکردنەوە:**

١- بەکۆی دەنگ زنان هەم زۆرینەی خەڵکی بەهەشتن و هەم زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن بەڵگەی ڕۆشنی زۆر لەسەر ئەم بابەتە لە سوننەتدا هەیە. {بڕوانە: ژمارە: ١٩٧٠ لەدواوە}.

٢- ئیبنو سیرین، کە خەونزانێکی گەورە بووە، لەناو کوردەواری خۆماندا بەناوبانگە، ناوی موحەممەدی کوڕی شیرینە، ناسراویشە بە (ئەبوبەکری کوڕی ئەبو عەمری ئەل-بەصری) پێشەواو ئیمامی سەردەمی خۆی بووە، لە کۆمەڵێکی زۆر، لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕانەوەی هەیە، وەك ئەنەسی کوڕی مالیك و زەیدی کوڕی ثابیت و حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب و ئەبو هورەیرەو دایکی باوەڕداران عائیشەو ئوم عەطی و کەسانی تریش، کۆمەڵێ شاگردی ناوداری بووە لە تابیعین کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك: شەعبی و خالیدی ئەل- حذذاو عاصمی ئەل-ئەحوەل و قەتادە، لەڕێگەی عیکریمەوە، فەرموودەی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: ئیبنو سیرین لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا چوو بۆ حەج، لەو ماوەیەدا فەرموودەی لێ وەرگرتووە.

دوو ساڵ لە جێنشینی عوثمان دەمێنێ، کە ئیبنو سیرین لەدایك دەبێ. هیشامی کوڕی حسان دەیفەرموو: (ڕاستترین کەس لەسەردەمی خۆمدا کەپێی گەیشتووم، کە فەرموودەم لێ وەرگرتووە: موحەممەدی کوڕی سیرینە).

ئیبنو سیرین بەصرییە تابیعییە، جێگەی متمانەو باوەڕی فەرموودە شوناسەکانە، بەڕاستی پێشەوایەکی زاناو شارەزای ئایین و یاسا نامەی خودا بوو، زۆر بە وەرەع و بە تەقوا بوو.

ئیبنو عەون دەیفەرموو: باشترین کەس بوو کە ئومێدی خێری لێ بکرێ بۆ نەتەوەی ئیسلام، لەهەمان کاتدا هەتا دەیتوانی نەفسی خۆی دەچرووساندەوە. هەروا ئیبنو عەون دەیفەرموو: لەم جیهانەدا، وەك ئەم سێ کەسە پیاوی زاناو باشم نەدیوە:

١- موحەممەدی کوڕی سیرین لە عێراق.

٢- قاسمی کوڕی موحەممەد لەحیجاز.

٣- رجائی کوڕی حەیوە لەشام، شازی ئەم سیانەیش موحەممەدی کوڕی سیرینە. کەمێ کەڕ بووە، شەرعزانێکی وەك خۆی کەم بوو، لە قەزاوەتا دەستی بالآی هەبوو.

ئیبنو حیببان دەیفەرموو: موحەممەدی کوڕی سیرین ئەورەعترینی کەسی خەڵکی بەصرە بوو، شەرعزان (فەقیە)ێکی گەورە بوو، پیاوێکی رێزداری پایە بەرزبوو، فەرموودەکانی لەبەربوو، زۆر بەجوانیو رەوانی، خەونزانێکی ناسراوە. لەتەمەنی (٧٧) حەفتاو حەوت ساڵیدا عەمری خودایکرد.

ئەم چەند هەواڵە لە (البداية والنهاية)ی ئیبنو کەثیرەوە سەبارەت بە ئیبنو سیرین راگوێز دەکەین:

١- ئەبو عەمری باوکی ئیبنو سیرین، لە کۆیلە دیلەکانی عەینول تەمرە، خالیدی کوڕی وەلید دیلی کرد، ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك کڕیو موکاتەبەی لەگەڵ کردو ئازادبوو، کۆمەڵێ منالی لێ بوو، هەموویان لە خاسانی خودان:

أ- موحەممەد.

ب- ئەنەسی کوڕی سیرین.

ج- مەعبەد.

د- یەحیا.

هـ- حەفصە.

و- کەریمە هەرشەشیان تابیعینو هەر شەشیان ثقەو متمانە پێکراوی پیاوانی فەرموودەن.

٢- دەستووری ئیبنو سیرین وابوو، کە لەلایا باسی خراپەی کەسێ بکرایە، ئەو بە پێچەوانەوە باسی باشەی ئەوی دەکرد.

٣- لەوجۆرە پیاو چاکانەبوو، هەرکەسێ چاوی پێی دەکەوت خودای یاد دەکەوتەوە {إِذَا رَأَوْهُ ذَكَرُوا اللَّهَ}.

٤- کاتێ ئیمامی ئەنەس مرد، رایسپارد کە موحەممەدی کوڕی شیرین تەرمەکەی بشوات، ئەوکاتە ئیبنو سیرین لەزیندانا بوو، خاوەن مافەکە رازی بوو کە بچێت، ئەویش شۆردی.

٥- چەند نموونەیێ لەخەو پەرژێنەکانی ئیبنو سیرین:

أ- پیاوێ پێی گوت: لەخەوما رۆن زەیتون دەکەم بەسەر زەیتووندا؟ گوتی: ژنەکەت دایکی خۆتە، کەکابرا چووە بنجو بناوانی وابوو، بەمناڵی لەدایکی دابڕابوو، بە گەورەیی مارەی کردبوو، بەوەی نەزانی بوو.

ب- پیاوێ پێی گوت: لەخەوما ریشم زۆر درێژبوو بوو، خۆم تەماشایم دەکرد؟ فەرمووی: تۆ بانگبێژی؟ گوتی: بەڵێ. پێی فەرموو: کە دەچیتە سەربان بۆ بانگدان، تەماشای دراوسێکان مەکەو لەخودا بترسە!!

ج- پیاوێ تر پێی گوت: لەخەوما ریشم درێژ بوو بوو، بڕیمو کردم بە شاڵو لەبازاڕ فرۆشتم؟

فەرمووی: لەخودا بترسە، دیارە شایەتی درۆو ناهەق دەدەیت.

١٥١١- حديث أَبِي جُحَيْفَةَ السُّوَائِيِّ قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – وَرَأَيْتُ بَيَاضًا مِنْ تَحْتِ شَفَتِهِ السُّفْلَى الْعَنْفَقَةَ. [١٥١١]

ئـەبو جوحەيفـەی ئـەل – سـووائی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) دیوە، هەندێ مووی سپی بـە بـەر لێوی خواروویەوە بوو، بە چاڵی چەناگەیەوە بوو.

١٥١٢- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَبْيَضَ، قَدْ شَابَ، كَانَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) يُشْبِهُهُ. {الحديث: ٦٠٣٤ = ٦٠٣٦ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٤، رقم: ١٤١٣ = ٣٥٤٤، ٣٥٥٣. ترمذى. أدَب: ٢٨٢، ٢٨٢٧. تحفة الأشراف: ١١٧٩٨} : [١٥١٢]

ئـەبو جوحەيفـە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەرم دیـوە، پیاوێکی سوورو سپی بـوو، سـەری بۆز بـوو بـوو، حەسـەنی کوڕی عـەلی شێوەی تەواو لە پێغەمبەر دەچێ).

## (٣٠) باب إثبات خاتم النبوة وصفته ومحله من جسده (ﷺ)
## چەسپاوە کە مۆری پێغەمبەرایەتی، بە ناو شانی پێغەمبەرەوە بوو

١٥١٣- عنْ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) قال: (ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ ثُمَّ تَوَضأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضوئِهِ ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ

---

[١٥١١] تجريد/٤، ژمـارە: ١٤١٣ = ٣٥٤٤ بخـاری. پوختـەی موسـليم/٤، ژمـارە: ١٥٦٤ = ٦٠٣٤ شـيحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

[١٥١٢] بڕوانە ژمارە: (١٥١١).




بَـيْنَ كَتِفَيْـهِ مِثْـلَ زِرِّ الْحَجَلَـةِ). (الحـديث ١٩٠- أطرافـه في: ٣٥٤٠، ٣٥٤١، ٥٦٧٠، ٦٣٥٢):[1513]

سائیبی کوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پوورم بردمی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هێنا بەسەر سەرمداو دوعاونزای پیتو فەڕی بۆکردم، ئەنجا دەستنوێژی گرتو لەئاوەچۆڕی دەستنوێژەکەیم بۆ موفەڕك خواردەوە، ئەوجا لەپشتیەوە ڕاوەستامو سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد، کەبەناوشانیەوە بوو، وەك دوگمەی پەردە کوللە وابوو، یاخود وەك هێلکەی کەو وابوو. (ت/ ٤/ ٢٨٠/ ١ تاج-٣ ز-٩٢ ژ-٣١٣٧ ـ ش/ ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

سائیب خۆیو باوکی لەهاوڕێیانن، خۆی دەفەرموێ: لەحەجیماڵئاوایی دا لەگەڵ پێغەمبەردا باوکم حەجی پێ کردم، تەمەنم حەوت ساڵ بوو، پێنج فەرموودەی هەیە، بوخاری هەر پێنجیانی گێڕاوەتەوە، ئاوەچۆڕی دەستنوێژ پاکە، بەتایبەتی هی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشەوا ئەبو حەنیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (گمیزو گشت دەردراوەکانی تری لەشی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) پاکن).

[1513] تجرید/١، ژمارە: ١٤١ = ١٩٠ بخاری. مسلم: ٢٢٤٥ = ٦٠٤٠ شیحا - ١٥٦٠ پوختەی موسلیم (بخاری رقم الکتاب/٤ رقم الباب/٤٠).

## (٣١) باب صفةِ النَّبيِّ (ﷺ) وَمَبْعَثِه وَسِنِّه

## باسی سیفەت‌و نیشانەو شێوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ باسی ڕەوانەکردنی لەلایەنی خوداوە، لەگەڵ تەمەنیدا

١٥١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلاَ بِالْقَصِيرِ، وَلَيْسَ بِالأَبْيَضِ الأَمْهَقِ، وَلاَ بِالآدَمِ، وَلاَ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ وَلاَ بِالسَّبِطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ). {الحديث: ٦٠٤٢ = ٦٠٤٤ فم} : [١٥١٤]

ئەنەسی کوڕی ملیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی دەستەی مام ناوەندی بوو، نەزۆر درێژو نەزۆر کورت بوو، ڕەنگی سپی‌و سوور بوو، بەڵام نەك سپییەکی سادەی بێ تام، سەوزەیش نەبوو، قژیشی نە لوولێکی کرژبوو، وە نەخاوێکی تەواو خاویش بوو کە خودا کردی بە پێغەمبەرو سرووش (وەحی)ی بۆ نارد، تەمەنی چل ساڵ بوو، دە ساڵ مایەوە لە مەککە لەو ماوەیەدا سرووشی بۆ دەهات، وە لەمەدینەیش هەروەها دە ساڵی تر مایەوەو سرووشی بۆ دەهات، وە کاتێ کە گیانی پاکی سپارد، تەمەنی شەست ساڵ بوو، هەمووی بیست مووی سپی لەسەرو ڕیشیا نەبوو!). {بڕوانە: ژمارە: ١٥٩٥ + ژمارە: ١٥٩٢ لە پوختەی موسلیم لەزنجیرە: ١٢٣٦دا} . {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٣٠٨٤ ج/٤ = چاپی چوارەم} .

---

[١٥١٤] بخاری. مناقب: ٣٥٤٧. پوختەی موسلیم: ١٥٥٦ - ٦٠٤٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).

## (٣٢) باب كَمْ سِنُّ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ يَوْمَ قُبِضَ
## کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بە میوانی تەمەنی چەند بوو؟

١٥١٥- حديث عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) تُـوُفِّيَ وَهْوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [١٥١٥]

عائیشەی دایکی موسوڵمانان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بە میوانی، تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو.

## (٣٣) باب كَمْ أَقَامَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ بِمَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ
## پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چەندێ لە مەککەو چەندێ لە مەدینە ژیاوە؟

١٥١٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّـةَ ثَـلاَثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحَى إِلَيْهِ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرًا، وَمَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ سَـنَةً. {الحـديث: ٦٠٥٠ = ٦٠٥٢ فم} : [١٥١٦]

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: تەمـەنی پێغەمبـەر (درووی خـودای لەسـەر بـێ) چـل سـاڵ بـوو، کـە خـودا کـردی بـە پێغەمبـەر، ئەوکاتە لەشاری مەککە بوو، جا لەمەککە سیازدە ساڵ مایەوە، لەو ماوەیەدا نیگا (وەحی - سرووش)ی بۆ دەهات، ئەوجا خـودا فـەرمانی پێکـرد کـە لـە مەککـەوە کۆچو بارو ڕەو بکا بۆ شاری مـەدینەی نازدار، ئیتر کۆچی کرد بۆ ئەوێو لەوێش

---

[١٥١٥] بخاری. مناقب: ٣٥٣٦. مسلم: ٦٠٤٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/١٩).

[١٥١٦] بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٥٩٢ = ٦٠٥٠ شـیحا (بخـاری رقـم الكتـاب/٦٣ رقـم الباب/١٤).

ده ساڵ مایەوە، لەوێش سرووشی بۆ دەهاتو سەر گەرمی پەخشی پەیامەکەی بوو، کاتێ مەرگیش بوو بە میوانیو مرد تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٣١٥، ٣١٥٤} . بڕوانە: ژمارە: ١٥٥٦ لە زنجیرە: ١٢١١ + ژمارە: ١٥٩٥ لەپوختەی موسلیم.

## (٣٤) باب في أسمائه ﴿ﷺ﴾

## باسی ناوەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)

١٥١٧- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ لِي أَسْمَاءً، أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّـهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمَيَّ، وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ أَحَدٌ»، وَقَدْ سَمَّاهُ اللَّهُ رَءُوفًا رَحِيمًا. {الحديث: ٦٠٥٩ = ٦٠٦٢ فم. تجريد/كوردى/٤، لاپەڕە: ٩٦، رقم: ١٤٠٦ = ٣٥٣٢، ٤٨٩٦. ترمذى. أدب: ٢٨٤٠. تحفة الأشراف: ٣١٩١}: [١٥١٧]

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من کۆمەڵێ ناوم هەیە: من ناوم موحەممەدە، کە بەواتا بەردەوام سوپاسکراوە، من ناوم ئەحمەدە، کە بەواتا بەردەوام سوپاسی خوا دەکا، زیاتر لەهەموو کەس، من ناوم (الماحی)یە، واتە: ناوم قەلاچۆکەرە، واتە: ئەو کەسەم کە خودا بەهۆی منەوە کوفرو بێ باوەڕی دەسڕێتەوەو قەڵاچۆی دەکاو فڕی تێ دەخا، من ناوم (الحاشر)ە، واتە: کۆکەرەوە، ئەو کەسەم کە هەموو نەوەی ئادەم کۆدەکەمەوەو بەشوێن مندا

---

[١٥١٧] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٠٦ = ٣٥٣٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٩٠ - ٦٠٥٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/١٧).

دێنو دەچین بۆ مەحشەرو کۆدەبینەوە لەدەشتی کۆبوونەوە، من ناوم (العاقب = پاشەبەرە)یە، واتە: دواهەمین پێغەمبەرم).

زوهری دەیفەرموو: بێگومان کە خودای گەورەیش لە قورئانا، لەکۆتایی سوورەتی بەقەرەدا، ناوی ناوە (رەئووف)و (رەحیم) وەك دەفەرموێ: {لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – التَّوْبَة – ٩/١٢٨}:

واتە: ئەی نەتەوەی موسوڵمانان! خودا پێغەمبەرێکی بۆتان ناردووە، کە لەخۆتانەو ئەویش وەك ئێوە ئادەمیزادە، کە دارای کۆمەڵێ رەوشی بەرزی وایە، کە هاندەرن بۆئەوەی کە باوەڕی پێ بهێنن.

**یەکەم سیفەتی باشی ئەوەیە:** لە رەگەزی خۆتانەو ئەویش ئادەمیزادە.

**دووەم:** پەرۆشە بۆتانو هەرکاتێ تووشی رەنجو مەینەتو سەراسێ بـبن هەوڵ دەدا کە رزگارتان بکا.

**سێیەم:** خەمخۆرتانەو بەدڵ حەزدەکا دەرگای هەموو خێرێکتان لێ بکاتەوە.

**چوارەم:** بۆ موسوڵمانانو بڕواداران زۆر بەسۆزو دڵسۆزو میهرەبانە).

ئەمە دەقی گێڕانەوەی ژمارە (١٥٩٠)ی پوختەی موسلیم بوو، ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە (١٤٠٦) بەرگی چوارەم:

عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطعِمٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لِي خَمْسَةُ اسْمَاءٍ: انَا مُحَمَّدٌ وَانَا احْمَدُ وَانَا الْمَاحِي الَّذي يَمْحُو اللّٰهُ بِي الْكُفْرَ وَانَا الْحَاشِرُ الَّذي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي وَانَا الْعَاقِبُ) (الحديث: ٣٥٣٢، طرفه في: ٤٨٩٦):

جوبەیری كوری موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (من پێنج ناوی تایبەتیم هەیە: من ناوم محمدە، وە ناوم ئەحمەدە، وە ناوم فەلاچۆكارە، واتە: ئەو كەسەم كە خودا بەهۆی منەوەو كوفرو بێ باوەڕیی فەلاچۆ دەكاو فڕی تێ دەخا، وەمن ناوم كۆكەرەوەیە، واتە: ئەو كەسەم كە هەموو نەوەی ئادەم كۆ دەكرێنەوەو بە شوێنما دێن و دەچین بۆ دەشتی مەحشەرو گرد دەبینەوە لە دەشتی كۆبوونەوە، من ناوم پاشەبەرەیە، واتە: دواهەمین پێغەمبەرم). (تاج/٤ ل/٢٥٣ ف/٤ ز/٨٢ - باسی لە دایكبوونی پێغەمبەرو..).

## (٣٥) باب علمه ﴿ﷺ﴾ وَشِدَّةُ خَشْيَتِه

## باسی زانستو عیلمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ باسی زۆر لە خودا ترسانی

١٥١٨- حديث عَائِشَةُ قالت صَنَعَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – شَيْئًا فَرَخَّصَ فِيهِ فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ قَالَ « مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّىْءِ أَصْنَعُهُ ، فَوَاللَّهِ إِنِّى لأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً » [١٥١٨]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كارێكی ئەنجام دا، بە پێی مۆڵەت كردی، بە فورسی نەیگرت، كەسانێ خۆیان لە كردنی ئەو كارە پاراست، كە پێغەمبەر بەو شێوەیە كردی، گوایە كاری وا جێگەی گومان بێ، ئەمەیش گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە

[١٥١٨] بخاری. أدب: ٦١٠١، مسلم: ٦٠٦٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٧٢).

وتاریکی فەرمووی: سوپاسی خودای کردو ئەوجا فەرمووی: (ئەوە بۆچی کەسانێ لە خۆیانەوە، دوور دەگرن لە کردنی هەندێ شت، کە من دەیکەم، گوایە بە کەمی دەزانن، دەی سوێند بە خودا، من گەلێ گەلێ لەوان خودا باشتر دەناسمو زۆر زۆریش لەوان زیاتر لە خودا دەترسمو شەرمو شکۆی لێ دەکەم!).

## (٣٦) باب وجوب إتباعه (ﷺ)

## پەیڕەوکردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێویستە

١٥١٩- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): حَدَّثَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِمْ، فَاخْتَصَمُوا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِلزُّبَيْرِ: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ»، فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، ثُمَّ قَالَ: «يَا زُبَيْرُ اسْقِ ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ». فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ) الآيَة. {الحديث: ٦٠٦٥ = ٦٠٦٨ فم}: [١٥١٩]

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: زوبەیری باوکمو پیاویکی ئەنصاری لە خزمەتی پێغەمبەردا، لەسەر سەرەی ئاو، کە لە ئاوەڕۆکانی ئەلحەررەوە دەهات، کە باخە خورمایان پێ ئاودەدا، بوو بەهەرایان، پیاوە ئەنصارییەکە بە زوبەیری گوت: ئاوەکە بەردە، بابڕوا بۆ ناو باخەکانی ئێمەیش، زوبەیریش رازی نەبوو، بە پێشنیارەکەی ئەو، جا بۆ ناوبژیو دادگایی

[١٥١٩] بخاری. مساقاة: ٢٣٥٩، پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٩٧ = ٦٠٦٥ شیحا (بخاری رقم الکتا/٤٢ رقم الباب/٦).

کـردن چـوونه خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ). حـەزرەت (دروودی خودای لەسـەر بـێ) بـە زوبـەیری فـەرموو: (ئـەی زوبـەیر! مەزراکـەت ئاوبدەو ئەوسا ئاوەکە بەرەڵا بکە بۆ دراوسێی باخەکەت). کابرای ئەنـصاریش تووڕە بـوو، گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەوە پـوورزای خۆتـە، بۆیـە بـەلای ئەودا دەیبەی!

جا رووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گۆڕاو رەنگی زویـری لێ نیشتو فـەرمووی: (ئـەی زوبـەیر! باخەکـەت ئاوبـدە، هـەتا دێراوەکانیـان تـەواو پڕدەبن‌و ئاوەکە دەدا لە قەدیان ئەوجا ئاوەکەیش بگرەوە!).

زوبـەیر (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: وادەزانم کـە ئـەم ئایەتـە لـەم بارەیەوە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ}.

واتـە: رووداو وانییـە، کـەوەك ئـەوان گومـان دەبـەن، بـەو کەسـەی کـە وا پەروەردگاری تۆیە، ئەو ناپاکانە باوەڕناهێنن هەتا بـە ئـارەزووی دڵ، تـۆ دەکـەن بە حەکەم‌و بە فـەرمانڕەوا، لـەو کێشەو بەرنانـەدا کـە روو دەدەن لـەناویانا، وە لەگـەڵ ئەوەیـشا بـەو بڕیـارو حوکمـە رازی بـبن، کـەتۆ دەیـدەیت بـەبێ چـەن‌و چـۆن‌و پێنـاخۆش بـوون). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٧٣، ژمـارە: ١٩٢٤ ج/٤ = چـاپی چوارەم}.

١٥٢٠- حديث فَقَالَ الزُّبَيْرُ وَاللَّهِ إِنِّي لأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ ( فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ. [١٥٢٠]

لە ژمارە: (١٥١٩)دەدا بە تەواوی ڕابورد.

---

[١٥٢٠] بخاری. تفسیر: ٧٠١٧، پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥١٩ = ٥٨٦٩ شیحا.

## (٣٧) باب تَوْقِيرِه ﴿ﷺ﴾ وَتَرك إِكْثَارِ سُؤَالِه مَالاَ ضَرورَةَ إِلَيْهِ، أو لا يَتَعَلَقُ بِهِ تَكْلِيفُ وَمَا لاَ يَقَعُ، وَغَيْرُ ذَالك

## تا رێزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زیاتر بگیرێ، هێشتا هەر کەمە، شتێکیش کە پێویست نەبێ، یان کاری کردەنی نەبێ، داواکردنی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نابەجایە

١٥٢١- عَنْ سَعْدِ بْنُ أَبِي وَقَاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَحُرِّمَ عَلَيْهِمْ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ». {الحديث: ٦٠٦٩ = ٦٠٧٢ فم. بخاری. إعتصام: ٧٢٨٩}: [١٥٢١]

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەناو موسوڵمانانا تاوانبارترین موسوڵمان ئەو کەسەیە، کە لەشتێ بەبێ پێویستی زۆر، بکۆڵێتەوەو پرسیاری زۆری لەبارەوە بکا، شتەکە خۆی هێشتا حەرام نەکرابێ، بەڵام بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام ببێ، لە موسوڵمانانی تریش). {تاج/٤، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨٤٥ ج/٤}.

١٥٢٢- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُطبَةً مَا سَمِعْتُ مِثلَهَا قَط قَالَ: (لَوْ تَعْلَمُونَ مَا اعْلَمُ لَضحِكْتُمْ قَلِيلا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا قَالَ فَغَطى اصْحَابُ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وُجُوهَهُمْ لَهُمْ خَنِينٌ فَقَالَ رَجُلٌ: مَنْ ابي؟ قَالَ: فُلانٌ فَنَزَلَتْ هَذهِ الايَةُ: ﴿لا تَسْألُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤكُمْ﴾ رَوَاهُ النَّضرُ وَرَوْحُ بْنُ عُبادَةَ عَنْ شُعْبَةَ. ( الحديث ٤٦٢١- اطرافه في:

---

[١٥٢١] بخاری. إعتصام: ٧٢٨٩. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٩٩ = ٦٠٦٩ (بخاری رقم الکتاب/٩٦ رقم الباب/٣).

٩٣- ٥٤٠- ٧٤٩- ٦٣٦٢- ٦٤٦٨-٦٤٨٦- ٧٠٨٩- ٧٠٩٠- ٧٠٩١-
٧٢٩٤- ٧٢٩٥ ): [١٥٢٢]

ئەنەس (ڕەزای خوودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) وتارێکی دا، هەرگیز وتاری وادلگیرو دڵ هەژێنم نەبیستووە، فەرمووی: (ئەوەی کەمن دەیزانم، ئەگەر ئێوە دەتان زانی، کەم پێ دەکەنین وزۆر دەگریان) فەرمووی: جا یارانی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لەسەر یارانی) ڕووی خۆیان داپۆشی و دایان لەپرمەی گریان، پیاوێك عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەر یخودا ! باوکی من کێ یە؟ فەرمووی: (فیسارە کەسە )جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لا تَسْاَلُوا عَنْ اشْيَاء انْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾.
(تاج/٦ ل/١٤١- ژمارە:١٧، ١٩ )+ (ریاض/٢ ز/٥٤ ژ: ٢/٤٤٧ ل/٣٢) .

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم پیاوە بۆیە ئەم پرسیارەی لەپێغەمبەر کرد، چونکە خەڵك بەناڕەوا تانەی زۆڵییان لێ دەدا، بەڵام پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) بەدرۆی خستنەوەو فەرمووی تۆ کوڕی باوکی خۆتی.

ئەمە ژمارە (١٦٥٨)ی تەجریدی بوخاری بوو، ئەمەیش ژمارە (١٥٩٨)ی پوختەی موسلیمە، کە سوودو بەهرەی پتری لەخۆ گرتووە:

عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَلَغَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ أَصْحَابِهِ شَيْءٌ، فَخَطَبَ فَقَالَ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ، وَلَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»، قَالَ: فَمَا أَتَى عَلَى

---

[١٥٢٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٥٨ = ٤٦٢١ بخاری. مسلم: ٢٢٥٩ ترقيم محمد فؤاد = پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٥٨٩ = ٦٠٧٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/٥). سورة المائدة.

أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمٌ أَشَدُّ مِنْهُ، قَالَ: غَطَّوْا رُءُوسَهُمْ وَلَهُمْ خَنِينٌ، قَالَ: فَقَامَ عُمَرُ بن الخطاب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، قَالَ: فَقَامَ ذَاكَ الرَّجُلُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «أَبُوكَ فُلاَنٌ»، فَنَزَلَتْ هذه الآية: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ). {الحديث: ٦٠٧٢ = ٦٠٧٥ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٤، رقم: ١٦٥٨ = ٤٦٢١، ٩٣، ٥٤٠، ٧٤٩، ٦٣٦٢، ٦٤٦٨، ٦٤٨٦، ٧٠٨٩، ٧٠٩٠، ٧٠٩١، ٧٢٩٤، ٧٢٩٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەتەرەف هاوەڵانیەوە شتێ گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لەو جۆرە شتە نەبوو، جا وتارێکی دڵهەژێنی دا، فەرمووی: (ئەمڕۆ لەناو ئەم نوێژەدا کە بەجەماعەت بۆم کردن، بەهەشتو دۆزەخیان هێنایە بەرچاوم، ئەو نازو بەهرەو خێرو خۆشییەی کە ئەمڕۆ لە بەهەشتدا بینیم هەرگیزاو هەرگیز شتی وام نەدیوە، وەکی تریش ئەو ناخۆشیو سزاو ئێشو ئازارەی کە ئەمڕۆ لە دۆزەخدا بینیم قەت قەت شتی وا ناخۆشم نەبینیوە!

دەی ئەوە کەمن دەیزانم، لە هەواڵو باسی سزاو تۆڵەی خودا، ئەگەر ئێوە دەتانزانی، سامو ترسو بیم دایدەگرتنو، کەم پێ دەکەنینو زۆر دەگریان).

فەرمووی: جا ڕۆژی وا سەختو ناخۆش لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕووی نەداوە، فەرمووی: جا هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕووی خۆیان داپۆشیو دایان لەپرمەی گریان، فەرمووی: جا عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) هەستاو بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودامان بە پەروەردگاری خۆمان قەبووڵەو ئیسلاممان بە ئایینی خۆمان قەبووڵەو موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە. پیاوێ هەبوو ناوی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە بوو، کە لەگەل یەکێکا

دەمی تێ دەگیرا، بەرابەرەکەی تانەی زۆڵی لێ دەداو پێی دەگوت: تۆ کوڕی باوکی خۆت نیت، جا پیاوە بۆ ساخکردنەوەی رشتەی بنەچەی خۆی، عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باوکی من کێیە؟ فەرمووی: (تۆ کوڕی باوکی خۆتیو باوکی تۆ حوزافەیە!). جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ – المائدة – ٥/١٠١}:

واتە: ئەی موسوڵمانینە! پرسیاری وا لە پێغەمبەری خۆتان مەکەن کە بەدەردتان نەخواو ئەرکی سەرشانتان گرانتر بکا، بەتایبەتی پرسیاری وا ئەگەر وەڵام بدرێتەوە راستی رووداوەکەتان بۆ دەردەکەوێو زۆر جار وادەبێ بە پێچەوانەی خواستی ئێوەوە دەبێ، لەکاتی وادا تووشی تەریقیو شەرمەزاریو ناخۆشیو دڵتەنگی دەبن!!). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٣١٩٥ ج/٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨٤٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٧٩ + ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٠١ + ریاض/٢، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٤٤٧}.

١٥٢٣– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّاسَ سَأَلُوا نَبِيَّ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– حَتَّى أَحْفَوْهُ بِالْمَسْأَلَةِ فَخَرَجَ ذَاتَ يَوْمٍ فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَقَالَ « سَلُونِى لاَ تَسْأَلُونِى عَنْ شَىْءٍ إِلاَّ بَيَّنْتُهُ لَكُمْ ». فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ الْقَوْمُ أَرَمُّوا وَرَهِبُوا أَنْ يَكُونَ بَيْنَ يَدَىْ أَمْرٍ قَدْ حَضَرَ. قَالَ أَنَسٌ فَجَعَلْتُ أَلْتَفِتُ يَمِينًا وَشِمَالاً فَإِذَا كُلُّ رَجُلٍ لاَفٌّ رَأْسَهُ فِى ثَوْبِهِ يَبْكِى فَأَنْشَأَ رَجُلٌ مِنَ الْمَسْجِدِ كَانَ يُلاَحَى فَيُدْعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ فَقَالَ يَا نَبِىَّ اللَّهِ مَنْ أَبِى قَالَ « أَبُوكَ حُذَافَةُ ». ثُمَّ أَنْشَأَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضى الله عنه فَقَالَ رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ سُوءِ الْفِتَنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– « لَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ قَطُّ فِى الْخَيْرِ وَالشَّرِّ إِنِّى صُوِّرَتْ لِىَ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَرَأَيْتُهُمَا دُونَ هَذَا الْحَائِطِ. قَالَتْ أُمُّ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ مَا سَمِعْتُ

بِابْنٍ قَطُّ أَعَقَّ مِنْكَ أَأَمِنْتَ أَنْ تَكُونَ أُمُّكَ قَدْ قَارَفَتْ بَعْضَ مَا تُقَارِفُ نِسَاءُ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ فَتَفْضَحَهَا عَلَى أَعْيُنِ النَّاسِ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذَافَةَ وَاللَّهِ لَوْ أَلْحَقَنِي بِعَبْدٍ أَسْوَدَ لَلَحِقْتُهُ». [١٥٢٣]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: خەڵك گەلێ پرسیاریان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد، بگرە بە پرسیار بێزاریان کردبوو، جا ڕۆژێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ماڵ دەرچوو سەرکەوتە سەر دوانگەو فەرمووی: ئەمڕۆ چی پرسیارێکتان هەیە لێم بکەن، هەرچیم لێ بپرسن ڕوونی دەکەمەوە بۆتان کە یاران ئەمەیان بیست کپ بوونو نقەیان نەکردو مەترسی ئەوەیان لێ نیشت کە ئەمە هەڕەشە بێو سەرەتاو بەرایی سزایەکی لەسەر پێ بێ! ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) گوتی: جا کاتێ بە ڕاستو بە چەپا ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد هەر پیاو بوو دەگریاو بە جلەکەی سەری خۆی داپۆشیبوو، پیاوێ هەبوو کە لەگەڵ یەکێکا دەمی تێ گیرا بەرابەرەکەی پێی دەگوت: تۆ بیژوییتو کوڕی باوکی خۆت نیت، جا ئەو پیاوە بۆ ساخکردنەوەی ڕشتەی بنەچەی خۆی عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باوکی من کێیە؟ فەرمووی: باوکی تۆ حوذافەیە ئەنجا عومەر (رەزای خودای لێ بێ) هەڵی دایەو گوتی: بە خودایەتی خودا خۆش نوودینو ئیسلاممان بە ئایین پەسەند کردووەو موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە، هەمیشەش پەنا دەگرین بە پەنای خودا لە ئاژاوەو پشێوی خراپ، پێغەمبەر (سەرو ماڵو منالٚ بە قوربانی بێو صەلاواتو سەلامو دروودی خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: هەرگیزاو هەرگیز وەك ئەمڕۆ لە بابەت چاکەو لە بابەت

---

[١٥٢٣] بخاری. تفسیر: ٧٢٩٥، ٤٦٢١، ٦٤٨٦. مسلم. فضائل: ٦٠٧٢، ٦٠٧٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٠ رقم الباب/٣٥).





خراپەوە شتم نەدیوە، بەهەشتو دۆزەخیان هێنایە بەرچاومو لە پاڵ ئەم دیوارەدا وێنەی هەردووکیانم دی!

لە گێڕانەوەیەکدا: دایکی عەبدوڵڵای کوڕی حوذافە بە عەبدوڵڵای کوڕی گوت: نەم بیستووە قەد هیچ کوڕێ بەقەد تۆ ئاوا خراپ بێ بۆ دایکی خۆی، تۆ چۆن نەترسایت لەوە کە دایکیشت وەك ژن گەلی سەردەمی نەزانی تووشی ئەو ئیشە خراپە بووبێتو ئاوا بەو ڕەنگە لەبەرچاوی دۆستو دوشمن سڕی هەڵماڵێتو ڕیسوای بکەی!! عەبدوڵڵاش گوتی: بە خودا من دەربەستی ئەمانە نیم، ئەگەر حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بیشی کردمایە بە کوڕی بەندەیەکی ڕەشیش دەبووم بە کوڕیو دەم کرد بە باوکی خۆم! (ش).

١٥٢٤- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: (سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا فَلَمَّا أُكْثِرَ عَلَيْهِ غَضِبَ ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ سَلُونِي عَمَّا شِئْتُمْ قَالَ رَجُلٌ مَنْ أَبِي؟ قَالَ: أَبُوكَ حُذَافَةُ. فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (الحديث ٩٢ ـ طرفه في: ٧٢٩١)[١٥٢٤]:

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ لەبارەی چەند شتێکەوە لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارکرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لەباس کردنی ئەو شتانە نەبوو، جاکاتێ پرسیارێکی زۆری لێکرا تووڕەبوو، چونکە پرسیارەکان پێویست نەبوون، بگرە بۆ بەربەرەکانی بوون، بەڵام فەرمووی: (بەئارەزووی خۆتان پرسیارتان چییە لێم بکەن وەڵامتان دەدەمەوە، بۆ وەڵامەکەی دانامێنم، چونکە خودا ڕێگەی

---

[١٥٢٤] تجرید/١، ژمارە: ٨٠ = ٩٢ بخاری. مسلم: ٢٣٦٠ - ٦٠٧٨ (بخاری رقم الکتاب/٣ رقم الباب/٢٨).

ئەوەی پێداوم) عەبدوڵڵای کوڕی حوذافە، کەلەکاتی دەمەقاڵێ دا تانەی ئەوەیان لێ دەدا کەکوڕی باوکی خۆی نییە، بۆ راستیو دروستی ئەم تۆمەتە عەرزی پێغەمبەری کرد: قوربان! من حاڵەکەم وایە، ئەو خەڵکە وام پێ دەڵێن: بفەرموو بۆم ساخ بکەرەوە: باوکی من کێیە؟ حوذافەیە کەباوکی شەرعیمە یاکەسێکی ترە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): تۆ کوڕی حوذافەیو حوذافە باوکتە) پیاوێ تریش هەڵساو گوتی: قوربان! ئەی باوکی من کێیە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) سالمەکە ئازادکراوی شەیبەیە).

جاکاتێ ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) تەماشای تووڕەیی کرد لەرووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیارە، مەترسی ئەوەی لێ پەیدا بوو کەپرسیارەکان سەربکێشن بۆ پێناخۆش بوونی خواو پێغەمبەر، لەبەرئەوە عوزری بۆی هێنایەوەو عەرزی کرد: قوربان! لەسەردەستی خودای گەورەو مەزن دا پەشیمانین لەهەر پرسیارێ کەتۆ پێت ناخۆش بێ!

## (٣٩) بابُ فَضل النَّظَر إِلَيْهِ ﴿ﷺ﴾ وَتَمَنِّيه
## بەهرەی تەماشاکردنی پێغەمبەرو بە ئاواتخواستنی ئەوە

١٥٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ فِى يَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ وَلاَ يَرَانِى، ثُمَّ لأَنْ يَرَانِى أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُمْ». قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ (يعني إبراهيم بن سفيان): الْمَعْنَى فِيهِ عِنْدِى لأَنْ يَرَانِى مَعَهُمْ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ ثم لا يراني، وَهُوَ عِنْدِى مُقَدَّمٌ وَمُؤَخَّرٌ}. {الحديث: ٦٠٨٢ = ٦٠٨٥ فم. تجريد/٤، ناالبخارى، الترجمة الكردية، رقم: ١٤٣١ = ٣٥٨٩}: [١٥٢٥]

---

[١٥٢٥] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٣١ = ٣٥٨٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٦٠٣ - ٦٠٨٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٣٥).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، کەخۆی کەسی هەموو کەسە، دیارە کە خودای گەورەو سەروەرەو فریاڕەسە، ئێوە دەکەونە ڕۆژێکی واوە لەپاش مەرگی من، حەزدەکەن کە سەروماڵی خۆتان بەخت بکەنو لەباتی ئەوە یەك چرکەسات من ببینن، ئیتر ئەگەر لەوەدوایش نەم بینن بەو دەمە کەمەو بەو تاقە چاوپێکەوتنە قاییل دەبنو بەستان دەکا). (مامۆستا ئیبراهیم کوڕی موحەممەد کوڕی سوکفیانی نەیسابووری کە شاگردی ئیمامی موسلیمە، کە صەحیحی موسلیم لە ئیمامی موسلیمەوە گێڕانەوە – ریوایەت – دەکا، کە ناسراوە بە ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: لە ڕستەکانی ئەم فەرموودەیەدا پێشو پاش هەیە بەلای منەوە، بەم شێوەیە: دەقەکە خۆی ئاوایە: (وَلاَ يَرَانِي لأَنْ يَرَانِي أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُمْ). لەسەر فەرمایشتی ئەبو ئیسحاق ئەم دەقە لەپێشا ئاوا بووە: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ فِي يَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ وَلاَ يَرَانِي، ثُمَّ لأَنْ يَرَانِي {مَعَهُمْ} أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ» جا وشەی (مَعَهُمْ) دواخراوەو براوەتە دوا دواوە.

## ڕوونکردنەوە:

نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە هاوەڵان هانبدا لەسەر ئامادە بوونی کۆڕی زانستی پێغەمبەر، لەماڵەوە، لەسەفەر، بە مەبەستی فێربوونی یاسانامەو لەبەرکردنی فەرموودەکانیو ڕاگەیاندنیان بە پەیوەندیداران وە ئەوەشیان پێ ڕابگەیەنێ، ئەگەر لەم لایەنەوە درێغیو کۆتایی بکەن ڕۆژێ دەبێ پەشیمان دەبنەوە، وەك ئیمامی عومەر لەم لایەنەوە دەیفەرموو: (هاموشۆی بازاڕو سەرقاڵیم بە مامەڵەوە دووری خستمەوە لە کۆڕی زانستی پێغەمبەر).

## (٤٠) باب فضَائِل عيسى عَلَيْهِ السّلَام

## باسى گەورەیى عیساى كوڕى مەریەم (درودى خوداى لەسەر بێ)

١٥٢٦- عن ابَي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (انَا اوْلَى النَّاسِ بابْنِ مَرْيَمَ وَالانْبِيَاءُ اوْلادُ عَلاتٍ لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَـهُ نَبِيٌّ) (الحديث:٣٤٤٢، طرفه في:٣٤٤٣ ): [١٥٢٦]

ئەبو هویرەیره (رەزاى خوداى لێ بێ) دەفەرموێ: بەگوێى خۆم لەدەمى پێغەمبەرى خۆشەویستم بیست (درودى خوداى لێ بێ) دەیفەرموو: (لەهەر دووجیهاندا من لە هەموو كەسێكى تر، لە پێشترم بەعیساى كوڕى مەریەم) عەرزیان كرد:- چۆن ئەى پێغەمبەرى خودا؟! فەرمووى: (پێغەمبەرەكان هەموو براى یەكترین، بەلاّم دایكیان جیایە و هەریەكێ لە هەوێیەكن، گەرچى دایكیان جیایە بەلاّم لەبنەڕەتدا ئایینەكەیان یەكە، كە خودا بەیەك زانین و یەكتا پەرستیە، هۆى ئەوەش كە من لە پێشتر پێغەمبەرم بەعیسا ئەوەیە كە لە نێوانى من و لەنێوانى ئەو دا پێغەمبەرى تر نییە).

ئەمەیش ژمارە: (١٦١٨)ى پوختەى موسلیمە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ فِى الأُولَى وَالآخِرَةِ». قَالُوا: كَيْـفَ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ؟ قَالَ: «الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ مِنْ عَلاَّتٍ، وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى، وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ، فَلَيْسَ بَيْنَنَا نَبِىٌّ». {الحديث: ٦٠٨٥ = ٦٠٨٦ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٤، رقم: ١٣٧١ = ٣٤٤٢، ٣٤٤٣. أبو داود. السنة: ٤٦٧٥. تحفة الأشراف: ١٤٧٦٩}:

---

[١٥٢٦] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٧١ = ٣٤٤٢ بخارى. مسلم: ٢٣٦٥ محمد فؤاد = پوختەى موسلیم/٤، ژمارە: ١٦١٨ = ٦٠٨٥ شیحا (بخارى رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٤٨).

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەهـەردوو جیهانـدا مـن لەهـەموو کەسـێکی تـر، لەپێشترم بە عیسای کوڕی مەریەم).

عەرزیان کرد: چۆن؟ ئەی پێغەمبـەری خـودا! فـەرمووی: (پێغەمبـەرەکان هەموو برای یـەکترین، بـەڵام دایکیـان جیایـەو هەریـەکێ لەهەوێیـەکن، گەرچـی دایکیـان جیایـە (واتــە: شــەریعەتەکانیان جیـا جیایـە) بــەڵام لــە بنەڕەتــدا ئاینەکەیان یەکە، کە خودا بەیەك زانینو یەکتا پەرستیە، هۆی ئەومیش کەمن لەپێـشتر پێغەمبــەرم بەعیـسا ئەومیـە کـە لـەنێوانی مـنو لـەنێوانی ئـەودا پێغەمبەری تر نییە). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢١٢}.

١٥٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَالَ: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ يُولَدُ إِلاَّ نَخَسَهُ الشَّيْطَانُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخًا مِنْ نَخْسَةِ الشَّيْطَانِ إِلاَّ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ». ثُمَّ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (وَإِنِّي أُعِيـذُهَا بِـكَ وَذُرِّيَّتَهَـا مِـنَ الـشَّيْطَانِ الـرَّجِيمِ). {الحـديث: ٦٠٨٦ = ٦٠٨٩ فـم. بخـاري. تفـسير: ٤٥٤٨. تحفـة الأشراف: ١٣٢٧٦} : [١٥٢٧]

ئــەبو هــورەیرە (ڕەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو منداڵێ کاتێ لەدایك دەبێ، شـەیتان سـەرە سیخورمەیەکی لێ دەدا، بەهۆی ئـەو سـەرە سیخورمەی شـەیتانەومیە کـە منـداڵ هـەر کەلـەدایك دەکەوێتـە خـوارەوە، دەس بـەجێ هـاوارو قیـژەیێ دەکـا، بـەڵام عیــسای کــوڕی مەریــەمو مەریــەمی دایکــی، بەرئــەم ســەرە ســیخورمەیە نەکەوتوون).

[١٥٢٧] بخـاری. تفـسیر: ٤٥٤٨، پوختــەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٦١٩ = ٦٠٨٦ شـیحا (بخـاری رقـم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٤٤).

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: ئەگـەر حەزدەکـەن بـۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتە بخوێنن:

{وإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ - آل عمران – ٣/٣٦}:

واتـە: وە بەڕاسـتی مـن ئـەم کـچەم و نەتـەوەی ئـەم کـچەم دەهاومـە پـەنای میهرەبان و تەوانایی تۆوە، لە دەس بۆ بـردن و زیـان لێدانی ئیبلیـسی دەرکـراوی بەشبڕاو لە رەحمەتی تۆ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢١١ ج/٤}.

١٥٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلاً يَسْرِقُ فَقَالَ لَهُ عِيسَى: سَرَقْتَ؟ قَالَ: كَلاَّ وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، فَقَالَ عِيسَى: آمَنْتُ بِاللَّهِ، وَكَذَّبْتُ نَفْسِي». {الحديث: ٦٠٨٩ = ٦٠٩٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٧٢ = ٣٤٤٤ فتح الباري}: [١٥٢٨]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (عیسای کوڕی مەریـەم (سڵاوی خودایـان لێ بـێ) چاوی لێ بوو، کابرایێ دزی دەکا، پێی فەرموو: تۆ دزیـت دەکـرد. کابراکـە گـوتی: نەء، بەو خودایەی کەهەر خۆی خودایە، من شتی وام نـەکردووە! عیـسای کـوڕی مەریـەمیش (درووودی خودایـان لەسـەر بـێ) فـەرمووی: بـاوەڕم هەیـە بـەخوداو چاوی خۆم بەدرۆ خستەوە!!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٣٢١٣}.

## روونکردنەوە:

دەڵـێن: جـارێ کوێرێـك و ئیفلیجێـك و پیـاوێکی سـاخ، لەجێگـەیێ دەبـن، ساخەکە برێ پارەی پـێ دەبـێ، لـە بنمیـچی جێگەکـەدا دەیـشارێتەوەو دەڕوا بـۆ

---

[١٥٢٨] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٣٧٢ = ٣٤٤٤ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٦٢٠ = ٦٠٨٩ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٤٨).

کارێ، کەدێتەوە دەڕوانێ پارەکە نەماوە، بۆ چارەسەرو راوێژ دەچێ بۆلای عیسا، عیسا دەچێ لەگەڵیا بۆ جێگەی پارە دزراوەکە، لێی دەپرسێ: کێت لەگەڵدا بوو؟ دەڵێ: منو ئەم کوێرەو ئەم ئیفلیجە بووین، دیارە ئەم کوێرە چاوی لێم نەبووەو ئەمەیش ئیفلیجە، کەواتە دزەکە ئەمانە نییە!! عیسا دەفەرموێ: (بە پێچەوانەوە، قاچی ئەم کوێرەو چاوی ئەم ئیفلیجە ئەم دزییەیانکردووە!).

## (٤١) مِنْ فَضَائِلِ إبراهِيم الخليل ﴿ﷺ﴾

## باسی گەورەیی‌و سەروەریی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل (سلاوی خودای گەورەی لەسەر بێ)

١٥٢٩- عَنْ ابِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (اخْتَتَنَ ابْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلام وَهُوَ ابْنُ ثَمَانِينَ سَنَة بالْقَدُّومِ)وفي رواية (بالْقَدومِ) مخففة. (الحديث: ٣٣٥٦، طرفه في:٦٢٩٨)؛ [١٥٢٩]

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئیبراهیم دروودی خودای لەسەر بێت) لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا لەگوندی قەددوم، بەتەشوێ خۆی سوننەت کرد). (تاج/٤ ل/٣٧٥ ف/٢ ز/١١٥ باسی گەورەیی حەزرەتی ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێت)).

لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (فەرمان بەئیبراهیم دەکرێ کە خۆی سوننەت بکات، بەتەشوێیەك خۆی سوننەت دەکات ئازارو ئێشێکی زۆری دەبێ، خودا سروشی بۆ دەنێرێ کەپەلەت کرد بەر لەوەی ئامێری خۆ سوننەت

---

[١٥٢٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٤٨ - ٣٣٥٦ بخاری. مسلم: ٢٣٧٠، پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٦٠٧ - ٦٠٩٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٨).

کردنەکەت بۆ ڕوون بکەینەوە تۆ خۆت سوننەت کرد، حەزرەتی ئیبراهیم دەفەرموێ: پەروەردگارم! حەزم نەکرد کەفەرمانی تۆ دوا بخەم).

١٥٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ، إِذْ قَالَ: (رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى، قَالَ: أَوَلَمْ تُؤْمِنْ، قَالَ: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي)، قَالَ: «وَيَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ طُولَ لَبْثِ يُوسُفَ لأَجَبْتُ الدَّاعِيَ». {الحديث: ٦٠٩٤ = ٦٠٩٨ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٤٠ چاپی/١٠١٠ز، رقم: ١٣٥٥ = ٣٣٧٢، ٣٣٧٥، ٣٣٨٧، ٤٥٣٧، ٤٦٩٤، ٦٩٩٢}:[١٥٣٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گریمان من لەفەرزی مەحاڵدا، گومانم لەزیندوو بوونەوەدا هەبێ، حەزرەتی ئیبراهیم شتی وای نەبووەو گومانی وای بەدڵدا نەهاتووە، بەڵام ئەم گفتوگۆی ئیبراهیمە، کە لەم ئایەتەدا خودا باسی فەرمووە بۆمان، تەنیا بۆ ئەوە بووە کە بەهۆی دیتن بەچاوی سەرەوە، تەواو دڵ ئەستوورو دڵنیابێ، وەکوو چۆن ئێمە بە بیستن بۆمان دەرکەوتووە، کە دەریای گەورە هەیە، بەڵام کاتێ بەچاوی سەر ئەو دەریایانە دەبینین، هەرچەند زانستو عیلمە کۆنەکەمان، کە لە ڕێگەی ژنەوتنەوە بووە، هیچ پتر نابێ، بەڵام پتەوترو دامەزراو تر دەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێ لەوەدوا بڵێ دەریا هەبوونی نییە، ئێمە بڕوای پێ ناکەین.

ئایەتی گوفتوگۆکە ئەمەیە: {رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ: أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ: بَلَى وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي – البقرة – ٢/٢٦٠}:

---

[١٥٣٠] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٥٥ = ٣٣٧٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٦٠٧ = ٦٠٩٤ بخاری. (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/١).

واته: ئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من! ئەی خاوەنی هەردوو جیهان! نیشانم بدە ئەم خەڵکە کە دەمرن و ساڵەهای ساڵ دەبنەوە بە خاك و ئەندامەکانی لەشیان دەڕزێن و دەبن بەخۆڵ و خاشاك و بای رۆژگار، بە ئارەزووی خۆی، شەن و کەویان دەکاو، پەخش و پرشیان دەکا لە وولاتا، چۆن چۆنی تۆ لەقیامەتا زیندوویان دەکەیتەوەو، بەچی شێوەیێ ئەو پارچە پەرت و پرژو بلاوانە یەك دەخەیتەوە؟!

خودا لە وەلامی ئەم پرسیارەی ئیبراهیمدا فەرمووی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ هێشتا باوەڕت نەهێناوە بەوە کەمن دەتوانم مردوو زیندوو بکەمەوە؟ عەرزی کرد: با، بەخودا زۆر باش ئەوە دەزانم و باوەڕم بەوە هەیە، بەلام دەمەوێ کە دلم ئاو بخواتەوەو وەها دابمەزرێ، کە ئیتر دلە ڕاوکێ و ڕێگەی سووسەی سووسەبای وەسواس و ڕاڕایی و دوو دلی نەفس و دەروون، لەدڵ و ناخی مندا نەمێنێ و، ئەوەی کە بەدڵ باوەڕم پێی کردووە، بەچاوی سەریش بیبینم!!

خودای مەزن بۆ خۆی دەیزانی کە ئیبراهیم ئەمە دەزانێ، وەلێ بۆیە ئەم پرسیارەی لێ کرد، تا بیسەران وەلامەکەی ئیبراهیم ببیستن!). {تاج/٤، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٣٧٤٥ چ/٤}.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموۆشی: رەحمەتی خودا لە پێغەمبەر لووط بێ، لەسەر چی بیرو باوەڕێ فەرموویەتی: {لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ}. واتە: حەزرەتی لووط پێغەمبەر، کاتێ هۆزەکەی پەلاماری میوانەکانیان داو، ویستیان دەستدرێژی لە ناموسیان بکەن و، هەولی لەگەلیاندا دا، کە وازبێنن و دەست لەدەستدرێژی ناموسی لەگەل میوانەکانی هەلبگرن و روو زەردی بەسەر خۆی و میوانەکانی نەهێنن و هەولەکەی سوودی نەبوو، پاش ئەمە فەرمووی: کاشکی یاخۆم هێزێکم ببوایە، هەتا چارەی ئەم بێ

شەرمیو نامەردیو دەستدرێژییەی ئێوەم پێ بکردایە، یاخۆم هێزێکی ئاوەهام ببوایە، یاخود لەپەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا بوومایە، تا ئەو چارەسەری ئەم بێ شەرمییەی ئێوەی بکردایە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لووط چۆن وا دەفەرموێ، خۆ ئەو، واتە: حەزرەتی لووط، لەڕاستیدا لەپەنای زاتێکی تەواناو بەهێزدا بوو، کە خودای تەوانایە، ئیتر چۆن وا دەفەرموێ). حەزرەت فەرمووی: (لەلایەکی تریشەوە ئافەریم بۆ حەزرەتی یووسف، بۆ خۆیو بۆ ئارامو بۆ سەبریو بۆ خۆگرتنی، بەڕاستی مەردو بەسەبرو ئازاو بە پشوو بوو، ئەوە بوو پاش ئەو هەمکە حەپسو زیندانییە، کاتێ پاشا ناردی بەشوێنیدا، کە بچێ بۆلای، ئەو نەچوو، وە ویستی لەپێشدا بیسەلمێنێ کە ئەو بەناڕەوا بەندکراوە، بۆیە بە فروستادەکەی پاشای فەرموو، بڕۆ عەرزی پاشا بکە، فەرمان بدا، ئەو ژنانە کەدەستی خۆیان لەتو پەت کرد، لەگەڵ ژنی وەزیردا، لەکاتی دەعوەتەکەدا، کۆیان بکاتەوەو لێیان بپرسێ، حاڵی ئەوان چۆن بووەو حاڵی منیش چۆن بووە؟ تا پاکو پیس دەربکەوێ بۆ هەموو لایێ، ئەوسا من دێم بۆلای پاشا، وەڵێ ئەگەر من لەجێگەی یووسف بوومایەو ئەوەندەی ئەو، وازۆر لە بەندیخانەدا بمایەتەوە، هەر کەدەهاتن بەدوامدا، گورج بەبێ چەندو چوون دەچووم لەگەڵیان بۆ لای پاشا). {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٣٩٢٣ چ/٤}.

١٥٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَطُّ، إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ، ثِنْتَيْنِ فِي ذَاتِ اللَّهِ: قَوْلُهُ (إِنِّي سَقِيمٌ)، وَقَوْلُهُ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا)، وَوَاحِدَةً فِي شَأْنِ سَارَةَ، فَإِنَّهُ قَدِمَ أَرْضَ جَبَّارٍ، وَمَعَهُ سَارَةُ وَكَانَتْ أَحْسَنَ النَّاسِ، فَقَالَ لَهَا: إِنَّ هَذَا الْجَبَّارَ إِنْ يَعْلَمْ أَنَّكِ امْرَأَتِي يَغْلِبْنِي عَلَيْكِ، فَإِنْ سَأَلَكِ فَأَخْبِرِيهِ أَنَّكِ أُخْتِي، فَإِنَّكِ أُخْتِي فِي الإِسْلاَمِ،

فَإِنِّى لاَ أَعْلَمُ فِى الأَرْضِ مُسْلِمًا غَيْرِى وَغَيْرَكِ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْضَهُ رَآهَا بَعْضُ أَهْلِ الْجَبَّارِ، أَتَاهُ فَقَالَ: لَهُ لَقَدْ قَدِمَ أَرْضَكَ امْرَأَةٌ لاَ يَنْبَغِى لَهَا أَنْ تَكُونَ إِلاَّ لَكَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَأُتِىَ بِهَا، فَقَامَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ إِلَى الصَّلاَةِ، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ لَمْ يَتَمَالَكْ أَنْ بَسَطَ يَدَهُ إِلَيْهَا، فَقُبِضَتْ يَدُهُ قَبْضَةً شَدِيدَةً فَقَالَ لَهَا: ادْعِى اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِى، وَلاَ أَضُرُّكِ، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ، فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَةِ الأُولَى، فَقَالَ لَهَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ، فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، فَقَالَ: ادْعِى اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِى، فَلَكِ اللَّهَ أَنْ لاَ أَضُرَّكِ، فَفَعَلَتْ، وَأُطْلِقَتْ يَدُهُ، وَدَعَا الَّذِى جَاءَ بِهَا فَقَالَ لَهُ: إِنَّكَ إِنَّمَا أَتَيْتَنِى بِشَيْطَانٍ، وَلَمْ تَأْتِنِى بِإِنْسَانٍ، فَأَخْرِجْهَا مِنْ أَرْضِى وَأَعْطِهَا هَاجَرَ، قَالَ: فَأَقْبَلَتْ تَمْشِى، فَلَمَّا رَآهَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ انْصَرَفَ فَقَالَ لَهَا: مَهْيَمْ؟ قَالَتْ: خَيْرًا، كَفَّ اللَّهُ يَدَ الْفَاجِرِ، وَأَخْدَمَ خَادِمًا). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَتِلْكَ أُمُّكُمْ يَا بَنِى مَاءِ السَّمَاءِ). {الحديث: ٦٠٩٧ = ٦١٠١ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٢٦، رقم: ١٣٤٩ = ٩٩٢، تجريد/٣ = ٢٢١٧ فتح البارى. ساڵى چاپ: ١٠١٠ز}: [١٥٣١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبراهیم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز درۆی نەکردووە، تەنیا سێ درۆ نەبێت، ئەو سێ درۆیەیش دوانیان ساخ لەبەر ڕەزای خودا بووە: یەکێ لەو دووە ئەوە بووە کە فەرموویەتی: (إِنِّى سَقِيمٌ): من نەخۆش و دەردەدارم. کە مەبەستی حەزرەتی ئیبراهیم لەم قسەیە ئەوە بووە کە لەگەڵ هۆزەکەی دەرنەچێ بۆ کارێکی ناشایستە، ئەوەکەی تریشیان ئەوە بووە کە فەرموویەتی: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا). واتە: کاتێ هۆزەکەی گەڕانەوە بۆ بوتخانەکەو ڕوانیان هەموو بتەکانیان شکاوە، تەنیا گەورەکەیان

[١٥٣١] تجريد/٤، ژمارە: ١٣٤٩ = ٣٣٥٨. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٦٠٩ = ٦٠٩٧ بخارى. (بخارى رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٨).

بێستانی بێ خاوەنە، چیدەکەن لەکوشتن‌و بڕین‌و تالآنی‌و ژن تالآنی کردن بیکەن!!

جا موسوڵمانان بەم بۆنەیەوە فەرماندەی شەڕەکە، کەناوی (موسلیم) بوو، ناوەکەیان گۆڕی چونکە مسلم واتە: بێوەی‌و ئاشتیخواز، وەلەناوەکەی‌و لەواقیعی حاڵی، ناوێکی تازەیان بۆ داتاشی‌و ناویان نا (مُسرِف) واتە: زیادەڕەویکار لەخوێنڕشتن دا!! وەیەزید خۆی لەپاش ئەم زوڵم‌و زۆرە لەناو چوو، بوو بەمیوانی مەرگی رەش.

٣- ئەمەی ئەمڕۆ لەسوریا روودەدا، حافظ أسد بەیەك دووڕۆژ لەحمص‌و حما،، دەهەزار کەس دەکوژێ، ئەژدەهاکەی عیراق بەسەدان هەزار مرۆڤی بێتاوانی موسوڵمان ئەنفال دەکاو زیندەبەچاڵ دەکا، دووبارە بوونەوەیەکی کردەوەکانی یەزیدوموسریفی کوڕی عوقبەیە. جا خوا بکا کوردەکانی خۆشمان نەکەونە ئەم هەڵانەوە.

لەراستیدا ئەمڕۆ ئەم عەلمانییەتە وای لەو خەڵکە کردووە باوەڕی بەهیچ نەماوە، مەگەر بەبەرژەوەندی خۆی، وەزۆرداریش لەزۆرداری پێش خۆی پەندو عیبرەت وەرناگرێ، لەبەرئەوە دەبینین هەموو زۆردارێ لەئەوەی پێش خۆی خراپترە، وەئەو چیکردووە ئەمیش دەیکا بەزیادەوە!

بڕوانە: (بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٩٧ ژیاننامەی ئەسماء کەدایکی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرە، فەرموودەی ژمارە: ٧٥ + تاج/ ٥/ ٧٩ز —١٠ف- ٢. مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + تاج/ ١٠ل-٢٥٤ز- ٩٧. لەهۆزی ثەقیف هەڵاتبازێك‌و خوینمژێك پەیدا دەبن + ریاض/١ل —١٨٦ژ- ٢٠٢ز-٢٥. باسی دابەش کردنی کەلەپوورەکەی زوبەیر).

٤- حەنظەلەی باوکی ئەم عەبدوڵلایە ناسراوە بە: (غسيلُ المَلائكة: شۆراوی فريشتە) چونكە لەغەزای ئوحوددا بەلەشی گرانەوە شەهيد بوو، فريشتە شۆردبوويانو لەشپيسييان دەركردبوو.

١٦٣٠- عَنْ انَسٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: رَاى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النِّسَاء وَالصِّبْيَانَ مُقْبِلِينَ مِنْ عُرُسٍ فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُمْثِلا فَقَالَ: اللَّهُمَّ انْتُمْ مِنْ احَبِّ النَّاسِ الَيَ قَالَهَا ثلاث مِرَارٍ(الحديث: ٣٧٨٥، طرفه في: ٥١٨٠)؛ (١٦٣٠)

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) کۆمەڵێ ژنو منداڵی یاریدەدەرانی دی لە شایی و زەماوەند دەگەڕانەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بۆ تەعبیر لەهەستی جوانی و ڕێزو نرخزانی خۆی بەرامبەربەم دوو چین و توێژەی کۆمەڵگا، ڕێك هەڵسایە سەرپاو ڕاست ڕاوەستاو سێ جار فەرمووی: (خودا ئاگای لێیە کە ئێوە لە خۆشەویسترین کەسانن لای من). (تاج/٥ ل/١٦٧ ز/٤٤ ف/٣- ش).

١٦٣١- وعنْهُ في روايةٍ، قَالَ: جَاءتْ امْرَاةٌ مِنْ الانْصار الَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَكَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (وَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ انَّكُمْ احَبُّ النَّاسِ الَيَ مَرَّتَيْنِ) (الحديث: ٣٧٨٦، طرفاه في: ٥٢٣٤، ٦٦٤٥)؛ (١٦٣١)

دیسان ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ لەهۆزی یاریدەدەران (ئەنصار)هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) منداڵێکی

---

(١٦٣٠) تجريد/٤، ژمارە: ١٤٨٤ = ٣٧٨٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢٥ب = ٦٣٦٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٣ رقم الباب/٥).

(١٦٣١) تجريد/٤، ژمارە: ١٤٨٥ = ٥٢٣٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢٥ب = ٦٣٦٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٣ رقم الباب/٥).

خۆیی پێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ دا کرد، وەفەرمووی: (بەو کەسە کەگیانی من وا لەدەسیا، ئێوە ئەی دەستەی یاریدەدەران! خۆشەویسترین کەسن لە لای من). سێ جار ئاوای فەرموو. لەگێڕانەوەی ئێرەدا دوو جار ئاوای فەرموو. (تاج/٥ ل/١٦٧ ز/٤٤ ف/٤).

له ژماره: (١٧٢٥ب)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قَالَ: فَخَلاَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ». ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. {الحديث: ٦٣٦٦ = ٦٣٧٧ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٤٨٥ = ٣٧٨٦، ٥٢٣٤، ٦٦٤٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێك لەپاریدەدەران (واتە: لەئەنصار هاتە خزمەتی حەزرەت درودی خوای لەسەربێ)) قسەو گفتوگۆی لەگەڵا کرد، قسەی نهێنی خۆی هەبوو، عەرزی حەزرەتی کرد، لەپاشا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەیە، ئێوە ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! خۆشەویسترین کەسن لەلای من). سێجار وای فەرموو. {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٥٢ ج/٤}.

١٦٣٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ الأَنْصَارَ كَرِشِي وَعَيْبَتِي، وَإِنَّ النَّاسَ سَيَكْثُرُونَ، وَيَقِلُّونَ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَاعْفُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ».[١٦٣٢]

---

[١٦٣٢] تجريد البخاری/٤، ژمارە: ١٤٩٠ = ٣٧٩٩. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢٧ = ٦٣٦٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٣ رقم الباب/٢١).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕاستیدا یاریدەدەران (واتە: ئەنصار) جەرگو هەناوی منن‌و بوخچەی رازو نیازو جێی باوەڕی منن، ئەوان زۆر بەجوانی ئەرکی سەرشانی خۆیان بەپیاوانە بەجێ هێناوە، ماوەتەوە ئەوە کەهەقیان بۆ بکرێتەوەو تۆڵەی چاکەیان بدرێتەوە!

بزانن تادێ خەڵکی تر زۆردەبن، بەڵام یاریدەدەران بەرە بەرە کەم دەبنەوە، چونکە لەهەر چوارلاوە خەڵك دێن‌و ئیسلام دەبن، بەڵام یاریدەدەران چینێکی تایبەتین، کە یەکێکیان لێ مرد، یەکێکی تر نایەتە جێی، جا ئەگەر کەسێ لەئێوە بوو بەسەرەوکاری کارێ، وە دەیتوانی کە زیان یا سوود بەخەڵك بگەیەنێ، ئەوە باچاکەی چاکی یاریدەدەران وەربگرێ‌و چاوپۆشی لەخراپیان بکا). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٦١} . باسی پاکژی‌و گەورەیی یاریدەدەران.

## (٤٤) باب في خير دور الأنصار ﴿﵁﴾
## باسی باشێتی ماڵەکانی یاریدەدەدەران (ئەنصار) (رەزای خودایان لێ بێ)

١٦٣٣- عَنْ أَبِى أُسَيْدٍ الأَنْصَارِىَّ، يَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «خَيْرُ دُورِ الأَنْصَارِ بَنُو النَّجَّارِ، ثُمَّ بَنُو عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ بَنُو سَاعِدَةَ، وَفِى كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ». قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أُتَّهَمُ أَنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟! لَوْ كُنْتُ كَاذِبًا لَبَدَأْتُ بِقَوْمِى بَنِى سَاعِدَةَ، وَبَلَغَ ذَلِكَ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، فَوَجَدَ فِى نَفْسِهِ، وَقَالَ: خُلِّفْنَا فَكُنَّا آخِرَ الأَرْبَعِ، أَسْرِجُوا لِى حِمَارِى آتِى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). فَكَلَّمَهُ ابْنُ أَخِيهِ سَهْلٌ، فَقَالَ: أَتَذْهَبُ لِتَرُدَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

أَعْلَمُ، أَوَلَيْسَ حَسْبُكَ أَنْ تَكُونَ رَابِعَ أَرْبَعٍ؟ فَرَجَعَ وَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. وَأَمَرَ بِحِمَارِهِ فَحُلَّ عَنْهُ).[١٦٣٣]

ئەبو ئوسەیدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: شایەتی دەدەم کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (باشترین هۆزو بنەماڵەی یاریدەدەران هۆزو بنەماڵەی بەنی نەجارن، ئەوجا هۆزو بنەماڵەی بەنی عەبدی ئەشهەل، ئەوجا هۆزو بنەماڵەی بەنی حاریثی کوڕی خەزرەج، ئەوجا بنەماڵەی بەنی ساعیدە، وە گەڕەك‌و تیرەو بنەماڵەکانی یاریدەدەران هەموویان خێردارو خاسن!).

ئەبو سەلەمە کە ئەم فەرموودەیە لەئەبو ئوسەیدی ئەنصارییەوە دەگێڕێتەوە فەرمووی: ئەبو ئوسەید فەرمووی: گومانی ئەوە بەمن دەبریٚ، کە خوانەخواستە درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە بکەم؟ ئەگەر من شتی وام بکردایە، هۆزەکەی خۆم کە بنەماڵەی بەنی ساعیدەن ئەوانم دەکرد بەیەکەم‌و دەمخستنە پێشەوە.

کاتیٚ ئەم پلە دانانە لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ بنەماڵەکانی ئەنصار دانراو، ئەم هەواڵە گەیشتەوە، بە سەعدی کوڕی عوبادە، کە لەبنەماڵەی بەنی ساعیدەیە، کە لەپلەی چوارەمدا بوون، لەمە دلگران بوو، وە گوتی: ئێمە دواخراوین، دواترینی ئەم چوار بنەماڵەین، ئادەی گویٚ درێژەکەمم بۆزینکەن، دەچم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ).

سەهلی برازای قسەی لەگەڵدا کرد، گوتی: دەچی چی دەکەی؟ گوایە بەرپەرچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەدەیتەوە، دیارە کە

---

[١٦٣٣] تجرید/٢، ژمارە: ٧١٣ = ١٤٨١ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢٨ = ٦٣٧٢ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الکتاب/٦٣ رقم الباب/٧).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخۆیەوە شت نالێ، بەسرووشی خودایی شت دەڵێ، کەواتە ئەو باشتر لە کارەکە دەزانێ، ئەوەت بەس بێ کەچوارەمی چوار بنەماڵەکەیت؟

سەعدیش گەڕایەوەو فەرمووی: (خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشتری لێ دەزانن!).

جا فەرمانی کرد زینەکەیان لە گوێ درێژەکە گرتەوە. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٨ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٣٤٥٩ ج/٤}. باسی پاکژیو گەورەیی یاریدەدەران.

## (٤٥) باب في حُسْنِ صُحْبَةِ الأنصار ﴿رضي الله عنهم﴾
## باسی بەجوانی ڕەفتارکردن لەگەڵ یاریدەدەران

١٦٣٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ فِي سَفَرٍ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي، فَقُلْتُ لَهُ: لاَ تَفْعَلْ. فَقَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ الأَنْصَارَ تَصْنَعُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئًا آلَيْتُ أَنْ لاَ أَصْحَبَ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلاَّ خَدَمْتُهُ. (وَزَادَفِي رِوَايَة): وَكَانَ جَرِيرٌ أَكْبَرَ مِنْ أَنَسٍ). {الحديث: ٦٣٧٥ = ٦٣٨٧ فم. بخاري. جهاد: ٢٨٨٨. تحفة الأشراف: ٣٢٠٨. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١٨٩ = ٢٨٨٩ فتح الباری}:[١٦٣٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا لەگەڵ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیدا بووم، لەڕێگە، لەو سەفەرەدا خزمەتی دەکردم، منیش پێم گوت: شتی وا مەکە، خزمەتم مەکە. فەرمووی:

---

[١٦٣٤] تجريد البخاری/٣، ژمارە: ١١٨٩ = ٢٨٨٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢٩ = ٦٣٧٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٧١).

لەڕاستیدا من خۆم بەچاوی خۆم دیومە کە ئەنصار، کە ناسراون بە یاریدەدەرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەندە بە دڵسۆزیو بەدڵو بەداو خزمەتی پێغەمبەریان دەکرد، جا منیش سوێندم خواردووە، کە هەرکاتێ لەگەڵ کەسێ لە یاریدەدەراندابم، ئەو چاکەیەی بدەمەوەو منیش خزمەتی ئەو بکەم.

لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی زیاترە: جەریر بەتەمەن لە ئەنەس گەورەتر بوو!).

## (٤٦) باب دُعَاءِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ لغفار وَ أسلَم

## باسی نزای باشی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ هۆزی غیفارو ئەسلەم

١٦٣٥- أَبِي هُرَيْرَةَ – رضى الله عنه – عَنِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ ، وَغِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا » [١٦٣٥]

لە ژمارە: (١٣٩٧)ی تەجریدی بوخاریدا، ئاوەهایە:

عن ابن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) انَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ عَلَى الْمِنْبَرِ: غِفَارُ غَفَرَ اللّٰهُ لَهَا وَاسْلَمُ سَالَمَهَا اللّٰهُ وَعُصَيَّةُ عَصَتْ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ (الحديث: ٣٥١٣):

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (هۆزی غیفار خودا لێیان خۆش بێ،هۆزی ئەسلەمیش خودا سەلامەتو خۆشو بێوەییان کا، هۆزی عوصەییەش لە خوداو

---

[١٦٣٥] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٩٧ = ٣٥١٣ بخاری. مسلم ترقیم محمد فؤاد: ٢٥١٨ (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٦).

لــه پێغەمبــەری خــودا یــاخی بــوون!). (تــاج/٥ ل/٢٤٠ ف/٣ ز/٧٦ - باســی پایەی هۆزەکانی غیفارو..).

١٦٣٦- حديث ابن عمر(رضـى الله عنهمـا) أَنَّ رَسُـولَ اللّٰـهِ – صـلى الله عليـه وسلم – قَالَ عَلَى الْمِنْبَرِ « غِفَارُ غَفَرَ اللّٰهُ لَهَا ، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللّٰهُ ، وَعُـصَيَّةُ عَـصَتِ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ» [١٦٣٦]

له پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنْ خُفَافِ بْنِ إِيمَاءٍ الْغِفَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّٰـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي صَلاَةٍ: «اللَّهُمَّ الْعَنْ بَنِي لِحْيَـانَ وَرِعْـلاً وَذَكْـوَانَ وَعُـصَيَّةَ، عَـصَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ». {الحـديث: ٦٣٨١ = ٦٣٩٣ فم}:

خوفـافی کـوڕی ئـەیمائی ئـەلغیفاری (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) له قونووتی نوێژی بەیانیدا، که لەروکوع هەڵدەسایەوە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ الْعَنْ بَنِي لِحْيَانَ وَرِعْـلاً وَذَكْـوَانَ وَعُـصَيَّةَ، عَـصَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»:

خودایە! نـەفرەت بکـە لـەهۆزی بـەنی لـەحیانو لـەهۆزی ریعـلو لـەهۆزی زەکـوانو لـەهۆزی عوصـەییە، کـە لـەخوداو پێغەمبـەری خـودا یـاخی بـوونو، نامەردییان له موسوڵمانەکان کردو، لەرووداوی بیری مەعوونەدا، حەفتا کەسیان له یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شـەهیدکرد، کەپێیان دەگوتن قـورراء، واتـە: قورئـان خوێنـەکان). {بڕوانـە: تـاج/٤، زنجـیرە: ١٠٢، ژمـارە: ٤٦٤٤ ج/٤}.

---

[١٦٣٦] پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٣٣ - ٦٣٨١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٦).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش ئەم نەفرەتو نزای شەڕە لەمانە، لە قونووتا، نزای خێریشی بۆ ئەم دوو هۆزەی تر دەکرد، لەناو هەمان قونووتداو دەیفەرموو: (هۆزی غیفار خودا لێیان خۆش بێ، هۆزی ئەسلەمیش خودا خۆش و سەلامەتو بێوەییانکات!). {تاج/١، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥٦٢ + تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٧٥ ج/٤} . سوورەتی ئالی عیمران.

**ڕوونکردنەوە:**

خوفافی کوڕی ئەیمائی ئەل – غیفاری (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، ئەیمائی کوڕی ڕەحەضەی باوکی خوفاف ئاغای هۆزی غیفار بوو، بەرنوێژی بۆیان دەکرد، لە موسوڵمانە پێشینەکانە. خوفافیش بەرنوێژی بۆ هۆزی غیفار دەکرد خەتیبیشیان بوو، ئامادەی ڕێکەوتنی حودەیبییە بوو، لە غەیقە دادەنیشت زۆر هاموشۆی مەدینەی دەکرد، بەغەوی دەفەرموێ: لەسەردەمی عومەردا مردووە.

## (٤٧) باب مِنْ فَضَائِلِ غِفَارٍ وَأَسْلَمَ وَجُهَيْنَةَ وَ أَشْجَعَ وَمُزَيْنَةَ وَتَمِيم وَدَوْسٍ وَطيِّئٍ باسی گەورەیی ئەم هۆزانە: غیفارو ئەسلەمو جوهەینەو ئەشجەعو موزەینەو تەمیمو دەوس و طیأ

١٦٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «قُرَيْشٌ وَالأَنْصَارُ وَمُزَيْنَةُ وَجُهَيْنَةُ وَأَسْلَمُ وَغِفَارُ وَأَشْجَعُ مَوَالِيَّ، لَيْسَ لَهُمْ مَوْلَى دُونَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ». {الحديث: ٦٣٨٦ = ٦٣٩٨ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٩٢ = ٣٥٠٤، ٣٥١٢ فتح الباري} :[١٦٣٧]

---

[١٦٣٧] تجريد البخاري/٤، ژمارە: ١٣٩٢ - ٣٥٠٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢١ = ٦٣٨٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢).

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هۆزی قـوڕەیش‌و کۆمەڵەی ئەنـصارەکان‌و هـۆزی موزەینـەو هـۆزی جوهەینـەو هـۆزی ئەسـلەم‌و هـۆزی غیفـارو هـۆزی ئەشـجەع، ئەمانـە دۆسـت‌و یـارو یـاوەری مـنن، بێجگـە لـە خـوداو لـە پێغەمبـەری خـودا، خاوەن‌و یارو یاریدەدەری تریان نییە). {تـاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمـارە: ٣٥٤٣ چ/٤ = چاپی چوارەم} . پایەی هۆزەکانی غیفارو.......

**ڕوونکردنەوە:**

هۆزانی موزەینەو جوهەینەو ئەسلەم‌و غیفـارو ئەشجەع، لـەپێش هـاتنی ئیسلاما، لەچاو هۆزە بەهێزەکانی تری عەرەبەکانا ئەو نموودەیان نـەبوو، بـەڵام لەبەرئـەوەی لـە قـەبوڵی ئیـسلاما لەپێـشەوە بـوون خـودا نمـوودو نگـین‌و ڕێزدارییەکەی بەخشی بەوان!

١٦٣٨- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: قَالَ النبيّ (صلى الله عليـه وسـلم): اسْلَمُ وَغِفَارُ وَشَيْءٌ مِنْ مُزَيْنَةَ وَجُهَيْنَةَ اوْ قَالَ شَيْءٌ مِنْ جُهَيْنَةَ اوْ مُزَيْنَةَ خَيْرٌ عِنْدَ اللّهِ اوْ قَالَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِـنْ اسَـدٍ وَتَمِـيمٍ وَهَـوَازِنَ وَغَطفَـانَ (الحـديث:٣٥١٦م، طرفـه في: ٣٥١٥):[١٦٣٨]

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) فـەرموی: (ئەسـلەم و غیفـار و هـەنێ لەموزەینـەو هـەنێ لـە جوهەینە، یافەرموی: هەنێ لە جوهەینەو هەنێ لەموزەینە باشترن لەلای خودا،

[١٦٣٨] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٩٩ = ٣٥١٦م بخاری. مـسلم: ٦٣٨٨ شـیحا (بخاری رقـم الكتـاب/٦١ رقـم الباب/١١).

یافەرمووی: باشترن لە ڕۆژی قیامەتا لە ئەسەدو هەوازین و غەطەفان). (تاج/٥ ل/٢٤٢ ز/٧٦ ف/٦).

١٦٣٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّمَا بَايَعَكَ سُرَّاقُ الْحَجِيجِ مِنْ أَسْلَمَ وَغِفَارَ وَمُزَيْنَةَ - وَأَحْسِبُ جُهَيْنَةَ – (مُحَمَّدٌ الَّذِي شَكَّ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ أَسْلَمُ وَغِفَارُ وَمُزَيْنَةُ (وَأَحْسِبُ جُهَيْنَةَ) خَيْرًا مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، وَبَنِي عَامِرٍ، وَأَسَدٍ وَغَطَفَانَ، أَخَابُوا وَخَسِرُوا»؟! فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُمْ لأَخْيَرُ مِنْهُمْ». {الحديث: ٦٣٩١ = ٦٤٠٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٩٨ = ٣٥١٥، ٣٥١٦، ٦٦٣٥. ترمذي. مناقب: ٣٩٥٢. تحفة الأشراف: ١١٦٨٠}:[١٦٣٩]

ئەبوبەكرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەقرەعی كوڕی حابیس كە پیاوێكی ناوداری هۆزی بەنی تەمیم بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی گوت: جاكێ پەیمانی بەتۆ داوە؟ مەگەر ئەو دزو جەردەو چەتانەی كە حاجیان رووت دەكەنەوە، كە لەهۆزی ئەسلەمو غیفارو موزەینەو جوهەینەن) بۆ جوهەینە باش لێم روون نییە، بەلاّم وابزانم ئەقرەع ناوی هۆزی جوهەینەیشی هێنا.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی پێم بڵێ: ئەگەر ئەسلەمو غیفارو موزەینە) وا بزانم فەرمووشی: جوهەینە، لەلای خودای گەورە، چاتربن لەهۆزی بەنی تەمیمو بەنی عامیرو ئەسەدو غەطەفان، ئایە ئەمانە مایە پووچو زیانەومەند دەرناچن؟).

---

[١٦٣٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٩٢ = ١٥٠٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٣٤ = ٦٣٩١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٦).

ئـەقرەع گـوتی: بـا، مایـە پـووچ دەردەچـن. خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (دەسا بـەو کەسـە کـە گیـانی منـی بەدەسـە، کـە خـودای گەورەو فریاڕەسە، ئەوانە لەمانـە باشـترن لـەلای خـودای گـەورە، چـونکە زووتـر لەوان ئیسلامبوون!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٣٥٤٧ ج/٤} . هۆزەکـانی غیفـارو ئەسلەم.

**روونکردنەوە:**

١- ئـەقرەعی کـوڕی حـابیس (ڕەزای خـودای لێ بـێ) هـاوەڵی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسـەردەمی نـەزانی پـێش هـاتنی ئـایینی پیرۆزیـی ئیسلام، ئەقرەع ناوبژیوان (حەکەم) بوو، کێشە کۆمەڵایەتییـەکانی بـۆ مـەردوم چارەسەر دەکـرد، لـە موئەللەفـە قولوبـەکان بـوو، ئامـادەی ئـازادکردنی مەککـەو غەزای حونەینو غەزای طاییف بـوو لەگـەڵ لەشـکری پێغەمبـەردا، لەسـەرەتاوە رەخنەی زۆری لە بڕیارەکانی ئیسلام دەگرت، بەڵام لەپاشا موسوڵمانێکی جـوانی لێ دەرچوو. دەڵێن: ئەقرەع بـەر لەئیـسلام بـوونی مەجووسـی بـووە، واتـە: ئـاگر پەرست بووە، ئـەقرەعی کـوڕی حـابیس خـۆیو دە کـوڕی لەجـەنگی یەرمووکـدا شـەهید بـوون، (ڕەزای خودایـان لێ بـێ). {تـاج/٤، زنجـیرە: ٦٥، ژمـارە: ٤٥٢٠} . خەڵاتکردنی نۆ موسوڵمان.

١٦٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ الطُّفَيْلُ وَأَصْحَابُهُ، فَقَـالُوا: يَـا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ دَوْسًا قَدْ كَفَـرَتْ وَأَبَـتْ، فَـادْعُ اللَّـهَ عَلَيْهَـا. فَقِيـلَ: هَلَكَـتْ دَوْسٌ، فَقَـالَ:

«اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَائْتِ بِهِمْ». {الحديث: ٦٣٩٧ = ٦٤٠٩ فم. بخاري. مناقب: ٤٣٩٢، ٦٣٩٧}:[١٦٤٠]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: طوفەیلی کوڕی عەمری ئەل-دەوسیو برادەرەکانی (خودایان لێ رازی بێ) هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەڕاستی هۆزی دەوس خودا ناناسنو مل نادەنو لەکێش دەرچوون! کەواتە نزای خراپیان لێ بکە، کەخودا بیان فەوتێنێ، خەڵکەکەیش گوتیان: تازە هۆزی دەوس فەوتان، چونکە ئێستا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای شەڕیان لێ دەکا، دیارە نزاکەیشی گیرایە!

کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەجیاتی ئەوەی کە نزای خراپیان لێبکا، نزای باشی بۆیانکردو فەرمووی: (ئەی خودایە! رێنمایی هۆزی دەوس بکەو کەمەنکێشیان بکە بۆ قەبووڵی ئیسلام). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٣٥٥١ ج/٤}. پایەی بەنی تەمیمو دەوسو....

## روونکردنەوە:

نزاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گیرابوو، حەبیبی کوڕی عەمری دەوسی، خۆیو باوکی حوکمداری سەر هۆزی دەوس بوون، دەڵێن: حەبیب سێ سەد ساڵ ژیاوە، حەبیب دەیگوت: من دەزانم کە ئەم بوونەوەرو دروستکراوانە، دروستکەرێکیان هەیە، بەڵام نازانم کێیە؟ جا کاتێ بیستی کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتووە، خۆیو پەنجاو حەوت کەس

---

[١٦٤٠] بخاری. مناقب: ٤٣٩٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٣٦ - ٦٣٩٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٠٠).

لەپیاو ماقوولانی هۆزەکەی هاتن بۆ خزمەتی، ئیتر ئەوان موسوڵمان بوونو هۆزی دەوسیش موسوڵمان بوون!

١٦٤١- عَنْ أَبِي زُرْعَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): لاَ أَزَالُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مِنْ ثَلاَثٍ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ». قَالَ: وَجَاءَتْ صَدَقَاتُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا». قَالَ: وَكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عَائِشَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَعْتِقِيهَا فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ». {الحديث: ٦٣٩٨ = ٦٤١٠ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٠٩٠ = ٢٥٤٣، ٤٣٦٦. فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٨٨٩}:[١٦٤١]

ئەبو زورعە فەرمووی: ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوەتی ئەم سێ وەسپو مەدحە جوانەی بەنی تەمیمم، لەدەمی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەگوێی خۆم بیستووە ئیتر لەوساوە هۆزی بەنی تەمیمم خۆش دەوێ. لێیم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئازاترینو خۆگرترینی ئۆمەتم، لەئاستی جەجاڵ، هۆزی بەنی تەمیمن!). کاتێ زەکاتەکانیشیان هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە زەکاتی خزمانی ئێمەیە).

ژنێکی دیلی بەتاڵان گیراوی کۆیلەی بەنی تەمیمی کەنیزەکی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی عائیشە! ئەم کارەکەرەت ئازادبکە، چونکە ئەمە لەنەوەی ئیسماعیلی کوڕی

---

[١٦٤١] تجريد البخاري/٣، ژمارە: ١٠٩٠ = ٣٥٤٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٣٧ = ٦٣٩٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٩ رقم الباب/١٣).

حەزرەتی ئیبراهیمە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٣٥٥٠} . پایەی بەنی تـەمیمو دەوس....

**روونکردنەوە:**

هـۆی فـەرمانکردن بـە ئـازادکردنی ئـەم کەنیزەکـە ئـەوە بـووە، چـونکە عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) ئاھ (نەزر)ی کردبوو، کە یـەکێ لەوەچـەو نـەوەی حەزرەتی پێغەمبەر ئیسماعیل (سڵاوی خودای لەسەر بێ) ئازادبکا، کـە بـاپیرەی عەرەبەکان بووە.

## (٤٨) باب خِيَارُ النَّاسِ
## باسی خەڵکی باش

١٦٤٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ، فَخِيَارُهُمْ فِى الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِى الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا، وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ فِى هَذَا الأَمْرِ أَكْرَهُهُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ فِيهِ، وَتَجِدُونَ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ: الَّذِى يَأْتِى هَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ». {الحديث: ٦٤٠١ = ٦٤١٣ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٣٤٥ = ٣٣٥٣، ٣٣٧٤، ٣٣٨٣، ٣٤٩٠، ٤٦٨٩ فتح البارى} :[١٦٤٢]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەبینن ئـەو خەڵکـە، لەبنەڕەتـدا، ڕێـك وەك كـان وان، چاكو خراپیان هەیە، دەی بزانن ئەو بنەماڵەو کەسانەیان کە لەسـەردەمی نەفامیدا باش بوون، هەر ئەوانەشیان لەسەردەمی ئیسلامەتیدا باشن، بەمەرجێ

---

[١٦٤٢] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٣٤٥ = ٣٣٥٣ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤، ژمـارە: ١٧٤٤ = ٦٤٠١ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/١).

که شارەزای ئـایین بـبنو بـەجوانی ڕەفتـاری پـێ بکـەن، هـەروا دەبیـنـن باشـترین کەسـێ بـۆ ئـەم کاروبـارە، ئـەو کەسـانەن کـە لەپێـشا ئـەم کـارو بارەیـان زۆر پـێ ناخۆشە، بەڵام کە قەبووڵی دەکەن دەبن بە باشترین دۆستو یارمەتیدەر بۆی! هەروا دەبینن بەدترینو گەندەڵ ترینی ئەو خەڵکە، ئەوانـەن کـەدوو ڕوون: کـە لەلای لایێ قسەیێ دەکاو لەلای لایەکەی تر قسەیەکی تـر دەکـاو، بـەپێی سوودو قـازانجی خـۆی زمـان دەگـۆڕێ!). {ریـاض/٤، زنجـیرە: ٢٥٩، ژمـارە: ١٥٤٠ + تـاج/٤، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٩٢٧ ج/٤} + {تاج/٣، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٣٥٣٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە لە ریاضدا ئاوا کراوە بەکوردی، وەرگەڕانی ئەوێ دەکەین بەڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سەرنج دەدەن: ئـەم خەڵکە وەك کانو کانزا وان، هەرکەسەیان لەبنەڕەتدا، ڕەگـەزی دەچێتەوە سـەر بنەماڵەیەکی خانەدان، یان بە بنەچـەو ڕەسـەنی دەچێتەوە سـەر بـەرە بـابێکی ناڕەسـەن، وە بەشـێوەی گـشتی، کـردارو ڕەفتاریـان، لـەحاڵی ژیانیانـا، بـەپێی ڕەسـەنیو نارەسـەنی بـنجو بنەوانیانـە، جـا بۆیـە ئەوانـەی کـە لەسـەردەمی نەفامیدا ڕەسەنو بنەچە باش بوون، ئێستایش لەسەردەمی ئیسلامەتیدا دیـسان خۆشیان ڕەسەنو ڕەفتـار بـاش دەردەچـن، وەك دەڵێن: گیـا لەسـەر بنجی خـۆی دەڕوێتەوە، بەمەرجی ئەوە کە شارەزای ئایینی پیرۆزی ئیسلام بنو ببن بـەزاناو مامۆستا لە شـەریعەتدا، وە هـەروەها سـەرنـج دەدەن کـە باشـترین کـەس بـۆ ئـەم کارە، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، یا سەرکردەییو فەرمانڕەواییە، ئەو کەسـانەن کـە لەپێـشدا حـەزیان لێـی نـەبووەو بگـرە زۆریـش ڕقیـان لێـی بـووە، تـا کاتـێ دەکەونە ناوی، یا پۆستی کارمەندییو فەرمانڕەوایی وەردەگـرن دەبنـە باشـترین

دۆستو لایەنگیری (وەك ئیمامی عومەر، لەپێشدا دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو، کە ئیسلام بوو، گەورەترین دۆستی بوو) هەروەها سەرنج دەدەن کە بەدترین کەس بۆ ئەم کارە ئادەمیزادی دوو رووە، کە لەلای ئێوە قسەیەك دەکاو، لەلای ئەوان قسەیەکی تر دەکاو بەپێی بەرژەوەندی خۆیان گفتوگۆ دەگەن!). {بڕوانە: ژمارە: ١٧٧٢ لەپوختەی موسلیم}.

### (٤٩) باب من فضائل نِسَاءِ قُرَيْش
### باسی گەورەیی‌و سەروەریی ژنانی هۆزی قورەیش

١٦٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «نِسَاءُ قُرَيْشٍ خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ، أَحْنَاهُ عَلَى طِفْلٍ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ». قَالَ: يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى إِثْرِ ذَلِكَ: وَلَمْ تَرْكَبْ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ بَعِيرًا قَطُّ). {الحديث: ٦٤٠٥ = ٦٤١٧ فـم. تجريد البخاري/ ٤، رقم: ١٣٦٦ = ٣٤٣٤ فكتح الباري. تحفة الأشراف: ٣٣٣٩}:[١٦٤٣]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئافرەتی باشی قورەیش باشترینی ئافرەتانێکن کە سواری وشتر بوون، واتە: باشترینی ئافرەتانی عەرەبن، کە ناسراون بە سواریی وشترەوە، چونکە زۆر دڵسۆزو میهرەبانن بۆ منداڵی ساواو، زۆر بەجوانی پەروەردەی دەکەن، هەروەك زۆر باشیش دڵیان بەماڵی مێرد دەسووتێ! واتە: ماڵگەرو ماڵپەروەرن).

---

[١٦٤٣] تجريد البخاري/٤، ژمارە: ١٣٦٦ = ٣٤٣٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٢٢ - ٦٤٠٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٤٦).

ئەبو هورەیرە دوا بەدوای گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە، بۆئەوەی مەریەمی کچی عیمران بەر بڕیاری ئەم فەرموودەیە نەکەوێ، چونکە ئەو باشترە، دەیفەرموو: (قەت قەت مەریەمی کچی عیمران سواری وشتر نەبووە، تا لەفەرموودەکە ئەوە وەربگیرێ کە ژنانی قورەیش لەویش باشتربن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٢} . باسی ژنی پەسەند.

## (٥٠) باب مُؤَخاةِ النَّبِيِّ (ﷺ) بَيْنَ أَصْحابِهِ رضى الله تعالى عنهم
## باسی بەستنی پەیمانی برایەتی لە نێوان یارانی پێغەمبەردا (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هەموو هاوەڵانی بێ)

١٦٤٤- عَنْ عَاصِمٌ الأَحْوَلُ قَالَ: قِيلَ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: بَلَغَكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ». فَقَالَ أَنَسٌ: قَدْ حَالَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ قُرَيْشٍ وَالأَنْصَارِ فِي دَارِهِ. {الحديث: ٦٤١٠ = ٦٤٢٢ فم. تجريد البخارى/٣، رقم: ١٠١٠ = ٢٢٩٤، ٦٠٨٤، ٧٣٤٠}:[١٦٤٤]

عاصیمی ئەحوەل فەرمووی: عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیك کرا: ئایا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر گەیشتووە بەتۆ کە دەفەرموێ: (پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نییە) ؟ فەرمووی: لەماڵی منا لەمەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی دۆستایەتیو دەستە برایەتی بەست لەنێوانی کۆچکارانا، کە بەشێوەی گشتی لەهۆزی قورەیش بوونو، لەنێوانی یاریدەدەران (ئەنصار)دا، کە لەخەڵکی مەدینە بوون). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٣٥٠٥ ج/٤} + {بڕوانە: ژمارە: ١٧٤٠ لەپوختەی موسلیم} . پەیمانی برایەتی لەنێوانی.......

---

[١٦٤٤] تجريد البخارى/٣، ژمارە: ١٠١٠ = ٢٢٩٤ بخارى. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٣٩ = ٦٤١٠ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٣٩ رقم الباب/٢).

**روونکردنەوە:**

**وەك لە پەراوەکانی راڤەکاندا باسکراوە، دوو جۆرە پەیمان بەستن هەیە:**

**یەکەم: پەیمانبەستن لەسەر شێوەی سەردەمی نەفامیو نەزانی، کە پەیمانەکە دەبوو بەهۆی کەلەپوور گرتن لەیەکتریو یاریدەدەری یەکتری لەسەر حەقو ناحەق، پەیمان بەم واتەیە لە ئیسلاما نەماوەو نییە.**

**دووەم: پەیمانبەستن لەسەرئەوە کە دوو لایەن هاوکاریو پشتگیری یەکتری بکەن، لەسنووری پەیرەوی حەقا، بۆ پاراستنی مافی رەوای هەردوولا، ئەم جۆرەیان هەتا رۆژی دوایی دەمێنێ.**

## (٥٢) باب فضل الصحابة، ثم الذين يلونهم
## باسی گەورەییو سەروەریی هاوەڵانی پێغەمبەرو چەند چینێکی دوا ئەوان

١٦٤٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَأْتِي زَمَانٌ يَغْزُو فِئَامٌ مِنْ النَّاسِ فَيُقَالُ فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ فَيُفْتَحُ عَلَيْهِ ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ فَيُفْتَحُ ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ صَاحِبَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ فَيُفْتَحُ) (الحديث ٢٨٩٧، أطرافُهُ في: ٣٥٩٤، ٣٦٤٩): [١٦٤٥]

**ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەردەمێ دادێ کۆمەڵێ خەڵك دەڕۆن بۆغەزا،**

**[١٦٤٥] تجريد/٣، ژمارە: ١١٩٣ = ٢٨٩٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٤٢ = ٦٤١٥ شیحا - تخريج وترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٧٦).**

دەڵێن: کەستان تیاهەیە کە هاوڕێتیی پێغەمبەری کردبێ، هەتا بەبەرەکەتی ئەوەوە خودا سەرتان بخات؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا لەو غەزایەدا زاڵیان دەکاو سەردەکەونو ئەو شوێنە ئازاد دەکەن.

لەپاشا سەردەمێ تر دادێ عەشاماتێ تر دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: ئایا کەستان هەیە کە هاوڕێیەتی هاوڕێیانی پێغەمبەری کردبێ؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخا.

لەپاشا سەردەمێ تریش دادێ، عەشاماتێ دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: ئایا کەستان واتیا کە هاوڕێیەتی هاوڕێیانی یارانی پێغەمبەری کردبێ؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخاو، ئەو وڵاتەیش ئازاد دەکەن) (تاج/٥/٥ف-٤ز-١-ش. باسی گەورەیی هاوڕێیانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ).

لە ژمارە: (١٧٤٢)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە، بەهرەی پتری واتیادا، دەیکەین بە ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «يَأْتِى عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يُبْعَثُ مِنْهُمُ الْبَعْثُ فَيَقُولُونَ: انْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ فِيكُمْ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ، ثُمَّ يُبْعَثُ الْبَعْثُ الثَّانِى، فَيَقُولُونَ: هَلْ فِيهِمْ مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ، ثُمَّ يُبْعَثُ الْبَعْثُ الثَّالِثُ، فَيُقَالَ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ ثُمَّ يَكُونُ الْبَعْثُ الرَّابِعُ فَيُقَالَ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ أَحَدًا رَأَى مَنْ رَأَى أَحَدًا رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ». {الحديث: ٦٤١٥ = ٦٤٢٧ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١٩٣ = ٢٨٩٧، ٣٥٩٤، ٣٦٤٩}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (سـەردەمێ دادێ، کۆمـەڵێ خـەڵك، بـە فەرمانی فەرمانڕەوای موسوڵمانان دەڕۆن بۆ غەزا، دەچن بۆ جەنگ، بۆ پەخشی نـووری ئیـسلام، دەڵـێن: تەماشـابکەن، ئایـا کەسـتان تیـادا هەیـە، کـە لـەهاوەڵانی پێغەمبەر بێ؟ دەڵێن: بەڵێ، تاقە یەك پیاو هەیە. ئیتر خـودا لـەو غەزایـەدا بـە پیرۆزیو بەرەکەتی ئەو تاقە هاوەڵەی پێغەمبەرەوە زاڵیـان دەکاو سـەردەکەونو ئەو شوێنە رزگار دەکەن.

لەپاشا سـەردەمێ تـر دادێ، عەشـاماتێ تـر دەچـن بـۆ غـەزا، دەڵـێن: ئایـا کەسێ هەیە لەناویانا، کە هاوەڵانی پێغەمبەری دیبێ؟ دەڵێن: بـەڵێ، یـەك کـەس هەیە، جا بەهۆی پیرۆزیو بەرەکەتی ئەو تاقە تابیعییـەوە، خـودا ئـەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخاو، ئەو وڵاتەیش ئازاد دەکەن!

لەپاشا سەردەمی سێیەم دادێ، کەسانێ تر لە موسوڵمانان دەڕۆن بۆ غـەزا، دەڵێن: سەرنـج بدەن، بڕوانن کەسیان واتیادا، کـە کەسـێکی دیبـێ، ئـەو کەسـێکی وای دیبێ، کە ئەو کەسە هـاوەڵی پێغەمبـەری دیبـێ؟ (واتـە: ئـەو کەسـە تـابیعی تـابیعی دیبـێ!) دەڵـێن: بـەڵێ هەیـە، جـا بـە بەرەکـەتی ئـەو تـابیعی تـابیعی تابیعییەوە، خودا لەو غەزایەدا سـەریان دەخـا. لەپاشا سـەردەمی چـوارەم دادێ، دەڵێن: ئادەی تەماشا بکەن ئایا کەسێکیان تیـا دەبیـنن، کـە ئـەو کەسێکی دیبـێ، کە ئەو کەسێکی دیبێ، کە ئەو هاوەڵانی پێغەمبەری دیبـێ؟ دەڵـێن: بـەڵێ، یـەك پیاو لەم جۆرە کەسە هەیە، ئیتر خودا بە بەرەکەتی ئەو پیاوەوە ئەو شـوێنەیان بۆ ئازاد دەکا). {تـاج/٣، زنجیرە: ١، ژمـارە: ٣٢٢٤ ج/٤}. باسـی گـەورەییو پاکـژی یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە تێکڕایی.

١٦٤٦- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ) (الحديث ٢٦٥٢، أطرافُهُ في: ٣٦٥١، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٥٩، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨):[١٦٤٦]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باشترینی مەردوم چینی هاوچەرخی منە، کە چینی هاوەڵانە، کەناودارن بە چینی سەحابەی پێغەمبەر - درودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوان بێ-، ئەجا چینی دوای ئەوان کە چینی دووەمی موسوڵمانن، کە ناودارن بەتابیعین، ئینجا چینی سێیەمی موسوڵمانن کەوان لەدوای چینی دووەمەوە، کە پێیان دەگوترێ: تابیعی تابعین – ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ – لەپاشان هۆزێ پەیدا دەبن، کۆناکەنەوە لەشایەتیو سوێند خواردن، وتێکەڵو پێکەڵیان دەکەن بەسەر یەکدا).

(تاج/٣/٣١١-٣ز-١١٧- باسی هەڕەشەکردن لەشایەتی درۆ +تاج/٥/٤٤ف-١-ش/د/ت).

١٦٤٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ». (قَالَ عِمْرَانُ: فَلاَ أَدْرِي أَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بَعْدَ قَرْنِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً). «ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلاَ يُتَّمَنُونَ، وَيَنْذُرُونَ وَلاَ يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ». {الحديث: ٦٤٢٢ = ٦٤٣٤ فم.

---

[١٦٤٦] تجريد/٣، ژمارە: ١١١٨ = ٢٦٥٢ بخاری. مسلم: ٦٤١٩ شيحا - تخريج وترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم. (بخاری رقم الكتاب/٥٢ رقم الباب/٩).

تجريد البخاري/٣، رقم: ١١١٨ = ٢٦٥٢، ٣٦٥١، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٩٥، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨. نسائي. أيْمان ونُذُور: ٣٨١٨. تحفة: ١٠٨٢٧}:[١٦٤٧]

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشترینی چینی ئێوە چینی هاوچەرخی خۆمە، کەچینی هاوەڵانە، کە ناسراون بەچینی سەحابەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). ئەوجا چینی دوای ئەوان کە چینی دووەمی موسوڵمانانن، کە ناودارن بە تابیعین، کە بەکوردی پەیڕەوان‌و شوێنکەوتوانیشیان پێ دەگوترێ. ئەوجا چینی دوای ئەوان، کەپێیان دەگوترێ: چینی ئەتباعی ئەتباع کە چینی سێیەمی موسوڵمانانن. ئەوجا چینی دوای ئەوان، کەچینی چوارەمی موسوڵمانن (عیمران فەرمووی: باش نازانم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش چینی خۆی دوو چینی تری فەرموو، یاسێ چین).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیتر لەپاش ئەم چینانە، کەسانێ واپەیدا دەبن، کۆناکەنەوە لە شایەتی‌و سوێند خواردن، هێشتا کەسێ داوای شایەتی لێیان نەکردووە، ئەوان لەخۆیانەوە، پێش ئەوە لە حاڵەکە حاڵی ببن شایەتیی دەدەن! گزی‌و ناپاکی لە سپاردەو شتی وا دەکەن‌و بەڕاستی ناپاک‌و گزیکار خۆیانن‌و، ئاهو نەزر دەکەن‌و جێبەجێی ناکەن، بەرە بەرە قەڵەویی لەناویانا پەرە دەستێنێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٢٤٨٠ + تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢١ چاپی چوارەم}. باسی گەورەیی‌و پاکژی یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتێکرایی.

---

[١٦٤٧] تجرید/٣، ژمارە: ١١١٨ = ٢٦٥٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٧٤٣ = ٦٤٢٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٢ رقم الباب/٩).

## (٥٣) باب قوله ﴿ﷺ﴾ لا تأتي مائة سنة وعلى الأرض نفسٌ مَنفوسةٌ اليوم
## نلگاته سەد ساڵی تر، کە کەسێ نامێنێ لەوانەی کە ئێستا لەسەر ڕوی ئەم زەویە دەژین

١٦٤٨- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: (صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِشَاءَ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَـتَكُمْ هَـذِهِ فَـإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَـدٌ). (الحـديث ١١٦ ـ طرفـاه في: ٥٦٤، ٦٠١): [١٦٤٨]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەکۆتایی تەمـەنی دا بـەمانگێ لـەپێش مەرگیـدا، شەوێ نوێژی خەوتنانی بۆ کردین، کەسلاوی دایـەوە هەڵساو فـەرمووی: (ئـەرێ دەنگو باسی ئەم شـەو چییە؟ دەسا ئـەوەی کـەمن لـەم بارەیـەوە دەیـزانم ئـەم هەواڵەیە: هەتا سەری سەد ساڵ لەم شەوەوە کەس نامێنێ لەوانەی کەئێستا وان لەسەر زەوی).

## (٥٤) باب تحريم سبّ الصَّحابَة ﴿ﷺ﴾
## نادروستە جمێن بە هاوڕێیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بدرێ (ڕەزای خودایان لێ بێ)

١٦٤٩- عَنْ ابي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): لا تَسُبُّوا اصْحَابِي فَلَوْ انَّ احَدَكُمْ انْفَقَ مِثْلَ احُدٍ ذهَبا، مَا بَلَغَ مُـدَّ احَـدِهِمْ وَلا نَصِيفَهُ. (الحديث: ٣٦٧٣): [١٦٤٩]

---

[١٦٤٨] تجريد/١ زمارە: ٩٥=١١٦ بخاری. مسلم: ٦٤٣٢ شيحا (بخاری/ رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٢٢).

[١٦٤٩] تجريد البخاری/٤، ژمـارە: ١٤٥٥ = ٣٦٧٣ بخـاری. پوختـەی موسـليم/٤، ژمـارە: ١٧٤٦ = ٦٤٣٥ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٢ رقم الباب/٥).

ئەبو سەعیدی خوردی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شتێ هەبوو لە نێوانی خالیدی کوڕی وەلیدو ئەوڕەحمانی کوڕی عەوفدا، خالید جنێوی بە ئەوڕەحمان دا، پێغەمبەریش(درووودی خودای لێ بێ) فەرمووی: جمێن بە هیچ کەسێ لە هاوڕێ یانی من مەدەن، گریمان یەکێ لە ئێوە بە قەد کێوی ئوحودیش زێرببەخشێتەوە هێشا ناگات بە مشتێکی ئەوان، بگرە ناگات بەنیو مشتیشیان! (ش/ د/ ت - تاج/٥ ل/١٠ ز/٢- جنێودان بە یارانی پێغەمبەرتاوانێکی گەورەیە).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە جنێو دان بە سەحابەی پێغەمبەر تاوانێکی گەورەیە، ئەو کەسەی کە جنێوەکە دەدا چ خۆشی هاوڕێی پێغەمبەربێ، چ لە چینەکانی دوا ئەوان بێ جیاوازی نییە. سڵاو لە پەیڕەوانی ڕاستی. تکای تایبەتی بەندەی نۆکەری هەموو قەڵەمبەدەستێکی دڵسۆزی سوننەو جەماعەت: کەواز لەخۆ خەریککردن بە بیدعەو میدعەوە بهێنن، خامە نوور بەخشەکانیانو وتارە جوانەکانیان، تەرخان بکەن بۆ بەرگری لە قورئانو صەحابەکانی پێغەمبەرو لە ئەهلی سوننەتو جەماعەت. بەچاوی خۆتان دەبینن کە ئاخونەرافزییەکان، لەسەر کەناڵەکان نەفرەتو لەعنەت لە صەحابەکانو خولەفای راشدینو هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەر دەکەن، وە دەڵێن: (لەعنەت کردن لە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عائیشەو حەفصەو لایەنگیرانیان خێرترە لە (لا إلـه إلا الله) و (سبحان الله)و ذیکر کردن! (ألاَ هَلْ بلّغْتُ؟ اللّهُمَّ فَاشْهَدْ) - وەرگێڕ

## (٥٩) باب فضل فارس

## باسی گەورەیی و سەروەریی وڵاتی فارس

١٦٥٠- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ ﴿وَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾ قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ حَتَّى سَالَ ثلاثا وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ وَضعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ ثمَّ قَالَ: (لَوْ كَانَ الايمَانُ عِنْدَ الثرَيَا لَنَالَهُ رِجَالٌ اوْ رَجُلٌ مِنْ هَؤُلاءِ). ( الحديث ٤٨٩٧- طرفه في: ٤٨٩٨): [١٦٥٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ)فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دانیشتبووین، لەو کاتەدا سوورەتی جومعە هاتە خوارێ بۆی، کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە :﴿ وَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾٢/٦٢ واتە : هەروا ئەم ڕەهبەرە نازدارە بە هۆی نامەی پیرۆزی خودایی و، بە هۆی فەرموودە بەرزەکانی خۆیەوە، گەلێ کەسانیش لە موسڵمانان، فێری یاسانامەی خوداو خێر وبێری هەردوو جیهان دەکا، کە ئەمانە هێشتا وان لە ژێر پەردەی غەیبەوەو، جارێ پەیڕەوی ئەمانەیان نەکردووە، بەڵام بەزوویی ئەوانیش وەك ئەمان ئەو ڕێگە حەقە دەگرن).

سوپاس بۆ خودا کە گەلی کورد بەر موژدەی ناو ئەم ئایەتە کەوتوون، و خوا یاربێ تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبن لەسەر ئەم ڕێبازە پیرۆزە، ئەوەی زۆرو ستەمیان لێ بکاو هەوڵ بدا لەم ئایینە پاك و پیرۆزە دووریان بخاتەوە، سەری خۆی لە تاوێرەکانی چیای قەندیل و پیرەمەگرون و سەگرمەو زاگرۆس دەدا.

---

[١٦٥٠] تجرید/٤ ژمارە: ١٧٠٦ = ٤٨٩٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٤ ژمارە: ١٧٥١ = ٦٤٤٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٢، رقم الباب/١).

کاتێ خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە، پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا !! ئەوانە کێن؟ کە ئەم ڕێگەی هەقەی ئێمە بە زوویی دەگرن؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) وەلامی نەدایەوە، تا پیاوەکە سێ جار هەمان پرسیاری لێ دووبارە کردەوە: گوتی لەو کاتەدا سەلمانی فارسی لەناو کۆڕەکەماندا بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەستی خستە سەر ڕانی سەلمان و فەرمووی (ئەگەر گریمان ئیمان وئیسلامەتی لەسەر ئەستێرەی کۆش بێ، پیاوانێ لەمانە خۆیانی دەگەیەننێ !) (تاج/٥ ز/٧٢ ژ/٢-گەورەی ولاتی عەجەم = ولاتی فارس ).

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەواتای وشەی (فارس )بفەرموو بڕوانە : (تاجول ئوصولێ، بەرگی پێنجەم، ل : ٢٥٤- باسی فەزڵی فارس ).

لە ژمارە: (١٧٥١)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە، بەهرەی پتری واتیادا، نووسینی بێ سوود نابێ:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ، فَلَمَّا قَرَأَ: (وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ)، قَالَ رَجُلٌ: مَنْ هَؤُلاَءِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، حَتَّى سَأَلَهُ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، قَالَ: وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ، قَالَ: فَوَضَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ، ثُمَّ قَالَ: «لَوْ كَانَ الإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلاَءِ». {الحديث: ٦٤٤٥ = ٦٤٥٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٧٠٦ = ٤٨٩٧، ٤٨٩٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣١٠. تحفة الأشراف: ١٢٩١٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین، لەوکاتەدا سوورەتی جومعە هاتە خوارەوە بۆی، کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ — ٢/٦٢}.

واتە: هەروا ئەم ڕەهبەرە نازدارە، بەهۆی نامەی پیرۆزیی خوداییو بەهۆی فەرمووده بەرزەکانی خۆیەوە، گەلێ گەلو کەسانی تریش لە موسوڵمانان، فێری یاسانامەی خوداو خێرو بێری هەردوو جیهان دەکا، کە هێشتا ئەمانە وان لەژێر پەردەی غەیبەوەو، جارێ پەیڕەوی ئەمانەیان نەکردووە، بەڵام بەزوویی ئەوانیش وەك ئەمانە، ئەم ڕێگە هەقو ڕاستو دروستە دەگرنو وەك ئەمان موسوڵمان دەبن).

کاتێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە، پیاوێ عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کێن، کە ئەم ڕێگەی هەقی ئێمەیە بەزوویی دەگرن؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوە، تا پیاوەکە دوو جار، یا سێ‌جار، هەمان پرسیاری لێ دووبارە کردەوە. فەرمووی: لەوکاتەدا سەلمانی فارسی لەناو کۆڕی دانیشتنەکەماندا بوو،، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی خستە سەر ڕانی سەلمانو فەرمووی: (ئەگەر گریمان ئیمانو ئیسلامەتی لەسەر ئەستێرەی کۆیش بێ، پیاوانێ لەمانە، خۆیانی دەگەیەننێ!!). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٣٥٧٣، ٣٥٧٢، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥}. گەورەیی وڵاتی عەجەم (فضل فارس).

**ڕوونکردنەوە:**

**دانــەری تــاجول ئوصـول لــە شــەرحەکەیدا، لـە ڕافـەی وشـەی (فـەضـلی فارس)دا، دەفەرموێ:**

**(مەبەست ئەو گەلانەیە کە عەرەب نین‌و خەڵکی ئەو وڵاتانەن کە لەکۆندا لەناو عەرەبەکاندا بە وڵاتـی فـارس ناوبـانگی دەرکـردووە، کـە بەمانـە دەگـوترێ عەجـەم، کـە بـریتین لـە دانیـشتوانی ئـەو ناوچـانە کـە خۆرهـەڵاتن‌و دەکەونـە خۆرهـــەڵاتی کەنـــداوەوە، وەك ئێـــران‌و کرمـــان‌و سیـــستان‌و ئـــەودیو چـــەم (ماوەرائەننەهرەین)و خۆراسان، کە ئەم ناوچانە، ئەو شوێن‌و ناوچـە پیرۆزانـەن کە پیاوانی فەرموودەزانی وایان تیـا هەڵکەوتووە، کـە بـوون بـە بـەردی بناغـەی عولومی حەدیث (زانستەکانی فەرموودە) وەکوو ئەم پێـشەوا نـاودارو بەڕێزانـە: بوخاری‌و ئەبو داوودو تەرمـەزی‌و نەسائی‌و بەیهـەقی‌و دارە قـوطنـی‌و موسـلیم (ڕەزای خودایان لێ بێ).**

**ئیمـامی موسـلیم (خـودای لێ ڕازی بـێ) ئەگەرچـی لەبنەڕەتـدا عەرەبـە، چونکە لە عەرەبی هـۆزی قوشـەیرە، بـەڵام ئـەویش پـەروەردەی ئـەو خاکەیـەو، لەناو ئـەو ئەسـتێرە گەشـانەدا ڕەسـکاوەو ژیـاوە). {بڕوانـە: تـاج/٣، زنجـیرە: ٧٢، ژمارە: ٣٥٧٥ چاپی چوارەم}.**

## (٦٠) باب قوله ﴿ﷺ﴾: النَّاس كَإِبلٍ مائةٍ لا تَجِدُ فيها راحِلَةً
## ئەو خەڵکە زۆرینەیان ناباشن

١٦٥١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ لَا يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً. (الحديث ٦٤٩٨)؛ [(١٦٥١)]

ئیبنـو عومـەر -ڕەزای خوادایـان لێ بـێ- فـەرمووی: ژنـەوتم لـە خۆشەویـست - دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (ئەو خەڵکە بێ متمانەن، متمانەیان پـێ ناکرێ، مەگەر چۆنەها، هەروەك چۆن لەسەد وشتردا، وشـترێکی ڕەسـەنت دەست ناکەوێ کەدەست بدا بۆ سواری ئاوا!).

لە ژمارە: (١٧٥٢)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ لاَ يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً». {الحديث: ٦٤٤٦ = ٦٤٥٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠٢١ = ٦٤٩٨ فتح الباري} :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، کە ناسراوە بە ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئێـوە دەبیـنن کـە ئـەو خەڵکـە، بـۆ باشـیو خراپـی، وەك وشـتری بـاری وان، پیـاو لەسـەدیانا، تاقـە وڵاخێکـی سـواری باشـی دەسـگیر نابـێ). {تـاج/٥، زنجیـرە: ٤٥، ژمارە: ٤٩٠٦ — ش/ت — چاپی چوارەم} . خۆپاراستن لەفاری خودا.

---

[(١٦٥١)] تجریـد/٥، ژمـارە: ٢٠٢١ = ٦٤٩٨ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤ ژمـارە: ١٧٥٢ = ٢٠٢١ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٨ رقم الباب/٣٥).

**ڕوونکردنەوە:**

**وڵاخی بەرزە کەباری بێ، بەکەڵکی سواری نایێ، چونکە لەژێر بارا، ڕەوتی لێ تێک دەچێو کەشخەییەکەی نامێنێ، بۆیە کە بە ئەسپی ژێر عەرەبانە دەگوترێ: بارگیر.**

**لەتەجریدی بوخاریدا ئەم فەرموودەیە ئاوا کراوە بەکوردی:**

**پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو خەڵکە بێ متمانەن، متمانەیان پێ ناکرێ، مەگەر چۆنەها، هەروەك چۆن لەسەد وشتردا، وشترێکی ڕەسەنت دەست ناکەوێ کە دەست بدا بۆ سواری ئاوا لەسەد مرۆڤیشدا مرۆڤێکی نەجیبت دەست ناکەوێ).**